# پێرست

# پێشەکی

## بسم الله وبه نستعين

الحمدلله رب العالمين والعاقبة للمتقين ولا عدوان إِلا على الظالمين، وأَشهدوا أَن لا إِله إِلا الله وحده لا شريك له، وأَشهدوا أَنَّ محمدًا عبده ورسوله وخاتم النبيين ولا نَبِّيَّ بعده، أَما بعد:

حەمد و ستایش بۆ الله ـی خاوەن عەرشی عظیم کە هیدایەتی داین بۆ دینی ئیسلام و ناسینی زاتی الله ﷻ بەو صیفاتە بەرزانەی کە هەیەتی بەو شێوازەی لەگەڵ زاتی پیرۆزیدا شیاو و گونجاون، لە کاتێکدا جەهمییەکان و کلکەکانیان وەک موعتەزیلە و ئەشاعیرە کافرن پێیان. گومانی تێدا نییە تەوحیدی هیچ ئینسانێک دانامەزرێ هەتاوەکو الله ﷻ نەناسێ بەو صیفاتانەی کە هەیەتی بەو شێوازەی لە قورئان و حدیثدا هاتوون بە بێ پەکخستن و گۆڕینی ماناکەیان، لە کاتێکدا ئەهلی تەعطیل بە بتی تەئویل صیفات ڕەتدەکەنەوە.

لای هەمووان ڕوون و ئاشکرایە ئەم زەمەنەی ئێمە تیایدا دەژین قەڕنێکی پڕ فیتنەیە و دوورین لە سەلەفەوە، بیدعە و جەهل باڵی کێشاوە

بەسەر جیهاندا لەو نێوانەشدا ئەوەی پێی دەوترێ میللەتی ئیسلام بەدەر نییە و نەبووە لە فیتنە لە دینەکەیدا، ئەگەرچی میللەتانی کوفر بەڕوونی بانگەشەی کوفر و عەقیدەیان دەکەن، ئەوە لە میللەتانی ئیسلامدا لە ژێر ناوی ئیسلام دەدرێ لە دینی ئیسلام بە زمانی جەهمییەکان و موعتەزیلە و ئەشاعیرە بە چەکی تەئویلیان باتڵ بە حەق دەناسێنن و نیشانی خەڵکی دەدەن، وە ئیمان بە لایانەوە کوفر و تەجسیمە، شیرک و کوفری صیفات و پەکخستنیان تەوحیدە و دەعوەی بۆ دەکەن و دەینێرنە مێشک و دڵی خەڵکیەوە و گومڕایان دەکەن.

سەرنجێک بدەن لە هەردوو کتێبی «نقض عثمان بن سعيد الدارمي على بشر المريسي للدارمي، الرد على الزنادقة والجهمية لأَحمد بن حنبل» بەتایبەت یەکەمیان بەڕوونی بۆتان دەردەکەوێ ئەو تەئویلەی ئەشاعیرە لەسەرینی هەمان تەئویلەکەی جەهمییەکانە، ئەوان هاتن بناغەکەیان دانا، ئەمانیش هەستان بە بنیادنان و تەواوکردنی خانووی بتی تەئویل بۆ ڕەتکردنەوە صیفاتەکانی ڕەب العالمين .

تەئویل ئەو هۆکارەیە کە پەکخەرانی صیفات شەڕی ئەهلی سوننەی پێدەکەن و کوفری صیفاتی پێئەنجام دەدەن، هەروەک چۆن عبدالغنی

المقدسی دەڵێ: بزانە ڕەحمەتی الله ـت لێبێ ئیسلام و ئەهلەکەی لە لایەن سێ طائفەوە لێیان دەدرێ:

١- طائفەی یەکەم ڕاستەوخۆ ئەحادیثی صیفات ڕەتدەکەنەوە، وە ڕاوییەکانیان بە درۆ دەخەنەوە، ئەمانە لە کافران زەرەریان زیاتر و قورسترە بۆ سەر ئیسلام و ئەهلەکەی.

٢- طائفەی دووەم دان دەنێن بە صحیحی حدیثەکان و قبوڵیانە، دواتر تەئویلی دەکەن، ئەمانە زەرەریان لە طائفەی یەکەم زیاترە.

٣- طائفەی سێهەم هیچکام لە قەولی دوو طائفەی پێشوو ناڵێن، بە بۆچوونی خۆیان تەنزیهی الله دەکەن لە صیفاتی نەقص لە کاتێکدا درۆ دەکەن، ئەمە پاڵی پێوەنان بۆ ئەوەی قەولی طائفەکانی پێش خۆیان بڵێن و ئیعتقادی پێبکەن، ئەمانە زەرەریان لە طائفەی یەکەم و دووەم زیاترە.

واعلم رحمک الله أَنَّ الإِسلام وأَهله أُتوا مِن طوائف ثلاث:

١- فطائفة ردَّت أَحاديث الصفات، وكذبوا رواتها، فهؤلاء أَشدُّ ضَررًا على الإِسلام وأَهله مِن الكفار.

٢- وأُخرى قالوا بصحتها وقبولها، ثم تأَولوها، فهؤلاء أَعظم ضررًا مِن الطائفة الأُولى.

٣- والثالثة جانبوا القولين الأَولين، وأَخذوا بزعمهم ينزهون وهم يكذبون، فأَداهم ذالک إِلى قول الأولين، وکانوا أَعظم ضررًا مِن الطائفتين الأَولَّتَين.

كتاب الإِقتصاد في الإِعتقاد لعبدالغني المقدسي ا صـ: ١٢٧

ووتم: مەبەستی لە خاڵی یەکەم جەهمییەکانن، خاڵی دووەم مەبەست لێی ئەشاعیرەن، خاڵی سێهەمیش مەبەست لێی ئەهلی تەفویزە "مفوضة، أهل التفويض" کە دەڵێن نازانین مەبەست لە صیفاتەکان چییە، والله أعلم.

بە کورتی بۆ ئەوەی ڕزگارتبێ لە تەعطیلی صیفات و بیدعەی گومڕاکاران کە سەلەف بەریئـ بوون لێی، ئەوە بە حەقیقی لە قەول و عەمەلدا شوێن سەلەف بکەون، چییان ووت تۆش بیڵێ، لە کوێشدا وەستان تۆش بوەستە بەتایبەت لە بابەتی صیفاتدا، ئەم ئامۆژگارییەی ئیمامی ئەهلی شام أبو عمرو الأوزاعی بکە قاعیدەی ژیانت وەصیەت و مەنهەجێکی دروستە بۆ هەمووومان لە بابەتی صیفاتدا دەستی پێوە بگرن

و بە ددانەکانتان قەپی پێدا بکەن هەتا لە سەرەطانی ئەهلی تەعطیل ڕزگارتان ببێ.

دەڵێ: خۆت مولزەم و پابەندی سوننەت بکە، لەوێدا بوەستە کە سەلەفی پێش خۆت وەستاون، هەرچییان وتووە تۆش بیڵێ، لە چیشدا بێدەنگ بوون تۆش بێدەنگبە، شوێن ڕێگای سەلەفی صاڵحت بکەوە، ئەوەی بۆ ئەوان بەسبوو بۆ تۆش بەسە.

قال الأوزاعيُّ: اصبرْ نَفسَكَ على السُّنَّة، وقِفْ حَيثُ وقَفَ القَومُ، وقُلْ بما قالوا، وكُفَّ عَمَّا كَفُّوا عنه، واسلُكْ سَبيلَ سَلَفِك الصَّالِحِ، فإنَّه يَسَعُكَ ما وَسِعَهم.

شرح أُصول اعتقاد أَهل السنة للالكائي ا ٣١٥

تەماشم کرد لە ئێستادا خەڵکی هەتا ئاستێکی زۆر لە جەهلدا دەژین، سوننەت وەک بیدعە نیشان دەدرێ و عەقیدەی تەوحیدی صیفات وەک شیریک دەناسێنرێ، وە خەڵکی لێدوور دەخرێتەوە، ئەشاعیرەش لعنهم الله لە سەردەمانی پێشوو زیاتر دەستیان داوەتە دەعوەی عەقیدە کوفرییەکەیان، هەتا ئەو ئاستەی وەک مولحیدەکان گاڵتە بە صیفاتەکانی الله ﷻ دەکەن و کوفریان پێدەکەن! بە واجب و ئەرکی سەرشانمم زانی

کتێبێک لەسەریان بنوسم عەقیدە باتڵەکەیان هەڵوەشێنمەوە بە پێی بەڵگەی ئایاتی قورئان، ئەحادیثی ڕەسول الله ﷺ، ئەقوالی صەحابە رضوان الله علیهم، ئاثاری سەلەف رحمهم الله. نەک هێندە بەڵکو چووم ئەقوالی خودی ئەشاعیرەم هێناوە لە کتێبەکانیان لەسەر خۆیان کە چۆن بەیانی عەقیدەی خۆیان دەکەن و دان بەوەدا دەنێن کە دینداری ئەوان لەسەر تەئویلە!

الحمدلله کتێبێکی پڕ بایەخە لە بابەتی خۆیدا، بە فەزڵی الله دەتوانم بڵێم تاکە کتێبە لەم سەردەمەدا بە زمانی کوردی نوسرابێ دژی ئەشاعیرە و هەڵوەشاندنەوەی عەقیدە و شوبهەکانیان، وە ناوم ناوە « الشِهَاب الحَارِق على الأَشعري المَارِق » بە ئیزنی الله مێخێکی ئاگرین دەبێ بۆ داخکردنی چاوی ئەشعەرییەکان، داواکارم لە ڕەب العالمین لێمانی قبوڵ بکات و بیخاتە سەر میزانی حەسەناتمان والله الموفق والهادي إِلى سبيل الرشاد.

هەڵمەت عبدالله

هەڵەبجە | جمعة

٢/رمضان/١٤٤٤ کۆچی

# دەسپێك

دەتوانم بڵێم ئەم بەشە یەکێکە لە گرنگترین بەشەکانی کتێبەکە، چونکە موجمەلی عەقیدەی سەلەفم تیایدا هێناوە لە چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ ئایات و ئەحادیث لە بابی صیفاتدا، دەکرێ وەک کلیلی بەشەکانی تر سەیر بکرێ، پێش ئەوەی بچمە سەر ناساندنی ئەشعەری و ئەشاعیرە و عەقیدەیان پێم خۆشە لەم بەشەدا قاعیدەی سەلەفتان بۆ بهێنم دەربارەی چۆنیەتی هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ ئایات و ئەحادیثی صیفات.

ئاشکرایە بابەتی صیفاتەکانی الله ﷻ ئەو مەنهەجەیە کە ئەهلی سوننە پێی سەربەرزبوون لە بەرامبەردا ئەهلی تەعطیل بە هەموو صینفەکانیانەوە وەک: موعتەزیلە و جەهمییە و ئەشاعیرە ملیان تیایدا شکاوە، تۆ ئەی موسڵمان هەوڵبدە شوێن طائفەی یەکەم بکەوە ئەهلی سوننە هەتا لە ڕزگاربووان بی، هەر صیفاتێکت بینی سابتی بکە بێ چۆنیەتی و شوبهاندن.

هەر صیفاتێک الله ﷻ لە قورئان جێگیری کردبێ، پاشان ڕەسول الله ﷺ جێگیری کردبێ، ئەوە هیچ تەجسیم و تەشبیهێکی تێدا نییە، کاتێک الله ﷻ وەصفی زاتی خۆی بە صیفاتێک دەکات، ئیتر ئەشعەرییەکی

زەندیق کێیە هەتا بڵێ ئەگەر ئەو صیفاتە جێگیر بکرێ تەجسیمە؟! یاخود ڕەسول الله ﷺ وەصفی الله ـ ی ﷻ بە صیفاتێک کردووە ئیتر جەهمی و موعتەزیلەیەک کێیە هەتا دەمی بۆگەنی بکاتەوە بڵێ ئەوە تەشبیهە!

هەر صیفاتێک الله ﷻ، ڕەسول الله ﷺ جێگیریان کردبێ ئەوە دینە تۆش جێگیریان بکە گوێ مەدە بە قسەی هیچ کەسێکی تر، سەلەف لە هەرسێ سەدە زێڕینەکە لەسەر ئەو عەقیدەیە بوون، تۆش شوێن ئەوان بکەوە، ئەوەی ئەوان لەسەری بوون حەق بووە هەتا قیامەتیش بە حەقی دەمێنێتەوە.

**شافعی** دەڵێ: باوەڕم هەیە بە الله، وە ئەوەش لای الله هاتووە، بەو شێوازەی الله ویستوویەتی و فەرموویەتی، وە باوەڕم هەیە بە ڕەسول الله، وە بەوەی لە لایەن ڕەسول الله هاتووە، بەو شێوازەی ڕەسول الله ویستوویەتی و فەرموویەتی.

قال الشافعي: آمَنتُ بالله، وبِما جاء عَنِ الله، على مُراد الله، وآمَنتُ بِرسولِ اللهِ، وبِما جاء عَن رسول الله، على مُراد رسول الله.

لمعة الإِعتقاد لابن قدامة | صـ : ٣

ئەم قەولەی ئیمامی شافعی یەکێکە لە سەدان قەولی سەلەف کە دەروازەیەکە بۆ تێگەیشتن لە ئایات و ئەحادیثی صیفات بەو جۆرەی دابەزیون، دوور لە تەعطیل و شوبهاندن، لەوانەیە کەسانی فەهم سەقەت و دڵ نەخۆش بە غەڵەت لێکدانەوە بۆ ئەم قەولە بکەن و پێیان وابێ تەفویزی "تفويض" تێدا دەخوێنرێتەوە! نەخێر، بەڵکو سابت کردنی صیفاتی تێدایە بەو جۆرەی الله ﷻ وەصفی خۆی پێکردووە لە قورئاندا بە زمانێکی عەرەبی ڕوون، وە بەو جۆرەش کە ڕەسول الله ﷺ وەصفی الله ـی پێکردووە لە سەدان حدیثدا لەسەر ظاهرەکەیان، وەک دواتر چەندین قەولی لەم جۆرە دەبینن ئیمامەکانی سەلەف کە باس لە ئایات و ئەحادیثی صیفات دەکەن وتوویانە لەسەر ظاهرەکەیەتی، تەفسیرەکەی بەو جۆرەیە دەخوێنرێتەوە، بەڵام ناچوێنرێ ناشوبهێنرێ، بۆیە دەڵێم هیچ ئەشعەرییەک دڵی خۆش نەبێ ئەم قەولەی شافعی بە لای خۆیاندا دابتاشێن و ڕایکێشن، بەڵکو بەڵگەیە لەسەریان نەک بەڵگە بێت بۆیان.

کاتێک صیفاتێک لە قورئاندا هاتووە یاخود لە حدیثدا هاتووە ئەهلی سوننە لەسەر ظاهرەکەی وەریان گرتووە ئێ ئەوە هەمان قەول و تێگەیشتنەکەی شافعی ـیە: ”على مُراد الله، على مُراد رسول الله.“

عەقیدە و مەنهەجی سەلەف ئەهلی سوننە لە مەسئەلەی صیفاتەکانی الله ﷻ دوور بووە لە تەعطیلی موعتەزیلە و جەهمییە و ئەشاعیرە کە پەکخستنی صیفاتە، وە بۆ ئەوەش دووربی لە موشەبەهە کە صیفاتی خالق دەشوبهێنن بە صیفاتی مەخلوق، پێویستە نێوەند گیربێ لە نێوان ئەو دوو پێڕەدا، نە پەکخستنی صیفات کە ئەهلی تەعطیل لە ژێر ناوی تەنزیهی خالقدا ئەنجامی دەدەن، نە شوبهاندی الله ﷻ بە صیفاتی مەخلوقات لە ژێر تەشبیهی موشەبەهە کە پێیان وایە ئەوە جێگیر کردنی صیفاتە! بەڵکو دەبێ هەرچی صیفات هەن لە قورئان و حدیث باوەڕت پێیان هەبێ و جێگیریان بکەی لەسەر ظاهرەکەیان وەریان بگری دوور لە تەعطیل و تەئویل و تەحریف و تەشبیهی موشەبەهە ﴿ لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ ۖ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ ﴾ الشورى : ٤٢

وەرگرتنی مەسائیلی صیفات ئیجماعی هەموو عولەمایانی ئەهلی سوننەی لەسەرە لە سێ سەدە زێڕینەکە و دوای ئەوانیش هەموویان وتوویانە: "أُمروها كما جاءت بلا كيف ولا تفسير" واتە: ئەو حدیث و ئایەتانە چۆن هاتوون بەو جۆرە وەریان بگرن بێ تەئویل، ئەمە قەولی هەموو عولەمای ئەهلی سوننەیە وەک: الزهري، مكحول، مالک بن أنس،

الأوزاعي، سفيان الثوري، عبدالله بن المبارك، وكيع بن الجراح، أبي عبيد القاسم بن سلام، الليث بن سعد، سفيان بن عيينة، الحُميدي، أحمد بن حنبل، أبو عيسى الترمذي، أبو زرعة الرازي و غيرى ئەوانيشه.

ئیمامی **الترمذی** لە دوای ڕیوایەت کردنی حدیثی « **إِنَّ اللَّهَ يَقْبَلُ الصَّدَقَةَ، وَيَأْخُذُهَا بِيَمِينِهِ فَيُرَبِّيهَا لِأَحَدِكُمْ كَمَا يُرَبِّي أَحَدُكُمْ مُهْرَهُ**... ». دەڵێ: غەیری کەسێک لە ئەهلی عیلم دەربارەی ئەم حدیثه و ڕیوایەتەکانی تری صیفات وەک: حدیثی دابەزینی ڕەب العالمین بۆ ئاسمانی دونیا لە هەموو شەوێکدا، وتوویانە: بێگومان ئەم ڕیوایەتانە سابت بوون، وە دەبێ باوەڕت پێیان هەبێ نابێ بوترێ: چۆن؟ بەو جۆرە لە هەریەک مالک کوڕی أنس، سفیان کوڕی عیینە، عبدالله کوڕی مبارک ڕیوایەت کراوە وتوویانە: ئەو حدیثانە چۆن هاتوون بەو جۆرە دەڕوات و وەردەگیرێن بێ چۆنیەتی. ئەمە قەولی ئەهلی عیلمە لە ئەهلی سوننە و جەماعە.

ئەما جەهمییەکان ئەوە ئەم ڕیوایەتانە ڕەتدەکەنەوە، دەڵێن: ئەوە شوبهاندنە. لە کاتێکدا الله ﷻ لە چەندین شوێن لە کتێبەکەیدا باسی صیفاتی: دەست، بیستن، چاوی کردووە، تەفسیری ئەم صیفاتانەیان بە

تەفسیری غیری ئەهلی عیلم دەکرد، وە دەڵێن: الله ئادەمی بە دەستی خۆی دروست نەکردووە، دەست لێرەدا بە مانای هێز دێ .

وە **إسحاق کوڕی إبراهیم** راهویە دەڵێ: کاتێک شوبهاندنە کە بوترێ: دەستی وەک دەستی بەنی ئادەم، وە بیستن وەک بیستنی بەنی ئادەم، ئەمە شوبهاندنە، ئەمما ئەگەر بەو جۆرە بڵێ کە الله ﷻ فەرموویەتی: دەست، بیستن، چاو، بەڵام نەڵێ: چۆن چۆنییە. نەڵێ: بیستن وەک بیستنی بەنی ئادەم، ئەمە شوبهاندن نییە، هەروەک چۆن الله ﷻ فەرموویەتی: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ﴾.

وقد قال غير واحد من أَهل العلم في هذا الحديث وما يشبه هذا من الروايات الصفات، ونزول الرب تبارك وتعالى كل ليلة إِلى السماء الدنيا، قالوا: قد ثبتت الروايات في هذا، ويؤمن بها ولا يتوهم، ولا يقال: كيف؟ هكذا روي عن مالك، وسفيان بن عيينة، وعبدالله بن المبارك أَنهم قالوا في هذه الأَحاديث: أُمِرُّها بلا كيف. وهكذا قول أَهل العلم من أَهل السنة والجماعة.

وأَما الجهمية فأَنكرت هذه الروايات، وقالوا: هذا تشبيه. وقد ذكر الله عَزَّ وَجَلَّ في غير موضع مِن كتابهِ: الْيَدَ وَالسَّمْعَ وَالْبَصَرَ، فَفَسروها على

غير ما فَسَّرَ أَهل العلم، وقالوا: إِنَّ الله لم يخلُق آدم بيده وقالوا: إِنَّ معنى الْيَدِ هَاهُنَا القُوة. وقال إِسحاق بن إِبراهيم: إِنَّما يكون التشبيهُ إِذا قال: يَدٌ كَيَدٍ، أَو مثل يَدٍ، أَو سمعُ كَسمْعٍ، أَو مِثل سَمعٍ. فإِذا قَال: سَمعٌ كَسَمعٍ، أَو مِثلُ سَمْعٍ فَهَذا التَّشْبِيهُ، وَأَما إِذَا قَال كَما قَال اللَّهُ تَعالَىَ: يَدٌ وَسَمعٌ وَبَصَر. وَلَا يَقُول: كَيفَ. وَلَا يَقُولُ: مِثْلُ سَمْعٍ، وَلَا كَسَمعٍ فَهَذا لَا يَكونُ تَشْبِيهًا. وَهُوَ كَما قَالَ اللَّهُ تَعَالَىَ فِي كِتَابِهِ: ﴿ لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَىْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ﴾.

السنن للترمذي ا ٦٧٠

**أبو عمرو الأوزاعى** دەڵێ: إبن شهاب الزهرى و مكحول دەيانوت: ئەو حديثانەى لە بارەى صيفات هاتوون بەو جۆرەى هاتوون وەريان بگرن.

قال الأَوزاعي: كان الزهري ومكحول يقولان: أُمرِّوا هذه الأَحاديث كما جاءت.

شرح أُصول اعتقاد أَهل السنة للالكائي ا ٧٣٥

**عباس الدورى** دەڵێ: بیستم أبو عبيد قاسم كوڕى سلام ئەو حديثانەى باس دەكرد لە بابى صيفات هاتوون وەک: « الرؤية، والكرسي، وموضع القدمين، وضحک ربنا من قنوط عباده، وقرب غيره، وأَين كان ربنا قبل أَن يخلق السماء، وأَنَّ جهنم لا تمتلىء حتى يضع ربک قدمه فيها، فتقول: قَط، قَط ». ئەم حديثانە و هاوشێوەكانيان، ووتى: ئەم حديثانە صحيحن ئەصحابى حديث و فوقەها ڕيوايەتيان كردووە، لاى ئێمەش حەقە هيچ گومانێكى تێدا نييە، بەڵام ئەگەر ووتيان چۆن پێى دادەنێ؟ وە چۆن پێدەكەنێ؟ دەڵێين: تەفسيرى ئەو چۆنيەتييە ناكەين، وە نەمان بيستووە كەسێک تەفسيرى كردبێ.

قال عباس الدوري: سمعت أَبو عبيد القاسم بن سلام وذكر الباب الذي يروى في الرؤية، والكرسي، وموضع القدمين، وضحک ربنا من قنوط عباده، وقرب غيره، وأَين كان ربنا قبل أَن يخلق السماء، وأَنَّ جهنم لا تمتلىء حتى يضع ربک قدمه فيها، فتقول: قَط، قَط، وأَشباه هذه الأَحاديث، فقال: هذه الأَحاديث صحاح حملها أَصحاب الحديث، والفقهاء بعضهم عن بعض، وهي عندنا حق لا شک فيها، ولكن إِذا قيل

كيف وضع قدمه؟ وكيف ضحک؟ قلنا: لا يفسر هذا، ولا سمعنا أَحداً يفسره.

كتاب السنة للخلال ا ٢٩٥ كتاب الصفات للدارقطني ا ٥٩ كتاب التوحيد لابن مندة ا ٥٨٩ شرح أُصول اعتقاد أَهل السنة للالكائي ا ٩٢٨

**يحيى كوڕى معين** دەڵێ: ئامادەبووم زكريا كوڕى عَدي پرسيارى كرد لە وكيع كوڕى جراح، ووتى: ئەى باوكى سفيان ئەو حديثانە وەک: كورسى، شوێنى پێيەكان، هاوشێوەكانيان؟ وكيع ووتى: گەيشتووين بە إسماعيل كوڕى أَبى خالد و سفيان و مسعر كوڕى كِدام ئەو حديثانەيان دەگێڕايەوە بێ ئەوەى تەفسيرى چۆنيەتييەكانيان بكەن.

قال يحيى بن معين: شهدت زكريا بن عدي يسأَل وكيعاً، فقال: يا أَبا سفيان هذه الأَحاديث يعني مثل الكرسي، موضع القدمين، ونحو هذا؟ فقال وكيع: أَدركنا إِسماعيل بن أَبي خالد، وسفيان، ومسعراً يحدثون بهذه الأَحاديث ولا يفسرون شيئا.

كتاب الصفات للدارقطني ا ٦٠ كتاب التوحيد لابن مندة ا ٥٨٧

**إسحاق كوڕی موسی** دەڵێ: بیستم سفیان کوڕی عیینة دەیوت: هەر صیفاتێک الله ﷻ وەصفی خۆی پێکردبێ لە قورئان، چۆن دەخوێنرێتەوە ئەوە تەفسیر و ماناکەیەتی، نەدەوترێ چۆنە نەدەشوبهێنرێت.

قال إِسحاق بن موسى الأَنصاري: سمعت سفيان بن عيينة يقول: كل ما وصف الله به نفسه في القرآن، فقراءته تفسيره لا كيف، ولا مثل.

كتاب الصفات للدارقطني | ٦٣ شرح أُصول اعتقاد أَهل السنة للالكائي | ٧٣٦

**أحمد كوڕی إبراهيم الدورقی** دەڵێ: بیستم وکیع کوڕی جراح دەیوت: ئەو حدیثانە تەسلیمین پێیان چۆن هاتوون بەو جۆرە وەریان دەگرین ناڵێین ئەو صیفاتە چۆن چۆنییە، وە بۆ بەو جۆرە هاتووە.

قال أَحمد بن إِبراهيم الدورقي: سمعت وكيعاً يقول: نسلم هذه الأَحاديث كما جاءت ولا نقول كيف هذا، ولِمَ جاء هذا.

كتاب الصفات للدارقطني | ٦٤

**وليد كوڕی مسلم** دەڵێ: پرسیارم کرد لە الأوزاعی و مالک کوڕی أنس و سفیان الثوری و لیث کوڕی سعد دەربارەی ئەحادیثی صیفات

وەک: بینینی الله ﷻ، وە غیری ئەوەش؟ ووتیان: چۆن هاتوون بەو جۆرە وەریان بگرن لەسەر ظاهرەکەیان مەڵێن چۆن چۆنییە.

قال الوليد بن مسلم: سأَلت الأَوزاعي، ومالک ابن أَنس، وسفيان الثوري، والليث بن سعد، عن هذه الأَحاديث التي فيها: الرؤية وغير ذالک؟ فقالوا: أُمروها كما جاءت بلا كيف.

كتاب السنة للخلال ا ٢٩٧ كتاب الشريعة للآجري ا ٧٢٠ كتاب الصفات للدارقطني ا ٦٩ كتاب التوحيد لابن مندة ا ٥٨٦ شرح أُصول اعتقاد أَهل السنة للالكائي ا ٩٣٠

**أبو بكر المروذى** دەڵێ: پرسیارم کرد لە باوکی عبدالله أحمد کوڕی حنبل دەربارەی ئەو حدیثانەی صیفات کە جەهمییەکان ڕەدیان دەکەنەوە، وەک: بینینی الله ﷻ، الإسراء، عەرشی الله ﷻ؟ أبو عبدالله بە صحیحی دانان، وە ووتی: ئەو حدیثانە هەموو عولەما وەریان گرتوون، ئێمەش وەریان دەگرین و قبوڵیان دەکەین لەسەر ظاهرەکەیان بەو جۆرەی هاتوون.

قال أَبو بكر المروذي: سأَلت أَبا عبدالله عن الأَحاديث التي تردها الجهمية في الصفات، والرؤية، والإِسراء، وقصة العرش؟

فصححها أَبو عبدالله، وقال: قد تلقتها العلماء بالقبول، نسلِّم الأَخبار كما جاءت.

كتاب السنة للخلال ا ٢٦٧ كتاب الشريعة للآجري ا ٧٢٦

**أبو بكر الآجرى** دەڵێ: أبا عبدالله الزبيرى دەيوت: باوەڕمان بەو حديثانە هەيە بەو جۆرەى هاتوون، وە باوەڕمان پێيانە ناڵێين چۆن چۆنييە؟ بەڵكو لەوەدا دەوەستين كە سەلەف لەسەرى وەستاون، قەولى ئێمە هەر ئەوەيە كە حديث و خەبەرەكان چۆن هاتوون وەريان دەگرين بەو جۆرە لەسەر ظاهريان.

قال الآجري: سمعت أَبا عبدالله الزبيري يقول: نؤمن بهذه الأَحاديث التي جاءت كما جاءت، ونؤمن بها إِيماناً ولا نقول كيف؟ ولكن ننتهي في ذالک إِلى حيث إِنتهى بنا، فنقول في ذالک ما جاءت به الأَخبار كما جاءت.

كتاب الشريعة للآجري ا ٧٢٦

ئەگەر سەرنج بدەن هەموويان موتەفيقن لەسەر جێگيركردنى هەموو صيفات بەو جۆرەى هاتوون "بلا كيف ولا تفسير" مەبەست لەم ڕستە

ئەوەیە نابێ بپرسرێ لە چۆنیەتی صیفات، فڵان صیفەت چۆنە هەتا تووشی شوبهاندنی موشەبیهە و تەعطیلی جەهمییە و موعتەزیلە وئەشاعیرە نەبی.

هەروەها کە وتووشیانە "بلا تفسیر" مەبەست ئەوە نییە تەفسیری ماناکەی نەکرێ بەو جۆرەی هاتووە، بەڵکو مەبەست لێی ئەوەیە تەفسیری چۆنیەتییەکەی نەکرێ وەک تەفسیری ئەهلی تەعطیل، چونکە سەلەف هەموویان بە ئیجماع تەفسیری ماناکەیان کردووە بەو جۆرەی لوغەی عەرەبی خواستوویەتی و عەرەب زانیویانە ماناکەیان جێگیر کردووە بەو جۆرەی لە قورئان یاخود لە حدیث هاتووە.

بۆ نمونە کاتێک پرسیار لە أبو زرعة الرازي دەکرێ دەربارەی ئایەتی الإستواء ﴿ الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى ﴾. دەڵێ: تەفسیرەکەی بەو جۆرەیە کە دەخوێنرێتەوە لەسەر عەرشە، وە عیلمەکەی لە هەموو شوێنێکە، هەرکەسێک غیری ئەوە بڵێ لەعنەتی الله ـی لێبێ.

عن أَبي زرعة الرازي أَنَّه لما سُئِلَ عن تفسير قوله تعالى: ﴿ الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى ﴾ فقال: تفسيره كما يُقرأ، هو على العرش، وعلمه في كُل مكان، ومَن قال غير هذا فعليه لعنة الله.

مجموع الفتاوى لابن تيمية | (٥/٥٠)

هەروەها **أبو عثمان الصابونی** لە بابی صیفاتدا قەولی سەلەف دەهێنێ کە هەموویان موتەفیق بوون لەسەر جێگیرکردنی بەو شێوەیەی الله ﷻ، ڕەسول الله ﷺ فەرموویانە بێ کەم و زیاد، بێ چۆنیەتی و شوبهاندن، بێ گۆڕینی مانا و تەئویل کردنی، بێ لادانی لەفزەکەی بەو جۆرەی عەرەب دەیزانێ، بەڵکو چۆن هاتووە بەو جۆرە دەڕوات لەسەر ظاهرەکەی.

قال الصابوني: بل ينتهون فيها إِلى ما قاله الله ﷻ وقاله رسوله ﷺ من غير زيادة عليه ولا إِضافة إِليه، ولا تكييف له ولا تشبيهٍ ولا تحريفٍ ولا تبديلٍ ولا تغيرٍ، ولا إِزالةٍ للفظ الخبر عما تعرفه العرب وتضعه عليه بتأويل منكر يُستنكر، ويُجرنه على الظاهر.

عقيدة السلف وأصحاب الحديث للصابوني | صـ : ١٧



## ئەشاعیرە کێن و بۆچی ئەو ناوەیان لێنراوە

گرووپێکن لەو گرووپانەی کە صیفاتەکانی الله ﷻ ڕەتدەکەنەوە درێژە پێدەری عەقیدەی موعتەزیلە و جەهمیەکانن، بۆیە ئەو ناوەیان لێنراوە، چونکە شوێن أبو الحسن الأشعري کەوتوون کە ساڵی **(٣٢٤)** یاخود **(٣٣٠)** یاخود **(٣٣٦)** هیجری وەفاتی کردووە، لە کتێبەکاندا دەربارەی وەفاتی ئەو خیلافە هەیە و ئەو سێ تاریخە هاتووە کە تیایدا مردووە.

**إبن عساكر** لە کتێبەکەیدا بابێکی داناوە لەسەر نەسەب و ناوی أبو الحسن الأشعري، لە البيهقي ـیەوە نقڵ دەکات دەڵێ: أخبرنا الشيخ أبو عبدالله محمد بن الفضل بن أحمد الفراوي الفقيه بنيسابور، قال: أنبأنا الإمام أبو بكر أحمد بن الحسين بن علي البيهقي الحافظ، قال: رأيت في كتب أصحابنا: أبو الحسن علي بن إسماعيل بن أبي البشر إسحاق بن سالم بن إسماعيل بن عبدالله بن موسى بن بلال بن أبي بردة بن أبي موسى الأشعري.

هەروەها دەڵێ: أخبرنا الشيخ أبو الحسن علي بن أحمد بن قبيس بدمشق، وأبو منصور محمد بن عبدالملك بن خيرون المقري ببغداد قالا:

قال لنا الإمام أَبو بكر أَحمد بن علي بن ثابت الخطيب الحافظ البغدادي: علي بن إِسماعيل بن أَبي البشر واسمه إِسحاق بن سالم بن إِسماعيل بن عبدالله بن موسى بن بلال بن أَبي بردة بن أَبي موسى، أَبو الحسن الأَشعري المُتَكَلِّم.

تبيين الكذب المفتري لابن عساكر ا صـ : ٢٣

ئەوەلەن سەیری ئاخر قەولی خطیب البغدادی بکەن دەڵێ: "أَبو الحسن الأَشعري المُتَكَلِّم" واتە ئەهلی کەلام نەک ئەهلی سوننە، أَبو بكر الخطيب لە تاريخ البغداد موجەڵەدی **(١١)** لاپەڕە **(٣٤٦)** لە تەرجومەی شەخصی ژمارە **(٦١٨٩)** ئەمەی هێناوە.

پاشان لە ڕاستیدا نەسەب بەم جۆرە ئیثبات نابێ، چونکە هیچکامیان واتە الخطيب البغدادی و إبن عساکر لە هیچ کەسێکەوە ئەم ڕیوایەتەیان نەهێناوە، بەڵکو إبن عساکر بە واسطەی شێخەکەی لە البيهقي هێناویەتی کە وتوویەتی لە هەندێک کتێب وام بینیوە، وە الخطيب البغدادي ـش ڕاستەوخۆ نەسەبەکەی دادەنێ بە بێ ڕیوایەت! ثابت بوونی نەسەب بە ڕیوایەت دەبێ واتە خاوەنەکەی نەسەبی خۆی بڵێ بە قوتابی و ئەو کەسانەی لەدەوروبەری کۆبوونەتەوە، یاخود نەسەبی خۆی لە کتێبدا

بنوسیٚ، یاخود پرسیاری لێبکرێ نەسەبت چییە؟ ئەویش وەڵام بداتەوە فڵانی کوڕی فڵانم إلى آخره. هەروەک چۆن ئیمامی أحمد نەسەبی خۆی نوسیوە لە کتێبدا صاڵحی کوڕیشی گێڕاویەتیەوە، کەسانی تریش لە صاڵحەوە گێڕاویانەتەوە بەو جۆرە دەما و دەم سەدە دوای سەدە بە ڕێگەی سەنەدی متصل گێڕراوەتەوە.

ثم قال أَبو الفضل: وجدت في بعض كُتب أَبي نَسَبه: أَحمد بن محمد بن حنبل بن هِلال بن أَسد بن إِدريس بن عبدالله بن حَيَّان بن عبدالله بن أَنس بن عوف بن قاسط بن مَازن بن شَيبان بن ذهل بن ثَعلَبة بن عكابة بن صَعب بن علي بن بكر وَائِل بن قاسط بن هنب بن أَفضي بن دعمي بن جديلة بن أَسد بن ربيعة بن نزار بن معد بن عدنان بن أَد بن أَدد بن الهُمَيسْع بن النبت بن قيذار بن إِسماعيل بن إِبراهيم ﷺ.

سيرة الإِمام أَحمد بن حنبل لأَبي الفضل صالح بن أَحمد ا صـ : ٣٨

ئەنجا أبو الحسن الأشعري لە ڕووی نەسەبیشەوە نیزاعی لەسەرە، هەروەک چۆن أبو علي الأهوازي دەڵێ: لە بەصرە بە إبن أبي البشر دەناسرێتەوە، هاوەڵەکانی ئەم ناوەیان پێ ناخۆشە لێی هەڵدێن، بەو جۆرە وەصفی ناکەن و ناوی ناهێنن، لە شێخەکانی ئەهلی بەصرەم بیست

دەیانوت: ڕاکردنیان لەو ناوە سەبەبێکی هەیە، ئەویش ئەوەیە أبو البشر کە باپیریەتی جوولەکە بووە لەسەر دەستی پیاوێکی هۆزی ئەشعەری موسڵمان بووە، ئیتر خۆی داوەتە پاڵ ئەو پیاوە، هەر بۆیە لەو بارەیەوە ئەم شیعرە وتراوە:

سَأَلْتُه عن أَبيهِ ... فقال جَدِّي شُعَيبُ

وما كَنَى عن أَبيهِ ... إِلا وثَمَّ سُبَيبُ

ومِن أَعجب الأَشياء أَنَّه ليس يُعرف بالبصرة إِلا بابن أَبي البشر، وأَصحابه يفرون من هذا الإِسم، ولا يصفونه به، وسمعت شيوخًا من أَهل البصرة يقولون: ما فرارهم من هذا الإِسم إِلا لسبب، وذالک أَنَّ جَدّه أَبا بشر يهوديًا أَسلم على يد رجل يُنسب إِلى الأشعريين، فانتسب إِلى ذالک، والله أَعلم.

وقد قيل في الأَشعار السائرة:

سَأَلْتُه عن أَبيهِ ... فقال جَدِّي شُعَيبُ

وما كَنَى عن أَبيهِ ... إِلا وثَمَّ سُبَيبُ

مثالب ابن أَبي البشر للأَهوازي ا صـ : ٢٠

ئەگەر هاتوو ئەو ئیدعا کردنی نەسەبەی درۆ و تەزویر بێ، ئەوە یەکێکە لە تاوانە گەورەکان و هەڕەشەی زۆر توند لە خاوەنەکەی کراوە، سەرەڕای باتڵی عەقیدەکەی با ئەو هەڕەشە قورسەیەشی بچێتە سەر میزانی خراپەکانی.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: پشت لە باوانتان مەکەن، هەرکەسێک پشت لە باوکی بکات و خۆی نەداتە تەنیشتی ئەوە ئەو کردەوەیە کوفرە "واتە کوفری بچوک."

عَنْ عِرَاكِ بْنِ مَالِكٍ، أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ يَقُولُ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: { لَا تَرْغَبُوا عَنْ آبَائِكُمْ، فَمَنْ رَغِبَ عَنْ أَبِيهِ فَهُوَ كُفْرٌ }.

رواه البخاري | ٦٧٦٨ ومسلم | ٢١٨ وأحمد | ١٠٨١٣

أبا عثمان النهدي دەڵێ: بیستم لە سعد کوڕی أبي وقاص کە یەکەم کەس بووە ڕمی هاویشتووە في سبيل الله، هەروەها بیستیشم لە أبا بكره هەردووکیان ووتیان: بیستمان ڕەسول الله ﷺ فەرمووی: هەرکەسێک ئیدعای غیری باوکی بکات لە نەسەبەوە خۆی نەداتە تەنیشتی، وە بشزانێ ئەوە باوکیەتی، ئەوە بەهەشتی لەسەر حەڕامە.

قَالَ أَبَا عُثْمَانَ: سَمِعْتُ سَعْدًا وَهُوَ أَوَّلُ مَنْ رَمَى بِسَهْمٍ فِي سَبِيلِ اللَّه، وَأَبَا بَكْرَةَ وَكَانَ تَسَوَّرَ حِصْنَ الطَّائِفِ فِي أُنَاسٍ، فَجَاءَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالاَ: سَمِعْنَا النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: « **مَنِ ادَّعَى إِلَى غَيْرِ أَبِيهِ، وَهُوَ يَعْلَمُ فَالْجَنَّةُ عَلَيْهِ حَرَامٌ.**»

رواه البخاري ا ٤٣٢٦-٤٣٢٧ ومسلم ا ٢٢٠ وأحمد ا ١٤٩٧

نەسەب ئەگەر هاتوو عەقیدەی صحیحی لەگەڵ نەبێ هیچ بایەخێکی نییە، ئەوەتا کوڕی پێغەمبەر نوح ﷺ کافر بووە لە تۆفانەکە تیاچوو. ﴿وَهِىَ تَجْرِى بِهِمْ فِى مَوْجٍ كَالْجِبَالِ وَنَادَى نُوحٌ ابْنَهُ وَكَانَ فِى مَعْزِلٍ يَا بُنَىَّ ارْكَب مَّعَنَا وَلَا تَكُن مَّعَ الْكَافِرِينَ * قَالَ سَآوِى إِلَى جَبَلٍ يَعْصِمُنِى مِنَ الْمَاءِ قَالَ لَا عَاصِمَ الْيَوْمَ مِنْ أَمْرِ اللهِ إِلَّا مَن رَّحِمَ وَحَالَ بَيْنَهُمَا الْمَوْجُ فَكَانَ مِنَ الْمُغْرَقِينَ﴾ هود : ٤٢-٤٣ فەزڵ و پایەی باوکی نەبوویە شەفاعەت بۆی، هەروەها ژنی پێغەمبەر لوط ﷺ بە کافری لەگەڵ قەومەکەی تیاچوو. ﴿ وَلَمَّا أَن جَاءَتْ رُسُلُنَا لُوطًا سِىءَ بِهِمْ وَضَاقَ بِهِمْ ذَرْعًا وَقَالُوا لَا تَخَفْ وَلَا تَحْزَنْ إِنَّا مُنَجُّوكَ وَأَهْلَكَ إِلَّا

امْرَأَتَكَ كَانَتْ مِنَ الْغَابِرِينَ ﴾ العنكبوت : ٣٣ مەقامی مێردەکەی نەبووە هۆکاری پاراستنی.



# کافر بوونی ئەو کەسەی صیفاتی کەلامی الله ﷻ ڕەتدەکاتەوە

لای سەلەف شتێک نەبووە بەناوی ئەشاعیرە، چونکە تاریخی دروست بوونیان بەو ناوەوە دەکەوێتە دوای سەدەی سێهەم کاتی دەرکەوتنی أبو الحسن الأشعري موعتەزیلی، ئەوەی لای سەلەف بوونی هەبووە تەعطیلی موعتەزیلە و جەهمییەکانە، هەربۆیە سەلەف بە ئەرکی سەرشانیان هەستان و کتێبیان دژیان نوسی تیایدا عەقیدە کوفرییەکانیان بۆ خەڵکی ڕوون کردەوە، کتێبێکی سەلەف و ئەهلی سوننە نابینی ئیللا ڕەدی ئەهلی تەعطیلیان داوەتەوە بە هەموو صنفەکانیانەوە.

ئەمما کاتێک ئەشاعیرە پەیدا بوون دەستیان دایە هەمان تەعطیلەکەی موعتەزیلە و جەهمییەکان، شوێن هەمان ڕێگە و عەقیدەیان کەوتن، بۆ نمونە کاتێک باسی صیفاتی وەستانی الله ﷻ لەسەر عەرش "الإِستواء" دێتە پێشەوە ئەشاعیرە بە تەئویل ڕەتیدەکەنەوە پێیان وایە الله ﷻ بەرز نەبووەتەوە بۆ سەر عەرش، إِستواء بە مانای وەستان نایەت، بەڵکو بە مانای "إِستلاء، إِستولی" دێ واتە دەستی بەسەردا گرتووە، کەئەنەما پێشتر عەرش موڵکی کەسێکی تر بووە! ئەمە نەفی کردنی صیفاتە، لای

جەهمییەکانیش بەهەمان شێوەیە پێیان وایە الله ﷻ لەسەر عەرش نیە، هەردووکیان موتەفیقن لەسەر نەفی کردنی صیفات، ئەمە بۆ صیفاتەکانی تریش دروستە واتە بەهەمان شێوە ڕەتدەکرێتەوە، بەم جۆرە ئەشاعیرە دەکەونە ڕەتکردەنەوەی صیفاتەکانی ڕەب العالمین، وە ئەشاعیرە دووبارە موتەفیقن لەگەڵ جەهمییەکان لەوەی بە ئەهلی سوننە دەڵێن موجەسیمە و موشەبیهە! هەربۆیە دەبینی عولەمایانی ئەهلی سوننە ڕەدی ئەشاعیرەیان داوەتەوە و کتێبیان دژیان نوسیوە و خەڵکیان لە تەعطیلەکەیان ئاگادار کردووەتەوە، لای سەلەف هەرکەسێک نەفی صیفاتی کردبێ بە جەهمی و زەندیق و کافر ناویان هێناوە.

ئەصڵەن لای سەلەف تەکفیری ئەشاعیرە هەیە لە کاتێکدا ئەشاعیرە بە ناو هەر وجوودیان نەبووە، بەڵام عەقیدەکەیان بە بناغە هەبووە ئەویش تەعطیلی موعتەزیلە و جەهمییەکانە، یەکێک لەو صیفاتانەی ئەشاعیرە قسەی لەسەر دەکەن و ڕەتیدەکەنەوە قورئانە صیفاتی کەلام، لە مەسئەلەی قورئان کە کەلامی الله ـیە ﷻ هەموو سەلەف ئیجماعەن تەکفیری تەعطیلکەری کەلامیان کردووە، موعتەزیلە و جەهمییە کە کەلامیان ڕەتکردووتەوە تەکفیر کراون، حرب کوڕی إسماعیل الکرماني

ئیجماع نقڵ دەكات و دەڵێ: والجهمية هُم كُفار زنادقة أعداء الله فاحذروهم.

كتاب السنة لحرب الكرماني ا ٩٦

یەک قەولی وكیع كوڕی جراح لەسەر تەكفیری پەكخەری صیفاتی كەلام بەسە بۆ جەهمییە و ئەشاعیرە، لەسەر ئەو بابەتە دەڵێ: هەركەسێک بڵێ كەلامی الله ﷻ هی خۆی نییە و قسەی پێ نەكردووە، ئەوە كافرە، وە هەركەسێک بڵێ: بەشێكی مەخلوقە ئەوە كافر بووە.

حدثني محمد بن إِسحاق الصاغاني، حدثنا أَبو حاتم الطويل، قال: قال وَكيع: مَن قال: إِنَّ كلامه ليس مِنه، فقد كَفَر، ومَن قال: إِنَّ منه شيئًا مخلوقًا فهو كَفَرَ.

كتاب السنة لعبدالله بن أَحمد ا ٤٠

ووتم: كەئەنەما ئەشاعیرە لە پێش چاوی بوون كاتێک دەڵێن: قورئان "كلام النفسي، عبارة وحكاية عن كلام الله" واتە الله ﷻ قسە ناكات، بەڵكو كەلامەكەی لە نەفسی خۆیدایە و جبریل لێی تێگەییوە! یاخود لە

نەفسێکی تردا خەلقی کردووە! یان تەنها یەکجار قسەی کردووە کەلامەکەی قەدیمە دوای ئەوە قسەی نەکردووە و قسە ناکاتەوە!

**أبو جعفر السويدى** دەڵێ: بیستم بە وکیع کوڕی جراح وترا: فڵانە کەس دەڵێ: قورئان داهێنراوە مەخلوقە. ووتی سبحان الله! لەو کوفرە ئەمە کوفرە.

حدثنا أَحمد بن سلمان، قال: حدثني إِدريس، قال: حدثنا أَحمد بن إِبراهيم، قال: حدثنا أَبو جعفر السويدي، قال: سمعت وكيعًا يقول: وقيل له: إِنَّ فُلَانًا يقول: إِنَّ القرآن مُحْدَثٌ. قال: سبحان الله! هذا الْكُفْرُ.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٢٣٥٤



## قەولی ئەشاعیرە دەربارەی کەلامی الله ﷻ

ئەشاعیرە دەربارەی قورئان کە کەلامی الله ـیە ﷻ دوو ووتەیان هەیە لە هەردوو حاڵەتەکەدا قورئان بەلایانەوە مەخلوقە!

١- كلام الله قائم بالنفس، المعنى قائم بالذات: واتە کەلامی الله ﷻ لە نەفسی خۆیدایە دانەبەزیوە و دانابەزێ، بەڵام جبریل علیه السلام لێی تێگەیشتووە و هێناویەتی بۆ محمد ﷺ، ئەمما حەرف و صەوتەکانی ئەوە عیبارەت لەو کەلامەی نەفس دەکات!

٢- القرآن عبارة عن كلام الله، حكاية عن كلام الله: واتە الله ﷻ ئەو کەلامەی لە نەفسێکدا دروست کردووە، یاخود لە لوح المحفوظ دروستی کردووە عەبدەکانی قسەیان پێکردووە، حەرف و صەوتەکانی حیکایەتی ئەو کەلامەیە هاوشێوەی ئەوە!

ئەمە ووتەی ئەشاعیرەیە لە هەردوو بارەکەدا دەڵێن مەخلوقە، ئەمە نەفی کردنی کەلامە بە تەریقەی جەهمییەکان، بەسێ خاڵ ڕەدیان دەدەینەوە:

یەکەم: کەلامی الله ﷻ صیفەتە، وە صیفەت پەیوەست نییە بە نەفسەوە واتە ناکرێ صیفاتی کەلام شاراوەبێ لە ناخدابێ، کەواتە ناکرێ کەلامی الله ﷻ بەو جۆرە ناو بهێنرێ و بوترێ کلام الله قائم بالنفس.

دووەم: کە دەڵێن لە زاتێکی غیری خۆی دروستی کردووە، ئەمەش هەر باتڵە ئەگەر بەو جۆرە بووایە ئەوە دەبووە کەلامی ئەو شەخصەی قسەکان دەکات نەک کەلامی الله ﷻ.

سێهەم: یاخود دەڵێن الله ﷻ کەلامەکەی لە زاتی خۆیدا دروست کردووە، ئەمەشیان هەر باتڵە ئەگەر بێت و لە نەفسی خۆیدا دروستی بکات ئەوە نەفسی دەبوویە شوێنی دروستکراوەکان، وە هەر مەکانێک بوویە شوێنی ڕووداو ئەوە مەخلوقە.

وەک پێشتر ئاماژەم پێدا لای ئەشاعیرە گەرچی قورئان کەلامی الله ـش بێ ئەوە دەڵێن عبارة عن كلام الله، حكاية عن كلام الله، پێم باشە پێناسەی ئەو دوو ڕستەیە بزانن:

١- عِبَارَة عن كَلام الله: مەبەست لێی ووتەی غەیب و شاراوەیە ئەو کەلامەی کە لە نەفس و ناخی شەخصەکەدایە دەری نەبڕیوە، بەڵکو بە مانایەک دەردەبڕێ کە تەعبیر لەوە بکات کە لە ناخی شەخصەکەدایە!

ئەمە باتڵترین قسەیە، چونکە هەر شتێک لە ناخدابێ هەتا دەرنەبڕرێ بە کەلام دانانرێ.

تەماشاکەن لە شەرعدا هەر کەلام و قسەیەک لە دڵدا بووبێ هەتا خاوەنەکەی دەری نەبڕیبێ لەسەر خاوەنەکەی حساب نەکراوە، وە پێغەمبەر ﷺ ئەو ووتانەی لە ناو نەفسدان بە کەلامی دانەناون، بەوەش ڕوون و وازحە ئەو کەسەی ووتەیەک لە نەفس و دڵیدایە هەتا بە دەم دەرینەبڕێ لەسەری حساب ناکرێ.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: الله ﷻ لە ئوممەتەکەمی هەڵگرتووە ئەوەی لە نەفس و دڵیاندایە لەسەریان حساب ناکات، هەتا عەمەلی پێنەکەن یاخود قسەی پێنەکەن.

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: { إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ تَجَاوَزَ لِأُمَّتِي عَمَّا حَدَّثَتْ به أَنْفُسَهَا، ما لَمْ تَعْمَلْ، أَوْ تَكَلَّمْ بِهِ }.

رواه البخاري ا ٢٥٢٨ ومسلم ا ٣٣٣ وأحمد ا ٧٤٧٠

ئەو کەسەی ووتەیەک یاخود کۆمەڵە ڕستانێک لە نەفسیدایە هەتا بە دەم نەیانکات پێی ناوترێ قسەکەر و ووتەبێژ، بەڵکو پێی دەوترێ

بێدەنگ و صامت، لای هەموو خەلق ئاشكرایە جیاوازی نێوان كەسێک لاڵ بێ لەگەڵ كەسێک كە توانای قسەی هەبێ ئەو توانا و دەربڕینەیە كە هەیەتی لە كردنی قسە و خستنەڕووی ئەو ووتانەیە لە نەفسیدایە.

لە ئەثەری **عبدالله كوڕی عباس** رضي الله عنهما هاتووە كە خەبەرێكی درێژە، بەڵام هێندەی دەهێنم كە مەبەست دەگەیێنێ، كاتێک ڕەسول الله ﷺ وەفات دەكات عمر بە أبو بكر الصديق دەڵێ: يا أبا بكر هەستە بمانبە بۆ لای برا پشتیوانەكانمان "واتە خەڵكی مەدینە" كاتێک نزیک بووینەوە لێیان گەیشتین بە دوو پیاو لە پشتیوانەكان ووتیان: ئەی كۆمەڵی كۆچەران "واتە مەككەییەكان" بۆ كوێ دەچن؟ ووتمان: دەمانەوێ بچین بۆ لای برا پشتیوانەكانمان. ووتیان: مەڕۆن نزیكیان مەبنەوە. ووتم: والله دەچین بۆ لایان. ڕۆیشتین هەتا گەیشتینە سەقیفەی بني ساعدة، سەیرمان كرد پیاوێک لەوان لە نێوانیاندا خۆی داپۆشی بوو، ووتم: ئەمە كێیە؟ ووتیان: سعد كوڕی عبادة. ووتم: چییەتی؟ ووتیان: تای هەیە. تۆزێک دانیشتین، ووتاربێژەكەیان هەستایەوە حەمد و سەنای الله ی كرد بەو جۆرەی شایستەیەتی و شاهێدی دا بە حەق بوونی ڕەسول الله ﷺ پاشان ووتی: أما بعد، ئێمە پشتیوانی الله و كەتیبەی ئیسلامین،

وه ئێوەی کۆمەڵی کۆچەران کەمینەیەک بوون قەومەکانتان دەریان پەڕاندن ئێمە باوەشمان بۆتان کردەوە، ئێستا ئێمە لە پێشین بە خیلافەت. کاتێک قسەکانی تەواو کرد و بێدەنگ بوو ویستم قسە بکەم، لە ناخی خۆمەوە قسانێکم ئامادەکردبوو بە لای خۆمەوە زۆر باش بوون، دەمویست لە بەردەم أبو بكر بیانڵێم، کاتێک ویستم دەم بکەمەوە أبو بكر ووتی: ڕاوەستە لەسەرخۆبە. منیش پێم خۆش نەبوو سەرپێچی فەرمانی بکەم و لە خۆمی تووڕە بکەم، أبو بكر دەستی کرد بە قسە کردن، ئەو لە من زیاتر هێمن و لەسەرخۆ بوو، والله ئەوەی لە ناخی مندا بوو ئەو کردی یەک کەلیمەی جێنەهێشت وە زیاد لەوەی منی ووت، پاشان بێدەنگ بوو...

(... فَقُلْتُ لِأَبِي بَكْرٍ: يَا أَبَا بَكْرٍ، انْطَلِقْ بِنَا إِلَى إِخْوَانِنَا هَؤُلَاءِ مِنَ الْأَنْصَارِ. فَانْطَلَقْنَا نُرِيدُهُمْ، فَلَمَّا دَنَوْنَا مِنْهُمْ لَقِيَنَا مِنْهُمْ رَجُلَانِ صَالِحَانِ، فَذَكَرَا مَا تَمَالَى عَلَيْهِ الْقَوْمُ، فَقَالَا: أَيْنَ تُرِيدُونَ يَا مَعْشَرَ الْمُهَاجِرِينَ؟ فَقُلْنَا: نُرِيدُ إِخْوَانَنَا هَؤُلَاءِ مِنَ الْأَنْصَارِ. فَقَالَا: لَا عَلَيْكُمْ أَنْ لَا تَقْرَبُوهُمْ، اقْضُوا أَمْرَكُمْ. فَقُلْتُ: وَاللَّهِ لَنَأْتِيَنَّهُمْ. فَانْطَلَقْنَا حَتَّى أَتَيْنَاهُمْ فِي سَقِيفَةِ بَنِي سَاعِدَةَ، فَإِذَا رَجُلٌ مُزَمَّلٌ بَيْنَ ظَهْرَانَيْهِمْ، فَقُلْتُ: مَنْ هَذَا؟ فَقَالُوا:

هَذَا سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ. فَقُلْتُ: مَا لَهُ؟ قَالُوا: يُوعَكُ. فَلَمَّا جَلَسْنَا قَلِيلاً، تَشَهَّدَ خَطِيبُهُمْ فَأَثْنَى عَلَى اللَّهِ بِمَا هُوَ أَهْلُهُ، ثُمَّ قَالَ: أَمَّا بَعْدُ، فَنَحْنُ أَنْصَارُ اللَّهِ وَكَتِيبَةُ الْإِسْلَامِ، وَأَنْتُمْ مَعْشَرَ الْمُهَاجِرِينَ رَهْطٌ، وَقَدْ دَفَّتْ دَافَّةٌ مِنْ قَوْمِكُمْ. فَإِذَا هُمْ يُرِيدُونَ أَنْ يَخْتَزِلُونَا مِنْ أَصْلِنَا، وَأَنْ يَحْضُنُونَا مِنَ الْأَمْرِ، فَلَمَّا سَكَتَ أَرَدْتُ أَنْ أَتَكَلَّمَ، وَكُنْتُ قَدْ زَوَّرْتُ مَقَالَةً أَعْجَبَتْنِي، أُرِيدُ أَنْ أُقَدِّمَهَا بَيْنَ يَدَيْ أَبِي بَكْرٍ، وَكُنْتُ أُدَارِي مِنْهُ بَعْضَ الْحَدِّ، فَلَمَّا أَرَدْتُ أَنْ أَتَكَلَّمَ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: عَلَى رِسْلِكَ. فَكَرِهْتُ أَنْ أُغْضِبَهُ، فَتَكَلَّمَ أَبُو بَكْرٍ، فَكَانَ هُوَ أَحْلَمَ مِنِّي وَأَوْقَرَ، وَاللَّهِ مَا تَرَكَ مِنْ كَلِمَةٍ أَعْجَبَتْنِي فِي تَزْوِيرِي إِلَّا قَالَ فِي بَدِيهَتِهِ مِثْلَهَا أَوْ أَفْضَلَ مِنْهَا، حَتَّى سَكَتَ)...

رواه البخاري | ٦٨٣٠ وأحمد | ٣٩١

ووتم: شاهێد لەو خەبەرەی سەرەوە ئەو بڕگەی کۆتاییەتی کە عمر رضي الله عنه دەڵێ: « وَكُنْتُ قَدْ زَوَّرْتُ مَقَالَةً أَعْجَبَتْنِي » واتە لە ناخی خۆمدا قسانێکم حازر کرد بوون بیانڵێم. ئەمە ڕەدە بۆ ئەشاعیرە کاتێک ووتەکان لە ناخی عمر بوون رضي الله عنه دەرینەبڕیون بە کەلام حسێب

نین هەتا نەوترێن، کاتێک أبو بکر رضي الله عنه دەیانکات ئەوکات دەبنە کەلام، وە بە کەلامی أبو بکر حسێب دەکرێن نەک عمر، ئیتر چۆن دەکرێ بە قورئان کە کەلامی الله ـیە ﷻ بوترێ کلام قائم بالنفس ئەگەر لە نەفسی الله دابێ ئەوە چۆن پێی دەوترێ کەلام؟! وە کێ ئەو توانایەی هەیە بزانێ چی لە نەفسی الله ـدایە ﷻ؟! وە ئەگەر کەسێک دەسەڵاتی هەیە دەتوانێ بزانێ چی لە نەفسی الله هەیە کەواتە ئەوەی قسە بەو کەلامەی نەفسی الله ﷻ دەکات دەبێتە کەلامی خۆی نەک بوترێ کەلامی الله! لە کاتێکدا پێغەمبەر عیسی ﷺ نەیزانیوە چی لە نەفسی الله ـدایە: ﴿ وَإِذْ قَالَ اللَّهُ يَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ أَأَنتَ قُلْتَ لِلنَّاسِ اتَّخِذُونِي وَأُمِّيَ إِلَٰهَيْنِ مِن دُونِ اللهِ قَالَ سُبْحَانَكَ مَا يَكُونُ لِي أَنْ أَقُولَ مَا لَيْسَ لِي بِحَقٍّ إِن كُنتُ قُلْتُهُ فَقَدْ عَلِمْتَهُ تَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِي وَلَا أَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِكَ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّامُ الْغُيُوبِ ﴾ المائدة : ١١٦

٢- حِكَايَة عن كَلام الله: بە مانای ئەوە دێ هێنانی شتێک هاوشێوەبێ لەگەڵ شتێکی تردا واتە نمونە هێنانەوە، دەبینی کە دەڵێن قورئان حکایەتێکە لە کەلامی الله ﷻ، ئەوەی لەو موصحەفەدایە هاوشێوەی

کەلامی الله ـیە واتە بە حەقیقی کەلامی الله نییە، بەڵکو نمونەیەکە وەک کەلامی الله!

الله ﷻ تەحەدای هەموو جن و ئینسانەکان دەکات گەر بتوانن وەک ئەو قورئانە بهێنن.

قَالَ اللهُ ﷻ: ﴿ قُل لَّئِنِ اجْتَمَعَتِ الْإِنسُ وَالْجِنُّ عَلَى أَن يَأْتُوا بِمِثْلِ هَذَا الْقُرْآنِ لَا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا ﴾ الإِسراء : ٨٨

هەروەها تەماشا بکەن ئەوە عیسی ﷺ ڕەسولی الله ـیە ﷻ نازانێ چی لە نەفسی الله ـدایە: ﴿ وَإِذْ قَالَ اللَّهُ يَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ أَأَنتَ قُلْتَ لِلنَّاسِ اتَّخِذُونِي وَأُمِّيَ إِلَهَيْنِ مِن دُونِ اللهِ قَالَ سُبْحَانَكَ مَا يَكُونُ لِي أَنْ أَقُولَ مَا لَيْسَ لِي بِحَقٍّ إِن كُنتُ قُلْتُهُ فَقَدْ عَلِمْتَهُ تَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِي وَلَا أَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِكَ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّامُ الْغُيُوبِ ﴾المائدة : ١١٦ ئیتر چۆن عەبدێکی جەهمی وەک ئەشاعیرە دەتوانن دەعوای ئەوە بکەن کە ئەو قورئانە کەلامێکی نەفسییە؟!

ئەشاعیرە دەڵێن قورئان عیبارەتە لە کەلامی الله، چونکە ئەوان پێیان وایە الله کەلامەی دروست کردووە، ئەمە هەمان عەقیدەی جەهمییەکانە هەتا الدارمي لە ڕەدی جەهمییەکاندا هەمان قسە دەهێنێ کە پێیان وایە الله کەلامی نەبووە هەتا ئەوکاتەی کەلامێکی بۆ خۆی دروست کردووە.

وأُخرى: أَنَّ كُل مخلوقٍ مُحْدَثٍ لا شَكَّ فيه، فاللهُ بِزَعمِكُم كان بِلَا كلام حتى خَلَقَ لِنَفسِهِ كَلامًا.

نقض عثمان بن سعيد على المريسي ا صـ : ٣٩٩

ئەشاعیرە هەرچەندە بڵێن قورئان کەلامی الله ـیە، بەڵام دەڵێن "کەلامی الله قەدیمە یەک جار قسەی کردووە! یاخود دەڵێن کەلامەکەی لە نەفسێکدا دروست کردووە! ئەوەی لە نێو خەڵکیدایە عیبارەت لە ووتەی الله دەکات، یاخود هاوشێوەی کەلامی الله ـیە. كلام النفسي، كلام الله قديم، عبارة عن القرآن، حكاية له"!

هەروەها پێیان وایە الله ﷻ قسە ناکات هیچ دەنگێکی نییە، یەک جار قسەی کردووە ئیتر دوای ئەوە قسەی نەکردووەتەوە و نایکات، وە ئەو قورئانە لە حەرف پێکنەهاتووە، بەڵکو پێکهاتووە لە مورەکەب و وەرقە،

لەگەڵ ئەو پێست و تەختانەی لەسەری نوسراوەتەوە! ئەوە عەقیدەی ئەشاعیرەیە دەربارەی قورئان کە بە حەقیقی بە کەلامی الله ﷻ نابینن.

**أبو إسماعيل الأنصاري الهروي** کاتێک بەراوردیان دەکات بە جەهمییەکان دەڵێ: ئەشاعیرە دەڵێن: کەلامی الله نەصەوتە نەحەرف، ئەوەی لە ناو موصحەفدایە مورەکەبی نوسین و کاغەزە، نوسراوێکە لەسەر پێست و تەختە نوسراوەتەوە، مەبەست لێی کەلامی الله نییە، بەڵکو نوسراوی شەخصەکانە، وە کاتێکیش دەخوێنرێتەوە ئەوە بە دەنگی کەسەکە حساب دەکرێ نەک قورئان بێ و کەلامی الله بێ.

وقالوا: وليس له صوت ولا حروف، هذا زاجُ وَورِق، وهذا صُوفُ وخشبُ، وهذا إنما قُصِد به النقش وأُرِيدَ به النقر! وهذا صوت القارئ!

ذم الكلام وأهله للهروي | **(٣٥٣/٥)**

**إبن قدامه** دەڵێ: لای ئەشاعیرە سورەت و ئایەتەکان بەشێک نین لە قورئان، بەڵکو حیکایەت و عیبارەت لە قورئان دەکەن، قورئان مەخلوقە، لەبەرئەوەی قورئان مانایەکە لە نەفسی الله ـدایە، وە هەمووی لە یەک شت پێکهاتووە، جوزء جوزء نییە و جیاکاری تێدا نییە لە هەندێک

سورەت پێکنەهاتووە، وە شتێک نییە دابەزیبێ، وە ناخوێنرێتەوە، وە نابیسترێ، وە نانوسرێ، ئەوەی لە موصحەفەکاندایە تەنها مورەکەب و وەرقەیە.

دوای ئەوە ئیختلافیان هەیە لە سورەتەکانی قورئان: هەندێکیان پێیان وایە ئەو قورئانە عیبارەتێکە لە کەلامی جبریل علیه السلام، ئەو دایڕشتووە بە هۆی ئیلهامێکەوە الله خستوویەتیە دڵیەوە.

وە هەندێکی تریان دەڵێن الله ﷻ قورئانی لە لوح المحفوظ دروست کردووە، لەوێشەوە جبریل هێناویەتی.

قال إِبن قدامة: وعندهم أَنَّ هذه السورَ والآيات ليس بقرآن، وإِنَّما هي عبارة عنه وحكاية، وأَنَّها مخلوق، وأَنَّ القرآن معنى في نفس الباري، وهو شيء واحد، لا يَتَجزَأَ، ولا يَتَبَعض، ولا يَتَعَدَد، ولا هو شيء ينزِل، ولا يُتلى، ولا يُسمَع، ولا يَكتَب، وأَنَّه ليس في المصاحف إِلى الوَرق والمِداد.

واختلفوا في هذه السور التي في القرآن: فزعم بعضهم أَنَّها عبارة جبريل عليه السلام، هو الذي أَلَّفَها بإِلهام الله تعالى له ذالک.

وزعم آخرون منهم أَنَّ الله تعالى خلقها في اللوح المحفوظ، وأَخذها جبريل منه.

المناظرة في القرآن لابن قدامة | صـ : ١٧

**إبن قدامه** دەڵێ: هیچ خیلافێک نییە لە نێوان موسڵماناندا کە دەڵێن: الله ﷻ دەفەرموێ، کاتێک دەیانەوێ ئایەتێکی قورئان بهێنن و بخوێننەوە، یاخود کەلیمەیەک لە قورئان ئیستتشهاد پێ بکەن، هەموویان دان بەوەدا دەنێن کە ئەوە قەولی اللە ـیە ﷻ، بەڵام بەلای ئەشعەرییەوە ئەوە قەولی الله نییە، بەڵکو قەولی جبریلە، بۆیە دەبوو بڵێن: جبریل علیه السلام فەرمووی، یاخود پێغەمبەر ﷺ فەرمووی هەرکات بیانەوێ ئایەتێک بهێنن.

قال إِبن قدامة: ولا خلاف بين المسلمين كلهم في أَنهم يقولون: قال الله كذا، إِذا أَرادوا أَن يخبروا عن آيةٍ، أَو يستشهدوا بكلمةٍ من القرآن، ويقرون كلهم بأَن هذا قول الله، وعند الأَشعري ليس هذا قول الله، وإِنما قول جبريل، فكان ينبغي لهم أَنهم يقولون: قال جبريل، أَو قال النبي ﷺ إِذا حكوا آية.

المناظرة في القرآن لابن قدامة | صـ : ٣٣

ئەشاعیرە دەڵێن: الله بە صەوت قسە ناکات، بەڵکو قسەکانی دروست دەکات، ئەمەش عەقیدەی جەهمییەکانە، تەنها دوو حدیث کافییە بۆ ڕەد دانەوەیان کە الله ﷻ قسە دەکات، وە لە ئاخیرەتیشدا لەگەڵ عەبدەکانی قسە دەکات ئەو خەڵکە هەمووی دەیبستن نزیک بن یاخود دوور.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: الله ﷻ حەشری خەڵکی دەکات بە صەوت بانگیان دەکات ئەوانەی لێوەی نزیکن و ئەوانەشی دوورن دەیبیستن دەفەرموێ: من پادشام من حسابی هەموو خەڵکی دەکەم پاداشت و سزایان دەدەمەوە، هیچ کەسێکی ئەهلی بەهەشت ناتوانێ بچێتە بەهەشت، ئەگەر بێت و زوڵمی لە کەسێک کردبێ تەنانەت ئەو کەسە ئەگەر ئەهلی ئاگریش بێ هەتا مافەکەی لێوەردەگیرێتەوە و حسابی لەگەڵ دەکرێ.

حَدَّثَنَا دَاوُد بْنُ شَبيب، قَالَ: حَدَّثَنَا هَمَّامُ، قَالَ: حَدَّثَنَا القَاسِمُ بْنُ عَبْدِالْوَاحِدِ، قَالَ: حَدَّثَنِي عَبْدُالله بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ عَقِيل، أَنَّ جَابِرَ بْنَ عَبْدِالله حَدَّثَهُمْ أَنَّهُ سَمِعَ عَبْدِالله بْنَ أُنَيْسٍ يَقُول: سَمِعْتُ النَّبِيَ ﷺ يَقُول: { يَحْشُرُ اللهُ الْعِبَادَ فَيُنَادِيهِمْ بِصَوْتٍ يَسْمَعُهُ مِنْ بَعْدُ كَمَا يَسْمَعُهُ مَنْ قَرُبَ: أَنَا

الْمَلِكُ أَنَا الدَّيَّان، لَا يَنْبَغِي لِأَحَدٍ مِن أَهْلِ الْجَنَّة أَنْ يَدْخُلَ الْجَنَّة، وَأَحَدُ مِنْ أَهْلِ النَّار يَطلُبُهُ بِمَظّلَمَة }.

رواه البخاري في خلق أفعال العباد | ٤٨٠ وابن أبي عاصم في كتاب السنة | ٥٢٦ مِن طريق شَيْبَانُ بْنُ فَرُّوخَ عَن هَمَّامُ...

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هیچ کەسێک نییە لە ئێوە ئیللا الله ﷻ لە ڕۆژی دواییدا قسەی لەگەڵ دەکات، وە هیچ تەرجومان و وەرگێڕێک نییە لە نێوانیاندا، پاشان تەماشا دەکات هیچ نابینێ جەهەنەم نەبێ، سەیری پێشەوەی خۆی دەکات ئاگر لە پێشوازیدایە، هەرکەسێک لە ئێوە دەتوانێ ئەوە با لە ئاگر خۆی بپارێزێ تەنانەت ئەگەر بە لەتێک خورماش بێ.

عَنْ عَدِيٍّ بْنِ حَاتِمٍ، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: { مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا وَسَيُكَلِّمُهُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَة، لَيْسَ بَيْنَ الله وَبَيْنَهُ تَرْجُمَانٌ، ثُمَّ يَنْظُرُ فَلَا يَرَى شَيْئًا قُدَّامَهُ، ثُمَّ يَنْظُرُ بَيْنَ يَدَيْهِ فَتَسْتَقْبِلُهُ النَّارُ، فَمَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمْ أَنْ يَتَّقِيَ النَّارَ وَلَوْ بِشِقِّ تَمْرَةٍ }.

رواه البخاري | ٦٥٣٩ ومسلم | ٢٣٤٨ وأحمد | ١٨٢٤٦

وەک دەبیین الله ﷻ قسە دەکات بە کەلامێکی حەقیقی غیر مخلوق، وە عەبدەکان بە بێ واسطە دەنگی دەبیستن کاتێک قسەیان لەگەڵ دەکات.

پێش حدیث چەندین ئایەت هەن کە بەڵگەن لەسەر ئەوەی الله ﷻ قسە دەکات، لێرەدا پێم خۆشە تەنها سێ ئایەت بهێنم، بەڵام لە بەشەکانی تردا دەیان ئایەت دەهێنم لەسەر ئەم مەسئەلەیە.

یەکەم: الله ﷻ بانگی پێغەمبەر موسی ﷺ کردووە کە بچێ بۆ دەعوە کردنی قەومە ظاڵمەکە واتە قەومە کافرەکەی فیرعەون. قَالَ اللهُ ﷻ: ﴿ وَإِذْ نَادَىٰ رَبُّكَ مُوسَىٰ أَنِ ائْتِ الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ ﴾ الشعراء : ١٠

دووەم: الله ﷻ فەرموویەتی: کاتێک موسی هاتە لای کێوەکە لە لای بەشی ڕاستی دۆڵەکەوە لە شوێنە پیرۆزەکە بانگم کرد ئەی موسی من الله ـــم پەروەردگاری جیهانیان. قَالَ اللهُ ﷻ: ﴿ فَلَمَّا أَتَاهَا نُودِيَ مِن شَاطِئِ الْوَادِ الْأَيْمَنِ فِي الْبُقْعَةِ الْمُبَارَكَةِ مِنَ الشَّجَرَةِ أَن يَا مُوسَىٰ إِنِّي أَنَا اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ ﴾ القصص : ٣٠

ووتم: ئەو ئایەتە چەندە وازحە کە الله ﷻ قسەی لەگەڵ پێغەمبەر موسى ﷺ کردووە پێی وتووە من الله ــم پەروەدگارم، ناکرێ دەنگێکی تری دروست کراو بووبێ وتبێتی من الله ــم هەروەک چۆن جەهمییە و ئەشاعیرە دەیڵێن، یاخود جبریل بووبێ وای وتبێ لە کاتێکدا هەموو مەلائیکە و ڕەسولێک مەعصوم ــن لە کوفری لەو جۆرە، دەمێنێتەوە زەندەقەتی جەهمییە و ئەشاعیرە کە کەلامی الله ﷻ ڕەتدەکەنەوە.

سێهەم: هەروەها لەم ئایەتەشدا بە ڕوونی دیارە کە الله ﷻ بانگی پێغەمبەر موسى ﷺ کردووە لە دۆڵە پیرۆزەکە. قَالَ اللهُ ﷻ: ﴿ إِذْ نَادَاهُ رَبُّهُ بِالْوَادِ الْمُقَدَّسِ طُوًى ﴾ النازعات : ١٦

تەماشاکەن لە هەرسێ ئایەتەکەدا بە وازحی دیارە کە الله ﷻ لەگەڵ پێغەمبەر موسى ﷺ قسەی کردووە رغم أُنوف الأَشاعرة.

ئەمانە هەمووی بەڵگەی دیار و ئاشکران لەسەر ئەوەی کە قورئان کەلامی الله ــیە ﷻ قسەی پێکردووە و دەیکات هەرکات ویستی لێبووبێ، کەچی ئەشاعیرە دەڵێن: قورئان ئەگەر کەلامی الله بێ، ئەوە کەلامەکەی قەدیمە هەر زوو یەکجار قسەی کردووە ئیتر قسە ناکاتەوە !

## عەقیدە و فیکرو بۆچوونیان

أبی إسماعیل عبدالله کوڕی محمد الأنصاري الهروی کە ساڵی **(٤٨١)** هیجری وەفاتی کردووە کاتێک دێتە سەر باسی ئەشاعیرە و عەقیدەیان دەڵێ: ئەوان دەڵێن: الله ﷻ لە شوێنێک نییە، نابێ وەصف بکرێ بەوەی بوترێ لە کوێیە، ئەو لە سەرەوەیە هەروەک چۆن لە خوارەوەشە! نازانرێ لە کوێیە! وە وەصف ناکرێ بە شوێن و مەکان نابێ بوترێ لەوێیە! لە ئاسمان نییە، بە هەمان شێوە لە زەویش نییە، ئینکار و نەفی جهە و حەد دەکەن!

یەک جار قسەی کردووە هەر ئەو جارە بووە زوو لە کۆندا، دوای ئەوە قسەی نەکردووەتەوە لەبەرئەوەی کەلامەکەی قەدیمە، وە کەلامەکەی لە شوێنێک نییە کە خۆی لەوێ نەبێ، پاشان دەڵێن الله لە شوێنێکی دیاریکراو نییە، کەلامەکەی نە صەوتە نە حەرف، ئەوە مورەکەبەی کە لەسەر وەرەقە یاخود لەسەر پێستە و تەختە نوسراوە مەبەست لێی قورئان نییە، بەڵکو نوسراوێکە نەخشێنراوە لەسەر کاغەز و پێست و تەختە، وە دەنگی قاریئەکەیە نەک کەلامی الله!

هاتن و چوون ووتیان: ئەم کەلامە حکایەتێکە بە قورئان دەربڕراوە، الله یەکجار قسەی کردووە دوای ئەوە قسەی نەکردووەتەوە، پاشان ووتیان: قورئان مەخلوق نییە، هەرکەس بڵێ مەخلوقە ئەوە کافرە! ئەمە لەو فێڵ و تەڵانەیانە دڵی عەوامی ئەهلی سوننەی پێڕاو دەکەن، چونکە ئەوان عەقیدەیان ئەوەیە: « قورئان مەوجوود نییە و بوونی نییە کە کەلامی الله بێ! » جەهمییە نێرەکان یەکجار ئەمەیان دەوت، بەڵام مێینەی جەهمییەکان کە ئەشاعیرەن دە جار ئەمەیان ووت.

هەروەها دەڵێن: صیفەتەکانی ڕوومەت و صورە وەک ڕووی ڕۆژ، ڕووی شتێک، ڕووی حدیث وایە! چاو وەک چاوی پێویستیەک، بیستن وەک گوێی دیوار، بینین وەک ئەوەی دەوترێ دوو دیوار یەک دەبینن و بەرامبەرن، وە دەست وەک بەخشین و منەت، وە پەنجەکان وەک ئەوەی دەوترێ خۆرسان لە ژێر دەسەڵاتی ئەمیرێکدایە، وە قاچ وەک ئەوەی دەوترێ دوژمنایەتی لەژێر پێمدایە، وە گرتنی دەست وەک ئەوەی دەوترێ فڵان لەژێر دەستمدایە و گیراوە، وە کورسی واتە عیلم، عەرش واتە موڵک و خاوەنداریێتی، وە پێکەنین واتە ڕازی بوون، وە وەستانی

سەر عەرش واتە دەست بەسەرداگرتنی عەرش، وە دابەزین واتە قبوڵ کردن، هەروەلەش بە هەمان شێوە.

قال الهروي: هؤُلاء يقولون: ليس هو في مكان، ولا يوصف بأَين، هو مِن فوق كما هو من تحت! لا يُدرَى أَين هو! ولا يوصف بمكان! وليس هو في السماء، وليس في الأَرض! وأَنكروا الجِهَة والحَد!

تَكَلَّمَ مَرَّة، فهو مُتَكَلِّم به مُنذ تِلكُم، لم ينقطع الكلام، ولا يوجد كلامه في موضع ليس هو به، ثم يقولون ليس هو في مكان، ليس له صوت ولا حروف، هذا زاجُ وَورِق، وهذا صُوفُ وخشبُ، وهذا إِنَّما قُصِد به النقش، وأُريدَ به النقر! وهذا صوت القارئ!

فراوغوا فقالوا: هذه حكاية عُبِرَ بها عن القرآن، والله يتكلم مرة ولا يتكلم بعد ذالک، ثم قالوا: غير مخلوق، ومن قال مخلوق كافر!

وهذا من فخوخهم يصطادون به قلوب عَوام أَهل السنة، وإِنَّما اعتقادهم: « القرآن غير موجود! » لفظته الجهمية الذكور بِمَرَّة والأَشعرية الإِناث بعشر مرات.

ويقولون: وَجهُ كما يقال: وجه النهار، ووجه الأَمر، ووجه الحديث! عَينُ كعين المتاع، وسَمعُ كأُذُن الجدار، وبصرُ كما يقال: جدارهما يتراءيان، ويَدُ كيد المنَّةِ والعطية، والأَصابع كقولهم خراسان بين أَصبعي الأَمير، والقدمان كقولهم جعلت الخصومة تحت قدمي، والقبضة كما يقال فلان في قبضتي، والكُرسي: العلم، العرش: الملك، والضحك: الرضى، والإِستواء: الإِستيلاء، والنزول: القبول، والهرولة: مثله!.

ذم الكلام وأهله للهروي ا **(٣٤٩/٥)**



## صیفاتی بەرزی الله ﷻ وە کافربوونی ئەشاعیرەی پێی

پێشتر دەربارەی کەلامی الله ﷻ کە ئەشاعیرە ڕەتیدەکەنەوە تەکفیری سەلەفمان هێنا لەسەر ئەوەی هەرکەس کەلامی الله ﷻ ڕەتکردبێتەوە تەکفیر کراوە، ئەو حوکمەش دەچەسپێتە سەر ئەشاعیرە، بە هەمان شێوە لە مەسئەلەی علوی الله ﷻ تەکفیری ئەشاعیرە وجوودی هەیە لای سەلەف.

**شاذان کوڕی یحیی** دەڵێ: پرسیارکرا لە یزید کوڕی هارون جەهمییە کێن؟ ووتی: هەرکەسێک ئایەتی ﴿ الرَّحْمَٰنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَىٰ ﴾ بەجۆرێک تەفسیری بکات پێچەوانەی ئەوەی لە دڵی عاممەی خەڵکیدا جێگیر بووە کە الله لەسەر عەرشە، ئەوە جەهمییە.

حدثني عباس العنبري، حدثنا شاذان بن يحيى، سمعت يزيد بن هارون، وقيل له مَن الجهمية؟ فقال: مَن زعم أَن: ﴿ الرَّحْمَٰنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَىٰ ﴾ على خلاف ما يَقِرُّ في قلوب العامة، فهو جهمي.

كتاب السنة لعبدالله بن أَحمد | ٥٧

دەی ئەشاعیرە دەڵێن إستوی بە مانای إستولی دێ! نازانین الله لە کوێیە نابێ مەکانی بۆ دیاری بکرێ و بوترێ لە ئاسمانە، لە کاتێکدا ڕەسول الله ﷺ ئیمانی جارییەیەکی بەوە تاقیکردووەتەوە الله لە کوێیە؟ کاتێک ووتی: لە ئاسمانە. بە خاوەنەکەی فەرموو: « ئازادی بکە، ئەو ئیماندارە ».

**معاوية کوڕی حکم** دەڵێ: جارێک لە پشت پێغەمبەرەوە ﷺ نوێژم دەکرد، پیاوێک لە ئامادەبووان پژمی، منیش ووتم: يرحمک الله، خەڵکەکە بە چاوەکانیان بە شێوەیەکی سەیر تەماشایان دەکردم. منیش ووتم: دایکم ڕۆڵە ڕۆم بۆ بکات! چیتانە بەو جۆرە لێم دەڕوانن؟ ئەوانیش بە دەست دەیانکێشا بە ڕانیاندا بۆ ئەوەی بێدەنگم بکەن، ئیتر منیش بێدەنگ بووم، کاتێک پێغەمبەر ﷺ نوێژەکەی تەواو کرد، بە باوک و دایکمەوە فیدای بم، نەلێم تووڕە بوو نەلێیدام، نەقسەشی پێ ووتم، هیچ مامۆستایەکەم نەدیوە هێندە جوان ئینسان تێبگەیێنێ، ووتی: « ئەم نوێژە قسەی خەڵکی تیادا جێ نابێتەوە و دروست نییە، بەڵکو شوێنی قورئان خوێندن و تەسبیحات و تەکبیراتە » ....... ووتم: من کچۆڵەیەکی خزمەتکارم هەبوو شوانی بۆ دەکردم لای کێوی ئوحد و جەوانیە، ڕۆژێک بێئاگا دەبێ گورگ دێ شاتێک دەبات، منیش کەسێکم لە نەوەی ئادەم

وەک خەڵکی تووڕە دەبم، بە هەردوو دەستم پیام کێشا، دواتر پەشیمان بوومەوە ئێستا هاتوومەتە خزمەتت ئایا ئازادی نەکەم؟ فەرمووی: « بیهێنە بۆ لام ». منیش چووم هێنام. پێی فەرموو: « الله لە کوێیە؟ ». ئەویش ووتی: « لە ئاسمانە ». فەرمووی: « من کێم؟ ». ووتی: تۆ ڕەسولی اللە ـی. فەرمووی: « ئازادی بکە، ئەو ئیماندارە ».

عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ الْحَكَمِ السُّلَمِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: بَيْنَا أَنَا أُصَلِّي مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ إِذْ عَطَسَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ، فَقُلْتُ: يَرْحَمُكَ اللَّهُ، فَرَمَانِي الْقَوْمُ بِأَبْصَارِهِمْ. فَقُلْتُ: وَا ثُكْلَ أُمِّيَاهْ! مَا شَأْنُكُمْ تَنْظُرُونَ إِلَيَّ؟ فَجَعَلُوا يَضْرِبُونَ بِأَيْدِيهِمْ عَلَى أَفْخَاذِهِمْ، فَلَمَّا رَأَيْتُهُمْ يُصَمِّتُونَنِي، لَكِنِّي سَكَتُّ، فَلَمَّا صَلَّى رَسُولُ اللهِ ﷺ، فَبِأَبِي هُوَ وَأُمِّي، مَا رَأَيْتُ مُعَلِّمًا قَبْلَهُ وَلَا بَعْدَهُ أَحْسَنَ تَعْلِيمًا مِنْهُ، فَوَاللهِ مَا كَهَرَنِي وَلَا ضَرَبَنِي وَلَا شَتَمَنِي. قَالَ: « إِنَّ هَذِهِ الصَّلَاةَ لَا يَصْلُحُ فِيهَا شَيْءٌ مِنْ كَلَامِ النَّاسِ، إِنَّمَا هُوَ التَّسْبِيحُ وَالتَّكْبِيرُ وَقِرَاءَةُ الْقُرْآنِ ». أَوْ كَمَا قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ. قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي حَدِيثُ عَهْدٍ بِجَاهِلِيَّةٍ، وَقَدْ جَاءَ اللَّهُ بِالْإِسْلَامِ، وَإِنَّ مِنَّا رِجَالًا يَأْتُونَ الْكُهَّانَ. قَالَ: « فَلَا تَأْتِهِمْ ». قَالَ: وَمِنَّا رِجَالٌ يَتَطَيَّرُونَ. قَالَ: « ذَاكَ شَيْءٌ يَجِدُونَهُ فِي صُدُورِهِمْ، فَلَا يَصُدَّنَّهُمْ ».

قُلْتُ: وَمِنَّا رِجَالٌ يَخُطُّونَ. قَالَ : « كَانَ نَبِيٌّ مِنَ الْأَنْبِيَاءِ يَخُطُّ، فَمَنْ وَافَقَ خَطَّهُ فَذَاكَ ». قَالَ: وَكَانَتْ لِي جَارِيَةٌ تَرْعَى غَنَمًا لِي قِبَلَ أُحُدٍ وَالْجَوَّانِيَّةِ، فَاطَّلَعْتُ ذَاتَ يَوْمٍ، فَإِذَا الذِّئْبُ قَدْ ذَهَبَ بِشَاةٍ مِنْ غَنَمِهَا، وَأَنَا رَجُلٌ مِنْ بَنِي آدَمَ آسَفُ كَمَا يَأْسَفُونَ، لَكِنِّي صَكَكْتُهَا صَكَّةً، فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ، فَعَظَّمَ ذَلِكَ عَلَيَّ .

قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَفَلَا أُعْتِقُهَا؟ قَالَ: « ائْتِنِي بِهَا ». فَأَتَيْتُهُ بِهَا. فَقَالَ لَهَا: « أَيْنَ اللَّهُ؟ ». قَالَتْ: فِي السَّمَاءِ. قَالَ: « مَنْ أَنَا؟ ». قَالَتْ: أَنْتَ رَسُولُ اللهِ. قَالَ: « أَعْتِقْهَا ، فَإِنَّهَا مُؤْمِنَةٌ ».

رواه مسلم | ١١٩٩ وأَبو داود | ٣٢٨٢ والنسائي | ٣٦٥٣ وأَحمد | ٢٣٧٦٢ ومالك | ١٥٤٣ والشافعي في الأُم | ٢٦١٧ وأَبو داود الطيالسي في المسند | ١٢٠١ وابن أَبي شيبة في المصنف | ٣٠٩٦١ والدارمي في الرد على الجهمية | ١٩ وابن أَبي عاصم في كتاب السنة | ٤٩٩ وابن مندة في كتاب التوحيد | ٩٤٢ واللالكائي في شرح أُصول اعتقاد أَهل السنة | ٦٥٢

وەک دەبینن بە پێی حدیث هەرکەسێک باوەڕی نەبێ بەوەی الله لە ئاسمانە لەسەر عەرش ئەوە کافرە و ئیمانی نییە، هەتا **عثمان کوڕی سعید الدارمی** دوای ڕیوایەت کردنی ئەم حدیثە دەڵێ: ئەم حدیثەی ڕەسول الله ﷺ دەلیلە لەسەر ئەوەی ئەگەر هاتوو ئینسان نەزانێ الله ﷻ لە ئاسمانە، ئەوە ئیمانی نییە، ئەگەر ئەو کەسە عەبدێک بێ قەرار بێ وەک فیدیە بدرێ، بۆ ئەوە ناشێ، چونکە ئیماندار نییە مادام نازانێ الله لە ئاسمانە، مەگەر نابینی ڕەسول ﷺ نیشانەی ئیمانی ئەو جارییەی بەستەوە بەوەی بزانێ الله لە ئاسمانە.

قال الدارمي: ففي حديث رسول الله ﷺ هذا دليل على أَن الرجل إِذا لم يعلم أَنَّ الله ﷻ في السماء دون الأَرض، فليس بمؤمن، ولو كان عبدًا فَأُعتِق، لم يَجُز في رقبةٍ، إِذ لا يعلم أَنَّ الله في السماء، أَلا ترى أَنَّ رسول الله ﷺ جعل أَمَارَةَ إِيمانهَا معرفتُها أَنَّ الله في السماء.

الرد على الجهمية للدارمي ا صـ : ٥٢

صیفاتی بەرزێتی الله ﷻ لەسەر عەرش یەکێکە لەو صیفاتانەی کە ئینسان بە فیطرەت دەیزانێ تەنانەت منداڵ پێش ئەوەی بگاتە حەدی بلوغ دەزانێ الله ﷻ لە ئاسمانە، هەتا کافرانیش دان بەوەدا دەنێن الله

ﷻ له ئاسمانه سەیری جوولەکە و نصارا بکەن صیفاتی علوی الله ﷻ سابت دەکەن و دەڵێن لە ئاسمانە، کەچی ئەشاعیرە مێینەی جەهمییەکان کافرن بەو الله ـیەی کە لە ئاسمانە دەڵێن: "نازانین لە کوێیە، نابێ شوێنی بۆ دیاری بکرێ و بوترێ لە ئاسمانە"!

ئینسان ئەگەر باوەڕی نەبێ بە یەک ئایەتی قورئان ئەوە کافر دەبێ و کافرە بە هەموو قورئان، دەی دەبێ ڕات چیبێ دەربارەی ئەشاعیرە کە هەرچی ئایەتی صیفات هەیە ڕەتیدەکەنەوە!

**عبدالله کوڕی مسعود** دەڵێ: هەرکەسێک کافر بێ و باوەڕی نەبێ بە حەرفێک لە قورئان، ئەوە کافرە بە هەموو قورئان.

قال عبدالله بن مسعود رَضيَ اللهُ عنه: مَن كَفَرَ بحرف منه فقد كَفَرَ به أَجمع.

شرح أُصول اعتقاد أَهل السنة للالكائي ا ٣٧٩

کەسێک باوەڕی بە یەک حەرفی قورئان نەبێ پێی کافر دەبێ، دەی ئەشاعیرە باوەڕیان نییە بە صیفاتی إستوای الله ﷻ لەسەر عەرش لە کاتێکدا **(٧)** ئایەتی لەسەر هاتووە کە الله ﷻ لە ئاسمانە لەسەر عەرش.

١- ﴿ إِنَّ رَبَّكُمُ اللَّهُ الَّذِى خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ ﴾ الأَعراف : ٥٤

٢- ﴿ إِنَّ رَبَّكُمُ اللَّهُ الَّذِى خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ ﴾ يونس : ٣

٣- ﴿ اللَّهُ الَّذِى رَفَعَ السَّمَاوَاتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ ﴾ الرعد : ٢

٤- ﴿ الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى ﴾ طه : ٥

٥- ﴿ الَّذِى خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ ﴾ الفرقان : ٢

٦- ﴿ اللَّهُ الَّذِى خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ ﴾ السجدة : ٤

٧- ﴿ هُوَ الَّذِى خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ ﴾ الحديد : ٤

وەرە هێندە کافر بی باوەڕت وابێ الله ﷻ لە ئاسمان نییە و لەسەر عەرش نییە! وە نابێ و ناکرێ مەکان بۆ الله ﷻ دیاری بکرێ و بوترێ لە ئاسمانە لەسەر عەرش، لە کاتێکدا الله ﷻ وەصفی بەرزێتی خۆی کردووە بەوەی لە ئاسمانە لەسەر عەرش، چ بەڵگەیەک هەیە لەوە بەهێزتر کە الله ﷻ وەصفی زاتی خۆی بکات، کەچی ئەو ئەشعەرییە زەندیقانە ڕەتیدەکەنەوە و کوفر و قسەی خۆیان پێش دەخەن بەسەر ووتەی الله ﷻ !

**الدارمی** دەڵێ: قەولی موسڵمانان و کافران موتەفیقە لەسەر ئەوەی الله ﷻ لە ئاسمانە، وە حەدیشی بۆ جێگیر دەکەن، ئیللا مریسي گومڕاو هاوڕێکانی نەبێ، تەنانەت منداڵانیش کە هێشتا باڵغ نەبوون الله ﷻ بەو جۆرە دەناسن کە لە ئاسمانە.

قال الدارمي: إِتفقت الكلمة المسلمين والكافرين أَنَّ الله في السماء، وحَدُّوه بذالک، إِلا المريسي الضَّال وأَصحابه، حتى الصبيان الذين لم يبلغوا الحنث قد عرفوه بذالک.

نقض عثمان بن سعيد على المريسي ا صـ: ١٥٦

**علي كوڕی حسن** دەڵێ: پرسیارم كرد لە عبدالله كوڕی مبارك: چۆن چۆنی ڕەب عزَّ وَجَل بناسین؟ ووتی: بەو جۆرە بیناسن كە لەسەر ئاسمانی حەوتەمە لەسەر عەرش، وەک جەهمییەكان ناڵێین: لێرەیە لەسەر زەوی.

قال علي بن الحسن بن شقيق: سأَلت عبدالله بن مبارك: كيف ينبغي لنا أَن نعرف ربنا عزَّ وَجَلَّ؟ قال: على السماء السابعة على عرشه، ولا نقول كما تقول الجهمية: إِنه هاهُنا في الأَرض.

كتاب السنة لعبدالله بن أَحمد ا ٢٢ الرد على الجهمية للدارمي ا ٢١ نقض عثمان بن سعيد على المريسي ا ٣١ خلق أَفعال العباد للبخاري ا ١١ الإبانة الكبرى لابن بطة ا ٢٦٩٤

تەنانەت ئەم قەولەی إبن مبارک لەم ڕیوایەتەی سەرەوەی الدارمي لە نقض على بشر المريسي ئیثباتی لفظی حەدی تێدایە بەم جۆرە هاتووە:

"سُئِلَ عبدالله بن المبارک: بِمَ نعرفُ ربَّنا؟ قال: بأَنه على العرش، بائن من خلقه، قيل: بِحَدٍّ؟ قالَ :بِحَدٍّ."

بێجگە لەویش هەریەک لە **حرب الكرماني** و **أبو بكر الخلال** و **إبن بطة العكبري** هەمان ڕیوایەتیان هێناوە وەک ئەوەی الدارمي ئیثباتي کەلیمەی حەدی تێدایە دەڵێن: على العرش بِحَدٍّ.

قال حرب الكرماني: حدثنا أَبو بكر محمد بن يزيد، قال: أَخبرنا علي بن الحسن، قال: قلت لابن المبارك يا أَبا عبدالرحمن، كيف نعرفُ ربنا؟ قال: هو على العرش فوق سبع سماوات، وعلمه وأَمره في كل موضع. قال: قلت: بِحَدٍّ؟ قال: بِحَدٍّ، ولا نقول كما تقول الجهمية: هاهُنا، وهاهُنا في الأَرض.

كتاب السنة لحرب الكرماني | ٣٣٨

قال محمد بن إِبراهيم القيسي: قلت لأَحمد بن حنبل: يُحكى عن ابن المبارك قيل له: كيف نعرف ربنا تعالى؟ فقال: في السماء السابعة على عرشه بِحَدٍّ. فقال أَحمد: هكذا هو عندنا.

كتاب السنة للخلال | ٢٣٣٧ الإبانة الكبرى لابن بطة | ٢٦٩٥

قال الخلال: حدثنا أَبو بكر المروذي، قال: سمعت أَبا عبدالله، وقيل له: روى علي بن الحسن الشقيق، عن ابن المبارك أَنه قيل له: كيف نعرف

الله؟ قال: على العرش بِحَدٍّ. فقال: بلغني ذالک عنه وأَعجبه. ثم قال أَبو عبدالله: ﴿هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن يَأْتِيَهُمُ اللَّهُ فِي ظُلَلٍ مِّنَ الْغَمَامِ وَالْمَلَائِكَةُ﴾ البقرة : ٢١٠ ثم قال: ﴿وَجَاءَ رَبُّكَ وَالْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا﴾ الفجر : ٢٢

كتاب السنة للخلال | ٢٣٣٦ الإبانة الكبرى لابن بطة | ٢٦٩٦

زیاد لەوەش **حرب الكرماني** ئیجماعی عولەمایانی هێناوە هەر لە سەردەمی صەحابەی پێغەمبەرەوە ﷺ هەتا سەردەمی حرب خۆی کە ساڵی **(٢٨٠)** هیجری وەفاتی کردووە، وە چاوی کەوتووە بە عولەمایانی عێراق و حجاز و شام و یەمەن و غیری ئەو شارانەش، هەرکەس لێی لابدات یاخود تانەی لێبدات، ئەوە بیدعەچییە و لە ئیجماع لایداوە، موخالەفەی مەنهەجی ئەهلی سوننە و ڕێگای حەقی کردووە، ئەوە عەقیدە و مەزهەبی أحمد کوڕی حنبل و إسحاق کوڕی راهوية و عبدالله کوڕی زبیر الحُمیدي و سعید کوڕی منصور و غیری ئەوانیشە کە وتوویانە: الله ﷻ جیایە لە مەخلوقات، هیچ جێیەک نییە ئیللا الله ﷻ عیلمی پێی هەیە، الله عەرشی هەیە، وەعەرش مەلائیکەی هەڵگری هەن، وە حەدیشی هەیە، الله بەس خۆی دەزانێ بە حەدەکەی.

قال حرب الكرماني: هذا مذهب أَئمة العلم، وأَصحاب الأَثر، وأَهل السنة المعروفين بها، المقتدى بهم فيها مِن لدن أَصحاب النبي ﷺ إِلى يومنا هذا. وأَدركت مَن أَدركت من علماء العراق، والحجاز، والشام وغيرهم، فمن خالف مِن هذه المذاهب أَو طعن فيها، أَو عاب قائلها، فهو مخالف مبتدع، خارج من الجماعة، زائل عن منهج السنة، وسبيل الحق.

وهو مذهب أَحمد بن حنبل، وإِسحاق بن إِبراهيم بن مخلد، وعبدالله بن زبير الحُميدي، وسعيد بن منصور، وغيرهم مِمن جالسنا، وأَخذنا عنهم العلم، فكان قولهم: وهو سبحانه بائن مِن خلقه، لا يخلو مِن علمه مكان، ولله عرش، وللعرش حملة، ولَهُ حَدٌّ، الله أَعلم بِحَدِّهِ.

كتاب السنة لحرب الكرماني | ٥٥-٥٦

**حرب الكرمانی** دەڵێ: پرسیارم کرد لە إسحاق کوڕی راهوية دەربارەی قەولی الله تبارك وتعالی: ﴿ مَا يَكُونُ مِن نَّجْوَىٰ ثَلَاثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ وَلَا خَمْسَةٍ إِلَّا هُوَ سَادِسُهُمْ ﴾. ووتم چی دەڵێی دەربارەی؟ ووتی: لە هەر کوێ بی الله ﷻ لە شادەماری بنا گوێ نزیکترە لێتەوە، بەڵام جیایە لە مەخلوقاتی، ووتم: لەسەر عەرشە بە حەد؟ ووتی: بەڵێ بە حەد، ئەنجا

قەولی عبدالله بن مبارک هێنا، ووتی: ئەو لەسەر عەرشە جیایە لە مەخلوقات بە حەد.

قال حرب الكرماني: سأَلت إِسحاق بن إِبراهيم، قلت: قول الله تبارك وتعالى: ﴿ مَا يَكُونُ مِن نَّجْوَى ثَلَاثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ وَلَا خَمْسَةٍ إِلَّا هُوَ سَادِسُهُمْ ﴾ المجادلة : ٧ كيف تقول فيه؟ قال: حيث كُنتَ هو أَقربُ إِليك مِن حبلِ الوريد، وهو بائنٌ مِن خلقهِ. قلت لإِسحاق: على العرشِ بِحَدٍّ؟ قال: نعم بِحَدٍّ. وذكَرَ عن ابن المبارك، قال: هو على عرشه بائنٌ من خلقه بِحَدٍّ.

كتاب السنة لحرب الكرماني | ٣٣٦ كتاب السنة للخلال | ٢٣٣٩ الإبانة الكبرى لابن بطة | ٢٧٠٠

**الدارمی** تەکفیری ئەوانە دەکات پێیان وایە الله ﷻ حەدی نییە، دەڵێ: هەرکەسێک پێی وابێ الله ﷻ حەدی نییە، ئەوە قورئانی ڕەد کردووەتەوە، وە پێی وایە الله ﷻ هیچ نییە، چونکە الله ﷻ وەصفی خۆی کردووە بەوەی حەدی هەیە لە چەندین شوێن لە کتێبەکەیدا: ﴿الرَّحْمَٰنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَىٰ﴾ .﴿ءَأَمِنتُم مَّن فِي السَّمَاءِ﴾. ﴿يَخَافُونَ

رَبَّهُم مِّن فَوْقِهِمْ ﴾. ﴿ إِنِّي مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَيَّ ﴾. ﴿ إِلَيْهِ يَصْعَدُ الْكَلِمُ الطَّيِّبُ وَالْعَمَلُ الصَّالِحُ يَرْفَعُهُ ﴾. ئەم ئایەتانە و هاوشێوەی ئەوانەش بەڵگەن لەسەر حەد، هەرکەسێک ئیعترافی پێنەکات، ئەوە کافر بووە بەو قورئانەی کە الله ﷻ دایبەزاندووە، وە ئایەتەکانی ڕەتکردووەتەوە.

قال الدارمي: فمن ادعى أَنه ليس لله حَدٌّ، فقد رَدَّ القرآن، وادعى أَنه لا شيء، لِأَن الله وصف حَدَّ مكانه في مواضع كثيرة في كتابه: ﴿ الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى ﴾. ﴿ ءَأَمِنتُم مَّن فِي السَّمَاءِ ﴾. ﴿ يَخَافُونَ رَبَّهُم مِّن فَوْقِهِمْ ﴾. ﴿ إِنِّي مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَيَّ ﴾. ﴿ إِلَيْهِ يَصْعَدُ الْكَلِمُ الطَّيِّبُ وَالْعَمَلُ الصَّالِحُ يَرْفَعُهُ ﴾. فهذا كُله وما أَشبَهَهُ شواهد ودلائل على الْحَدِّ، ومَن لم يعترف به، فقد كَفَرَ بتنزيل الله، وجَحَدَ آيات الله.

نقض عثمان بن سعيد على المريسي ١ صـ: ١٥٣

ئەی موسڵمان ئەی ئینسان ئەگەر دەتەوێ دینت سەلامەتبێ لە بابەتی صیفاتدا بە دیاریکراوی ئەم باسەی ئێستامان صیفاتی الإستواء، ئەوە بەو جۆرەبە کە سەلەف لەسەری بوون باوەڕت بەو ئایەتانە هەبێ عەقیدەت

وابێ کە اللە ﷻ لە ئاسمانە لەسەر عەرش، بەڵام بە دوای چۆنیەتییەکەی مەچن و مەگەڕێن.

پیاوێک هات بۆ لای **مالک کوڕی أنس** لێی پرسی: ئەی باوکی عبدالله ئایەتی: ﴿ الرَّحْمَٰنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَىٰ ﴾. إستواء چۆنە؟ مالک پێی ناخۆش بوو تووڕە بوو بە جۆرێک هیچ شتێک نەبووە هێندەی ئەو پرسیارە ناڕەحەت و تووڕەی بکات هەتا ئارەقی کرد و ماوەیەک بێدەنگ بوو، پاشان کە هاتەوە سەر خۆی ووتی: چۆنیەتییەکەی مەعقول نییە و نەزانراوە، وە إستواء زانراوە و شاراوە نییە، باوەڕبوون پێی واجبە، پرسیارکردن دەربارەی بیدعەیە، وە من ترسم هەیە تۆ کەسێکی گومڕابی، پاشان ئەمری کرد لە مزگەوت کردیانە دەرەوە.

حدثنا مهدي بن جعفر الرملي، حدثنا جعفر بن عبدالله، وكان من أهل الحديث ثِقَةٌ، عن رجل قد سَمَّاه لي، قال: جاء رجل إِلى مالک بن أَنس فقال: يا أَبا عبدالله، الرحمن على العرش استوى، كيف استوى؟ قال: فما رأَينا مالكًا وَجَدَ من شيء كَوجْدِهِ مِن مقالته، وعلاه الرَّخصاءُ وأَطرَقَ، وجعلنا ننتظر ما يأمر به فيه، قال: ثم سُرِّي عن مالک، فقال : الكَيف غير

معقول، والإِستواء منه غير مجهول، والإِيمان به واجب، والسؤال عنه بدعة، وإِني لَأَخاف أَن تكون ضالًا. ثم أَمَرَ به فأُخرِج.

الرد على الجهمية للدارمي | ٤٨

ئەگەر هاتوو كەسێك ووتی ئەو سەنەدەی الدارمی هێناویەتی حوجە نییە، لەبەرئەوەی ئەو پیاوەی ئەم ڕووداوەی لە مالک كوڕی أنس گێڕاوەتەوە كە مەجهولە و نازانرێ كێیە. لە وەڵامدا دەڵێم: كێشە نییە، چونكە ئەو قەولە لە ئیمامی مالک سابت بووە بە سەنەدی متصل، تەنانەت بێجگە لە مالک لە ربیعەی كوڕی أبی عبدالرحمن ـیشەوە سابت بووە، هەموو كتێبەكانی سەلەف تەماشا بكەی لە بواری عەقیدەدا كاتێک دێنە سەر بابی إستوای الله ﷻ لەسەر عەرش ئەو قەولە دەهێنن.

أَخبرنا أَبو بكر أَحمد بن محمد بن الحارث الفقيه الأَصفهاني، أَخبرنا أَبو محمد عبدالله ابن محمد بن جعفر بن حيان المعروف بأَبي الشيخ، حدثنا أَبو جعفر أَحمد بن زَيزَك اليَزدي، قال: سمعت محمد بن عمرو بن نضر النيسابوري يقول: سمعت يحيى بن يحيى يقول: كنت عند مالك بن أَنس فجاءه رجل فقال: يا أَبا عبدالله، ﴿ الرَّحْمَٰنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَىٰ﴾ فكيف استوى؟ قال: فأَطرَقَ مالك برأْسه حتى عَلاه الرخصاء

ثم قال: الإِستواء غير مجهول، والكيف غير معقول، والإِيمان به واجب، والسؤال عنه بدعة، ما أَراك إِلا مبتدعًا. ثم أَمَرَ به أَن يُخرِج.

الأَسماء والصفات للبيهقي ا ٩٦٢

أَخبرنا عبدالله بن أَحمد بن القاسم بن شنبك النهاوندي، قال: حدثنا أَبو بكر أَحمد بن محمود بن يحيى بن داود النهاوندي -بنهاوند سنة ثنتي عشرة وثلاث مائة- قال: حدثنا أَحمد بن محمد بن صدقة، قال: حدثنا أَحمد بن محمد، عن يحيى بن سعيد القطان، عن يحيى بن آدم، عن ابن عيينة قال: سُئِلَ ربيعة الرأي عن قوله: ﴿الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى﴾ كيف استوى؟ قال: الإِستواء غير مجهول، والكيف غير معقول، ومِنَ الله الرسالة، وعلى الرسول البلاغ، وعلينا التصديق.

شرح أُصول اعتقاد أَهل السنة للالكائي ا ٦٦٥

که وتوویانه: "الكيف غير معقول" واته نازانین چۆنیەتییەکەی چۆنە، چونکە هیچ بەڵگەیەک لە قورئان و حدیث نەهاتووە قسە لەسەر چۆنیەتییەکەی بکات. کە دەشڵێن: "الإِستواء غير مجهول" واتە وەستان

شاراوە و نەزانراو نییە، چونکە لە قورئان و حدیث هاتووە کە الله ﷻ لە ئاسمانە لەسەر عەرش.

بەڵگەیەکی تری وازح لەسەر ئەوەی الله ﷻ لە ئاسمانە حدیثی میعراجە بۆ ئاسمان و فەرزبوونی نوێژە. پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «بوراقیان بۆ هێنام، ئاژەڵێکی درێژی سپییە لە کەر گەورەترە لە هێستر بچوکترە، هەر هەنگاوێکی هێندەی ئەو مەسافەیە کە چاوی دەیبینێ، سواری بووم هەتا چوومە قودس، پەتەکەیم بەستەوە بەو ئەڵقەیەوە کە پێغەمبەران پێیانەوە بەستبوویەوە، پاشان چوومە ناو مزگەوتەکە دوو ڕکات نوێژم تیایدا کرد ئەنجا هاتمە دەرەوە، جبریل علیه السلام قاپێک ئارەق و قاپێک شیری بۆ هێنام، شیرەکەم هەڵبژارد، جبریل ووتی: فیطرەتت هەڵبژارد، پاشان بەرزکرامەوە بۆ ئاسمانی یەکەم جبریل داوای کردنەوەی دەرگاکەی کرد، پێی وترا: کێی؟ ووتی: جبریل. پێی وترا: کەست لەگەڵە؟ ووتی: بەڵێ، محمد ـم لەگەڵە. ووتی: ناردوویانە بە دوایدا؟ ووتی: بەڵێ، دەرگاکەی بۆ کردینەوە، ئادەم ـم بینی ﷺ بەخێرهاتنی لێکردم و دوعای خێری بۆ کردم. پاشان بەرزکرامەوە بۆ ئاسمانی دووەم، جبریل داوای کردنەوەی دەرگاکەی کرد، پێی وترا: کێی؟

ووتی: جبریل. پێی وترا: کەست لەگەڵە؟ ووتی: بەڵێ، محمد ـ‍م لەگەڵە. ووتی: ناردوویانە بە دوایدا؟ ووتی: بەڵێ، دەرگاکەی بۆ کردینەوە، لەوێ دوو کوڕە خاڵەکەم بینی عیسی کوڕی مریم و یحیی کوڕی زکریا علیهما السلام، بەخێرهاتنیان لێکردم و دوعای خێریان بۆ کردم، پاشان بەرزکرامەوە بۆ ئاسمانی سێهەم، جبریل داوای کردنەوەی دەرگاکەی کرد، پێی وترا: کێی؟ ووتی: جبریل. پێی وترا: کەست لەگەڵە؟ ووتی: بەڵێ، محمد ـ‍م لەگەڵە. ووتی: ناردوویانە بە دوایدا؟ ووتی: بەڵێ، دەرگاکەی بۆ کردینەوە، لەوێ یوسف ـ‍م بینی ﷺ نیوەی جوانی پێداربوو، بەخێرهاتنی لێکردم و دوعای خێری بۆ کردم. پاشان بەرزکرامەوە بۆ ئاسمانی چوارەم، جبریل داوای کردنەوەی دەرگاکەی کرد، پێی وترا: کێی؟ ووتی: جبریل. پێی وترا: کەست لەگەڵە؟ ووتی: بەڵێ، محمد ـ‍م لەگەڵە. ووتی: ناردوویانە بە دوایدا؟ ووتی: بەڵێ، دەرگاکەی بۆ کردینەوە، لەوێ إدریس ـ‍م بینی ﷺ، بەخێرهاتنی لێکردم و دوعای خێری بۆ کردم. قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿ وَرَفَعْنَاهُ مَكَانًا عَلِيًّا ﴾. پاشان بەرزکرامەوە بۆ ئاسمانی پێنجەم، جبریل داوای کردنەوەی دەرگاکەی کرد، پێی وترا: کێی؟ ووتی: جبریل. پێی وترا: کەست لەگەڵە؟

ووتی: بەڵێ، محمد ـم لەگەڵە. ووتی: ناردوویانە بە دوایدا؟ ووتی: بەڵێ، دەرگاکەی بۆ کردینەوە، لەوێ هارون ـم بینی ﷺ، بەخێرهاتنی لێکردم و دوعای خێری بۆ کردم. پاشان بەرزکرامەوە بۆ ئاسمانی شەشەم جبریل داوای کردنەوەی دەرگاکەی کرد، پێی وترا: کێی؟ ووتی: جبریل. پێی وترا: کەست لەگەڵە؟ ووتی: بەڵێ، محمد ـم لەگەڵە. ووتی: ناردوویانە بە دوایدا؟ ووتی: بەڵێ، دەرگاکەی بۆ کردینەوە، لەوێ موسی پێغەمبەر ـم بینی ﷺ بەخێرهاتنی لێکردم و دوعای خێری بۆ کردم. پاشان بەرزکرامەوە بۆ ئاسمانی حەوتەم، جبریل داوای کردنەوەی دەرگاکەی کرد، پێی وترا: کێی؟ ووتی: جبریل. پێی وترا: کەست لەگەڵە؟ ووتی: بەڵێ، محمد ـم لەگەڵە. ووتی: ناردوویانە بە دوایدا؟ ووتی: بەڵێ، دەرگاکەی بۆ کردینەوە، لەوێ إبراهیم ـم بینی ﷺ، پاڵیدابوو بە بیت المعمورەوە، کە ڕۆژانە حەفتا هەزار مەلائیکە دەچنە ناوی دواتر قەت سەرەیان نایەتەوە هەتا دووبارە سەردانی بکەنەوە، پاشان برامە سدرة المنتهی، گەڵاکانی گەورە بوون وەک گوێی فیل، بەروبومەکەی وەک قلال بوو "سەتڵی ئاو هەڵگۆزین" کاتێک دەسەڵات و نیعمەتی الله ڕژاوە بە سەریدا بەو جۆرە گۆڕاوە، هیچ کەسێک ناتوانێ وەصفی جوانییەکەی بکات، لەوێ الله جَلَّ جَلَالُهُ پەنجا نوێژی لەسەر فەرز کردم لە ڕۆژ و شەوێکدا،

کاتێک دابەزیمەوە موسی ﷺ ووتی: پەروەردگارت چی فەڕز کرد لەسەر ئوممەتەکەت؟ ووتم: پەنجا نوێژ. ووتی: بگەڕێرەوە بۆ لای پەروەدگارت داوای لێبکە بۆتی کەم بکاتەوە، چونکە ئوممەتەکەت ناتوانن و بەرگەی ناگرن، من موبتەلا بووم بە بەنی إسرائیل تاقیم کردنەوە بێ توانا بوون. گەڕامەوە بۆ لای پەروەردگار، ووتم: یا ڕەب کەمی بکەرەوە لەسەر ئوممەتەکەم. ئیتر پێنج نوێژی لەسەر کەم کردمەوە، گەڕامەوە بۆ لای موسی ﷺ ووتم: پێنج نوێژی لەسەر لا بردم، ووتی: ئوممەتەکەت ناتوانن و بەرگەی ناگرن، بگەڕێرەوە لای پەروەدگارت داوای لێبکە کەمی بکاتەوە. بەردەوام دەگەڕامەوە لای پەروەردگار بۆ کەم کردنەوەیان و دەهاتمەوە لای موسی هەتا الله تعالی کەمی کردنەوە، فەرمووی: ئەی محمد: ئەوە پێنج نوێژن لە ڕۆژ و شەوێکدا، هەر نوێژێک بە دە نوێژ لای خۆم حسابی دەکەم، وە هەرکەسێک ویستی چاکەیەک بکات ئەگەر ئەنجامی نەدا ئەوە یەک چاکەی بۆ دەنوسرێ، ئەگەر هاتوو ئەنجامیدا ئەوە دە چاکەی بۆ دەنوسرێ، وە هەرکەسێکیش ویستی وابێ خراپەیەک ئەنجام بدا، بەڵام نەیکات ئەوە هیچی لەسەر نانوسرێ، ئەگەر هاتوو ئەنجامیدا ئەوە تەنها خراپەیەکی بۆ دەنوسرێ، ئەنجا دابەزیمەوە بۆ خوارەوە بۆ لای موسی ﷺ ئاگادارم کردەوە لەوەی نوێژەکان بوونەتە

پێنج نوێژ. پێی ووتم: بگەڕێرەوە بۆ لای پەروەردگارت داوای لێبکە کەمتری بکاتەوە بۆت. ووتم: هێندە گەڕامەوە بۆ لای پەروەردگارم ئیتر شەرم دەکەم لەوە زیاتر داوای کەم کردنەوەی لێبکەم.

عَنْ ثَابِتٌ الْبُنَانِيُّ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: «أُتِيتُ بِالْبُرَاقِ، وَهُوَ دَابَّةٌ أَبْيَضُ طَوِيلٌ فَوْقَ الْحِمَارِ وَدُونَ الْبَغْلِ يَضَعُ حَافِرَهُ عِنْدَ مُنْتَهَى طَرْفِهِ. قَالَ: فَرَكِبْتُهُ حَتَّى أَتَيْتُ بَيْتَ الْمَقْدِسِ. قَالَ: فَرَبَطْتُهُ بِالْحَلْقَةِ الَّتِي يَرْبِطُ بِهِ الْأَنْبِيَاءُ. قَالَ: ثُمَّ دَخَلْتُ الْمَسْجِدَ، فَصَلَّيْتُ فِيهِ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ خَرَجْتُ، فَجَاءَنِي جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلَامُ بِإِنَاءٍ مِنْ خَمْرٍ وَإِنَاءٍ مِنْ لَبَنٍ، فَاخْتَرْتُ اللَّبَنَ، فَقَالَ جِبْرِيلُ: اخْتَرْتَ الْفِطْرَةَ، ثُمَّ عَرَجَ بِنَا إِلَى السَّمَاءِ، فَاسْتَفْتَحَ جِبْرِيلُ، فَقِيلَ: مَنْ أَنْتَ؟ قَالَ: جِبْرِيلُ. قِيلَ: وَمَنْ مَعَكَ؟ قَالَ: مُحَمَّدٌ. قِيلَ: وَقَدْ بُعِثَ إِلَيْهِ؟ قَالَ: قَدْ بُعِثَ إِلَيْهِ، فَفُتِحَ لَنَا، فَإِذَا أَنَا بِآدَمَ ﷺ، فَرَحَّبَ بِي، وَدَعَا لِي بِخَيْرٍ، ثُمَّ عَرَجَ بِنَا إِلَى السَّمَاءِ الثَّانِيَةِ، فَاسْتَفْتَحَ جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلَامُ، فَقِيلَ: مَنْ أَنْتَ؟ قَالَ: جِبْرِيلُ، قِيلَ: وَمَنْ مَعَكَ؟ قَالَ: مُحَمَّدٌ. قِيلَ: وَقَدْ بُعِثَ إِلَيْهِ؟ قَالَ: قَدْ بُعِثَ إِلَيْهِ، فَفُتِحَ لَنَا، فَإِذَا أَنَا بِابْنَيِ الْخَالَةِ عِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ وَيَحْيَى بْنِ

زَكَرِيَّاءَ صَلَوَاتُ الله عَلَيْهِمَا، فَرَحَّبَا، وَدَعَوَا لِي بِخَيْرٍ. ثُمَّ عَرَجَ بِي إِلَى السَّمَاءِ الثَّالِثَةِ، فَاسْتَفْتَحَ جِبْرِيلُ، فَقِيلَ: مَنْ أَنْتَ؟ قَالَ: جِبْرِيلُ، قِيلَ: وَمَنْ مَعَكَ؟ قَالَ مُحَمَّدٌ. قِيلَ: وَقَدْ بُعِثَ إِلَيْهِ؟ قَالَ: قَدْ بُعِثَ إِلَيْهِ، فَفُتِحَ لَنَا، فَإِذَا أَنَا بِيُوسُفَ ﷺ، إِذَا هُوَ قَدْ أُعْطِيَ شَطْرَ الْحُسْنِ، فَرَحَّبَ، وَدَعَا لِي بِخَيْرٍ. ثُمَّ عَرَجَ بِنَا إِلَى السَّمَاءِ الرَّابِعَةِ، فَاسْتَفْتَحَ جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلَامُ، قِيلَ: مَنْ هَذَا؟ قَالَ: جِبْرِيلُ. قِيلَ: وَمَنْ مَعَكَ؟ قَالَ: مُحَمَّدٌ. قَالَ: وَقَدْ بُعِثَ إِلَيْهِ؟ قَالَ: قَدْ بُعِثَ إِلَيْهِ، فَفُتِحَ لَنَا، فَإِذَا أَنَا بِإِدْرِيسَ ﷺ، فَرَحَّبَ، وَدَعَا لِي بِخَيْرٍ. قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿ وَرَفَعْنَاهُ مَكَانًا عَلِيًّا ﴾. ثُمَّ عَرَجَ بِنَا إِلَى السَّمَاءِ الْخَامِسَةِ، فَاسْتَفْتَحَ جِبْرِيلُ. قِيلَ: مَنْ هَذَا؟ قَالَ: جِبْرِيلُ. قِيلَ: وَمَنْ مَعَكَ؟ قَالَ: مُحَمَّدٌ. قِيلَ: وَقَدْ بُعِثَ إِلَيْهِ؟ قَالَ: قَدْ بُعِثَ إِلَيْهِ، فَفُتِحَ لَنَا، فَإِذَا أَنَا بِهَارُونَ ﷺ، فَرَحَّبَ، وَدَعَا لِي بِخَيْرٍ، ثُمَّ عَرَجَ بِنَا إِلَى السَّمَاءِ السَّادِسَةِ، فَاسْتَفْتَحَ جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلَامُ. قِيلَ: مَنْ هَذَا؟ قَالَ: جِبْرِيلُ. قِيلَ: وَمَنْ مَعَكَ؟ قَالَ: مُحَمَّدٌ. قِيلَ: وَقَدْ بُعِثَ إِلَيْهِ. قَالَ: قَدْ بُعِثَ إِلَيْهِ، فَفُتِحَ لَنَا، فَإِذَا أَنَا بِمُوسَى ﷺ، فَرَحَّبَ وَدَعَا لِي بِخَيْرٍ. ثُمَّ عَرَجَ إِلَى السَّمَاءِ السَّابِعَةِ، فَاسْتَفْتَحَ جِبْرِيلُ، فَقِيلَ: مَنْ هَذَا؟

قَالَ: جبْرِيلُ. قِيلَ: وَمَنْ مَعَكَ؟ قَالَ: مُحَمَّدٌ. قِيلَ: وَقَدْ بُعِث إِلَيْهِ؟ قَالَ: قَدْ بُعِثَ إِلَيْه، فَفُتِح لَنَا، فَإِذَا أَنَا بِإِبْرَاهِيمَ ﷺ مُسْنِدًا ظَهْرَهُ إِلى الْبَيْتِ الْمَعْمُورِ، وَإِذَا هُوَ يَدْخُلُه كُلَّ يَوْمٍ سَبْعُونَ أَلْفَ مَلَكٍ لَا يَعُودُونَ إِلَيْه، ثُمَّ ذَهَبَ بِي إِلى السِّدْرَةِ الْمُنْتَهَى، وَإِذَا وَرَقُهَا كَآذَانِ الْفِيلَة، وَإِذَا ثَمَرُهَا كَالْقِلاَلِ. قَالَ : فَلَمَّا غَشِيَهَا مِنْ أَمْرِ الله مَا غَشِيَ تَغَيَّرَتْ، فَمَا أَحَدٌ مِنْ خَلْقِ الله يَسْتَطِيعُ أَنْ يَنْعَتَهَا مِنْ حُسْنِهَا، فَأَوْحَى اللَّهُ إِلَيَّ مَا أَوْحَى، فَفَرَضَ عَلَيَّ خَمْسِينَ صَلاَةً فِي كُلِّ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ، فَنَزَلْتُ إِلَى مُوسَى ﷺ، فَقَالَ: مَا فَرَضَ رَبُّك عَلَى أُمَّتِكَ؟ قُلْتُ: خَمْسِينَ صَلاَةً. قَالَ: ارْجِعْ إِلَى رَبِّكَ، فَاسْأَلْهُ التَّخْفِيفَ، فَإِنَّ أُمَّتَكَ لَا يُطِيقُونَ ذَلِكَ، فَإِنِّي قَدْ بَلَوْتُ بَنِي إِسْرَائِيلَ، وَخَبَرْتُهُمْ. قَالَ: فَرَجَعْتُ إِلَى رَبِّي. فَقُلْتُ: يَا رَبِّ خَفِّفْ عَلَى أُمَّتِي، فَحَطَّ عَنِّي خَمْسًا، فَرَجَعْتُ إِلَى مُوسَى. فَقُلْتُ: حَطَّ عَنِّي خَمْسًا. قَالَ: إِنَّ أُمَّتَكَ لَا يُطِيقُونَ ذَلِكَ، فَارْجِعْ إِلَى رَبِّكَ، فَاسْأَلْهُ التَّخْفِيفَ. قَالَ: فَلَمْ أَزَلْ أَرْجِعُ بَيْنَ رَبِّي تَبَارَكَ وَتَعَالَى وَبَيْنَ مُوسَى عَلَيْهِ السَّلاَمُ، حَتَّى قَالَ: يَا مُحَمَّدُ، إِنَّهُنَّ خَمْسُ صَلَوَاتٍ كُلَّ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ، لِكُلِّ صَلاَةٍ عَشْرٌ، فَذَلِكَ خَمْسُونَ صَلاَةً، وَمَنْ هَمَّ بِحَسَنَةٍ فَلَمْ يَعْمَلْهَا

**كُتِبَتْ لَهُ حَسَنَةً، فَإِنْ عَمِلَهَا كُتِبَتْ لَهُ عَشْرًا، وَمَنْ هَمَّ بِسَيِّئَةٍ فَلَمْ يَعْمَلْهَا لَمْ تُكْتَبْ شَيْئًا، فَإِنْ عَمِلَهَا كُتِبَتْ سَيِّئَةً وَاحِدَةً. قَالَ: فَنَزَلْتُ حَتَّى انْتَهَيْتُ إِلَى مُوسَى ﷺ فَأَخْبَرْتُهُ. فَقَالَ: ارْجِعْ إِلَى رَبِّكَ، فَاسْأَلْهُ التَّخْفِيفَ. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: فَقُلْتُ: قَدْ رَجَعْتُ إِلَى رَبِّي حَتَّى اسْتَحْيَيْتُ مِنْهُ ».**

رواه البخاري | ٣٤٩ ومسلم واللفظ له | ٤١١ وأحمد | ١٢٥٠٥

ووتم: والله ئەگەر لە صیفاتی بەرزی الله ﷻ هیچ حدیثێکی ترمان نەبووایە تەنها ئەم حدیثە نەبێ ئەوە بەس بوو بۆ ڕەد دانەوەی ئەو زەندیقانە، لە کاتێکدا ولله الحمد سەدان حدیثی لەسەرهاتووە، وەک دەبینن لفظەکانی وازحن ڕەسول الله ﷺ دەڵێ: بەرزکرامەوە بۆ ئاسمان، ئەنجا لەوێش ئاسمان بۆ ئاسمان بەرزتر کراوەتەوە هەتا گەیشتووەتە خزمەت الله ﷻ، کاتێکیش ئەگاتە ئەوێ پەنجا نوێژ فەڕز دەکرێ لە دابەزینەوەدا بۆ ئاسمانی شەشەم بۆ لای پێغەمبەر موسی ﷺ دووبارە دەچێتەوە بۆ سەرەوە بۆ خزمەت پەروەردگار هەتا نوێژی کردەوە پێنج فەڕز ئەم هاتن و چوونەش هەمووی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی الله ﷻ لە

ئاسمانه، وه دەلیلێکی تری تێدایه ئەویش صیفاتی کەلامه که الله ﷻ قسەی لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ کردووه ڕاستەوخۆ بەبێ وەحی.

هەمان حدیثی شەو ڕەوی **بوخاری** به طەریقێکی تر هێناویەتی له ڕێگەی شریک کوڕی عبدالله له أنس کوڕی مالک هەمان حدیثه، بەڵام هەندێک زیاده و جیاوازی تێدایه، لەم ڕیوایەتەیاندا ڕستەیەکی تێدایه زۆر به ڕوونی دیاره که الله ﷻ له بەرزییه له ئاسمان، دووباره ئەمەش بەڵگەیەکی وازحه بۆ هەرکەسێک خاوەن مێشک و عەقڵێکی سەلیم بێ.

**عَنْ شَرِيكِ بْنِ عَبْدِاللَّه أَنَّهُ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ مَالِكٍ يَقُولُ: لَيْلَةَ أُسْرِيَ بِرَسُولِ اللهِ ﷺ مِنْ مَسْجِدِ الْكَعْبَةِ أَنَّهُ جَاءَهُ ثَلَاثَةُ نَفَرٍ قَبْلَ أَنْ يُوحَى إِلَيْهِ، وَهُوَ نَائِمٌ فِي الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ، فَقَالَ أَوَّلُهُمْ: أَيُّهُمْ هُوَ؟ فَقَالَ: أَوْسَطُهُمْ هُوَ خَيْرُهُمْ. فَقَالَ آخِرُهُمْ: خُذُوا خَيْرَهُمْ. فَكَانَتْ تِلْكَ اللَّيْلَةَ، فَلَمْ يَرَهُمْ حَتَّى أَتَوْهُ لَيْلَةً أُخْرَى فِيمَا يَرَى قَلْبُهُ، وَتَنَامُ عَيْنُهُ وَلَا يَنَامُ قَلْبُهُ، وَكَذَلِكَ الْأَنْبِيَاءُ، تَنَامُ أَعْيُنُهُمْ وَلَا تَنَامُ قُلُوبُهُمْ، فَلَمْ يُكَلِّمُوهُ حَتَّى احْتَمَلُوهُ، فَوَضَعُوهُ عِنْدَ بِئْرِ زَمْزَمَ، فَتَوَلَّاهُ مِنْهُمْ جِبْرِيلُ، فَشَقَّ جِبْرِيلُ مَا بَيْنَ نَحْرِهِ إِلَى لَبَّتِهِ، حَتَّى فَرَغَ مِنْ صَدْرِهِ وَجَوْفِهِ فَغَسَلَهُ مِنْ مَاءِ زَمْزَمَ**

بيَدِه، حَتَّى أَنْقَى جَوفَهُ، ثُمَّ أُتِيَ بِطَسْت مِنْ ذَهَبٍ فِيهِ تَوْرٌ مِنْ ذَهَبٍ مَحْشُوًّا إِيمَانًا وَحِكْمَةً، فَحَشَا بِهِ صَدْرَهُ وَلَغَادِيدَهُ -يَعْنِي عُرُوقَ حَلْقِهِ- ثُمَّ أَطْبَقَهُ، ثُمَّ عَرَجَ بِهِ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا، فَضَرَبَ بَابًا مِنْ أَبْوَابِهَا، فَنَادَاهُ أَهْلُ السَّمَاءِ: مَنْ هَذَا؟ فَقَالَ: جِبْرِيلُ. قَالُوا: وَمَنْ مَعَكَ؟ قَالَ: مَعِيَ مُحَمَّدٌ. قَالَ: وَقَدْ بُعِثَ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالُوا: فَمَرْحَبًا بِهِ وَأَهْلًا. فَيَسْتَبْشِرُ بِهِ أَهْلُ السَّمَاءِ، لَا يَعْلَمُ أَهْلُ السَّمَاءِ بِمَا يُرِيدُ اللَّهُ بِهِ فِي الْأَرْضِ حَتَّى يُعْلِمَهُمْ، فَوَجَدَ فِي السَّمَاءِ الدُّنْيَا آدَمَ، فَقَالَ لَهُ جِبْرِيلُ: هَذَا أَبُوكَ، فَسَلِّمْ عَلَيْهِ. فَسَلَّمَ عَلَيْهِ، وَرَدَّ عَلَيْهِ آدَمُ وَقَالَ: مَرْحَبًا وَأَهْلًا بِابْنِي، نِعْمَ الابْنُ أَنْتَ. فَإِذَا هُوَ فِي السَّمَاءِ الدُّنْيَا بِنَهَرَيْنِ يَطَّرِدَانِ، فَقَالَ: « مَا هَذَانِ النَّهَرَانِ يَا جِبْرِيلُ؟ ». قَالَ: هَذَا النِّيلُ وَالْفُرَاتُ عُنْصُرُهُمَا. ثُمَّ مَضَى بِهِ فِي السَّمَاءِ، فَإِذَا هُوَ بِنَهَرٍ آخَرَ عَلَيْهِ قَصْرٌ مِنْ لُؤْلُؤٍ وَزَبَرْجَدٍ، فَضَرَبَ يَدَهُ، فَإِذَا هُوَ مِسْكٌ، قَالَ: « مَا هَذَا يَا جِبْرِيلُ؟ ». قَالَ: هَذَا الْكَوْثَرُ الَّذِي خَبَأَ لَكَ رَبُّكَ. ثُمَّ عَرَجَ إِلَى السَّمَاءِ الثَّانِيَةِ، فَقَالَتِ الْمَلَائِكَةُ لَهُ مِثْلَ مَا قَالَتْ لَهُ الْأُولَى: مَنْ هَذَا؟ قَالَ: جِبْرِيلُ. قَالُوا: وَمَنْ مَعَكَ؟ قَالَ: مُحَمَّدٌ. قَالُوا: وَقَدْ بُعِثَ إِلَيْهِ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالُوا: مَرْحَبًا بِهِ وَأَهْلًا. ثُمَّ عَرَجَ بِهِ إِلَى السَّمَاءِ

الثَّالِثَة، وَقَالُوا لَهُ مِثْلَ مَا قَالَت الْأُولَى وَالثَّانِيَةُ، ثُمَّ عَرَجَ بِهِ إِلَى الرَّابِعَة، فَقَالُوا لَهُ مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ عَرَجَ بِهِ إِلَى السَّمَاءِ الْخَامِسَة، فَقَالُوا مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ عَرَجَ بِهِ إِلَى السَّادِسَة، فَقَالُوا لَهُ مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ عَرَجَ بِهِ إِلَى السَّمَاءِ السَّابِعَة، فَقَالُوا لَهُ مِثْلَ ذَلِكَ، كُلُّ سَمَاءٍ فِيهَا أَنْبِيَاءُ قَدْ سَمَّاهُمْ، فَأَوْعَيْتُ مِنْهُمْ إِدْرِيسَ فِي الثَّانِيَة، وَهَارُونَ فِي الرَّابِعَة، وَآخَرَ فِي الْخَامِسَة، لَمْ أَحْفَظ اسْمَهُ، وَإِبْرَاهِيمَ فِي السَّادِسَة، وَمُوسَى فِي السَّابِعَة، بِتَفْضِيلِ كَلَامِ اللَّه، فَقَالَ مُوسَى: رَبِّ لَمْ أَظُنَّ أَنْ يُرْفَعَ عَلَيَّ أَحَدٌ. ثُمَّ عَلَا بِهِ فَوْقَ ذَلِكَ بِمَا لَا يَعْلَمُهُ إِلَّا اللَّهُ، حَتَّى جَاءَ سِدْرَةَ الْمُنْتَهَى وَدَنَا الْجَبَّارُ رَبُّ الْعِزَّة، فَتَدَلَّى حَتَّى كَانَ مِنْهُ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَى، فَأَوْحَى اللَّهُ فِيمَا أَوْحَى إِلَيْهِ خَمْسِينَ صَلَاةً عَلَى أُمَّتِك كُلَّ يَوْمٍ وَلَيْلَة، ثُمَّ هَبَطَ حَتَّى بَلَغَ مُوسَى، فَاحْتَبَسَهُ مُوسَى فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ، مَاذَا عَهِدَ إِلَيْكَ رَبُّكَ؟ قَالَ: «عَهِدَ إِلَيَّ خَمْسِينَ صَلَاةً كُلَّ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ». قَالَ: إِنَّ أُمَّتَك لَا تَسْتَطِيعُ ذَلِك، فَارْجِعْ فَلْيُخَفِّفْ عَنْكَ رَبُّك وَعَنْهُمْ. فَالْتَفَتَ النَّبِيُّ ﷺ إِلَى جِبْرِيلَ، كَأَنَّهُ يَسْتَشِيرُهُ فِي ذَلِكَ، فَأَشَارَ إِلَيْهِ جِبْرِيلُ أَنْ نَعَمْ، إِنْ شِئْتَ. فَعَلَا بِهِ إِلَى الْجَبَّارِ، فَقَالَ وَهُوَ مَكَانَهُ: «يَا رَبِّ، خَفِّفْ

عَنَّا، فَإِنَّ أُمَّتِي لَا تَسْتَطِيعُ هَذَا ». فَوَضَعَ عَنْهُ عَشْرَ صَلَوَاتٍ، ثُمَّ رَجَعَ إِلَى مُوسَى فَاحْتَبَسَهُ، فَلَمْ يَزَلْ يُرَدِّدُهُ مُوسَى إِلَى رَبِّهِ حَتَّى صَارَتْ إِلَى خَمْسِ صَلَوَاتٍ، ثُمَّ احْتَبَسَهُ مُوسَى عِنْدَ الْخَمْسِ، فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ، وَاللهِ لَقَدْ رَاوَدْتُ بَنِي إِسْرَائِيلَ قَوْمِي عَلَى أَدْنَى مِنْ هَذَا فَضَعُفُوا فَتَرَكُوهُ، فَأُمَّتُكَ أَضْعَفُ أَجْسَادًا وَقُلُوبًا وَأَبْدَانًا وَأَبْصَارًا وَأَسْمَاعًا، فَارْجِعْ فَلْيُخَفِّفْ عَنْكَ رَبُّكَ. كُلَّ ذَلِكَ يَلْتَفِتُ النَّبِيُّ ﷺ إِلَى جِبْرِيلَ لِيُشِيرَ عَلَيْهِ، وَلَا يَكْرَهُ ذَلِكَ جِبْرِيلُ، فَرَفَعَهُ عِنْدَ الْخَامِسَةِ، فَقَالَ: « يَا رَبِّ، إِنَّ أُمَّتِي ضُعَفَاءُ، أَجْسَادُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ، وَأَسْمَاعُهُمْ وَأَبْدَانُهُمْ، فَخَفِّفْ عَنَّا ». فَقَالَ الْجَبَّارُ: يَا مُحَمَّدُ. قَالَ: «لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ ». قَالَ: إِنَّهُ لَا يُبَدَّلُ الْقَوْلُ لَدَيَّ كَمَا فَرَضْتُ عَلَيْكَ فِي أُمِّ الْكِتَابِ. قَالَ: فَكُلُّ حَسَنَةٍ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا فَهِيَ خَمْسُونَ فِي أُمِّ الْكِتَابِ، وَهِيَ خَمْسٌ عَلَيْكَ. فَرَجَعَ إِلَى مُوسَى فَقَالَ: كَيْفَ فَعَلْتَ؟ فَقَالَ: « خَفَّفَ عَنَّا، أَعْطَانَا بِكُلِّ حَسَنَةٍ عَشْرَ أَمْثَالِهَا ». قَالَ مُوسَى: قَدْ وَاللهِ رَاوَدْتُ بَنِي إِسْرَائِيلَ عَلَى أَدْنَى مِنْ ذَلِكَ فَتَرَكُوهُ، ارْجِعْ إِلَى رَبِّكَ فَلْيُخَفِّفْ عَنْكَ أَيْضًا. قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «يَا

مُوسَى، قَدْ وَاللهِ اسْتَحْيَيْتُ مِنْ رَبِّي مِمَّا اخْتَلَفْتُ إِلَيْهِ». قَالَ : فَاهْبِطْ بِاسْمِ اللَّه. قَالَ: وَاسْتَيْقَظَ وَهُوَ فِي مَسْجِدِ الْحَرَامِ.

رواه البخاري | ٧٥١٧

ووتم: سەیری ئەو بەشەی حدیثەکە بکەن: ( ...ثُمَّ هَبَطَ حَتَّى بَلَغَ مُوسَى، فَاحْتَبَسَهُ مُوسَى فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ، مَاذَا عَهِدَ إِلَيْكَ رَبُّكَ؟ قَالَ: « عَهِدَ إِلَيَّ خَمْسِينَ صَلَاةً كُلَّ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ ». قَالَ: إِنَّ أُمَّتَكَ لَا تَسْتَطِيعُ ذَلِكَ، فَارْجِعْ فَلْيُخَفِّفْ عَنْكَ رَبُّكَ وَعَنْهُمْ. فَالْتَفَتَ النَّبِيُّ ﷺ إِلَى جِبْرِيلَ، كَأَنَّهُ يَسْتَشِيرُهُ فِي ذَلِكَ، فَأَشَارَ إِلَيْهِ جِبْرِيلُ أَنْ نَعَمْ، إِنْ شِئْتَ. فَعَلَا بِهِ إِلَى الْجَبَّارِ، فَقَالَ وَهُوَ مَكَانَهُ... ) دەڵێ: پاشان ڕەسول الله ﷺ دابەزی هەتا گەیشتە لای پێغەمبەر موسی ﷺ، موسی وەستاندی لێی پرسی: ئەی محمد، پەروەردگارت چی پێ بەخشیت و لەسەر فەڕز کردی؟ ووتی: « پەنجا نوێژی لەسەر فەڕز کردم لە ڕۆژ و شەوێکدا ». ووتی: ئوممەتەکەت توانای ئەوەیان نییە، بگەڕێرەوە بۆ لای پەروەردگارت داوای لێبکە کەمی بکاتەوە بۆت. پێغەمبەر ﷺ لای کردەوە بۆ جبریل، ڕاوێژی پێکرد بگەڕێمەوە، جبریل پێی ووت بەڵێ بگەڕێرەوە ئەگەر پێت خۆشە. ئیتر

ڕەسول الله ﷺ بەرزبوویەوە بۆ لای جبار ﷻ که له مه‌کانی خۆیدا بوو ...)

سه‌رنج بده‌ن لفظه‌که‌ی چه‌نده ڕوونه که ڕه‌سول الله ﷺ به‌رزبووه‌ته‌وه بۆ لای الله ﷻ، وه هه‌روه‌ها ده‌ڵێ الله ﷻ له شوێنی خۆی بوو به‌و لفظه ده‌ڵێ مه‌کان. ده‌لیل له‌وه وازحتر که ئیثباتی مه‌کانی تێدایه؟ على رغم أُنوف الزنادقة.

ئینسانی ئیماندار ده‌بێ عه‌قیده‌ی له سه‌له‌فه‌وه وه‌ربگرێ به تایبه‌تی بابه‌تی صیفات، چونکه سه‌له‌ف پارێزراوترن له جیله‌کانی دواتر، له ناو سه‌له‌فیشدا صه‌حابه‌ش ئه‌سله‌مترین عه‌قیده‌یان هه‌بووه، چونکه ئه‌وه‌ی له وه‌حی بیستوویانه ملکه‌چی بوون، له ناو صه‌حابه‌شدا خێزانه‌کانی پێغه‌مبه‌ر ﷺ له پێشترینن، چونکه خانه‌واده‌ی ئه‌ون و به گه‌رمی و ته‌ڕی ئاماده‌ی دابه‌زینی وه‌حی بوون و ئه‌وه‌ی ڕه‌سول الله ﷺ له‌سه‌ری بووه ئه‌وانیش قبوڵیان بووه و وه‌ریان گرتووه، وه الله ﷻ ئه‌و فه‌زڵ و مه‌رته‌به‌یه‌ی کردووه‌ته نه‌سیبیان که له‌م دونیا و له‌و دونیاش خێزانی ئه‌و بن.

ئێستا **(٢)** حدیثتان بۆ دەهێنین لەماڵی پێغەمبەرەوە ﷺ حدیثی دایە عائشە و دایە زینب رضي الله عنهما کە هەردووکیان لە ماڵی ڕەسول الله ژیاون و مردووشن ئیثباتی بەرزی و مەکان دەکەن بۆ الله ﷻ.

بەڵگەی یەکەم: حدیثی **عبدالله کوڕی عباس** رضي الله عنهما کە ئەوەی تێدایە الله ﷻ لە ئاسمانە لەو بەرزییەوە پاکیەتی دایە عائشەی سەلماندووە. إبن أبي ملیکە دەڵێ: کاتێک دایە عائشە لە نەخۆشی مردنیدا بوو إبن عباس ئیزنی لێوەرگرت بچێتە سەردانی. عائشە ووتی: با نەیێت دەترسم کە هات مەدحم بکات، پێی وترا: ئەوە کوڕە مامی ڕەسول الله ـیە ﷺ وە لە گەورە پیاوانە. ووتی: ئیزنی بدەن بێتە ژوورەوە. کە هاتە ژوورەوە ووتی: حاڵت چۆنە؟ ووتی: باشم ئەگەر ڕزگارم ببێ. ووتی: تۆ باشی إن شاء الله، خێزانی ڕەسول الله ـی ﷺ، وە هیچ کچێکی نە خواستووە بێجگە لە تۆ، پاکیەتی تۆ لە ئاسمان دابەزی و ئایەت لەسەری هاتە خوارەوە. بە دوای ئەمدا عبدالله کوڕی زبیر هاتە ژوورەوە، عائشە ووتی: إبن عباس هاتە لام، مەدحی کردم، والله حەزم دەکرد کەسێکی لەبیرکراو بوومایە.

قَالَ ابْنُ أَبِي مُلَيْكَةَ: اسْتَأْذَنَ ابْنُ عَبَّاسٍ قَبْلَ مَوْتِهَا عَلَى عَائِشَةَ وَهِيَ مَغْلُوبَةٌ قَالَتْ: أَخْشَى أَنْ يُثْنِيَ عَلَيَّ، فَقِيلَ: ابْنُ عَمِّ رَسُولِ اللهِ ﷺ وَمِنْ وُجُوهِ الْمُسْلِمِينَ قَالَتِ: ائْذَنُوا لَهُ. فَقَالَ: كَيْفَ تَجِدِينَكِ؟ قَالَتْ: بِخَيْرٍ إِنِ اتَّقَيْتُ. قَالَ: فَأَنْتِ بِخَيْرٍ إِنْ شَاءَ اللَّهُ، زَوْجَةُ رَسُولِ اللهِ ﷺ، وَلَمْ يَنْكِحْ بِكْرًا غَيْرَكِ، وَنَزَلَ عُذْرُكِ مِنَ السَّمَاءِ. وَدَخَلَ ابْنُ الزُّبَيْرِ خِلَافَهُ، فَقَالَتْ: دَخَلَ ابْنُ عَبَّاسٍ، فَأَثْنَى عَلَيَّ، وَوَدِدْتُ أَنِّي كُنْتُ نِسْيًا مَنْسِيًّا.

رواه البخاري ا ٤٧٥٣ وأَحمد ا ١٩٠٥

حدیثی پاکیەتی دایە **عائشە** لە غیری ئەو ڕیوایەتەی سەرەوە هاتووە کاتێک ئەهلی إفک بوختانی پێدەکەن دەڵێ: والله پێم وانەبوو الله ﷻ دەربارەی پاکی من ئایەت دابەزێنێ و بخوێنرێتەوە، خۆمم زۆر لەوە بە کەمتر دەزانی کە الله ﷻ قسەم دەربارە بکات، بەڵکو هیوادار بووم ڕەسول الله ﷺ خەوێک ببینێ کە الله ﷻ پاکیەتیم بسەلمێنێ، کەچی الله ﷻ ئایەتی دابەزاند: ﴿ إِنَّ الَّذِينَ جَاءُوا بِالْإِفْكِ ﴾ دە ئایەت.

قَالَ الزُّهْرِيَّ، قَالَ: سَمِعْتُ عُرْوَةَ بْنَ الزُّبَيْرِ وَسَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ وَعَلْقَمَةَ بْنَ وَقَّاصٍ وَعُبَيْدَاللَّهَ بْنَ عَبْدِاللهِ عَنْ حَدِيثِ عَائِشَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ حِينَ قَالَ لَهَا أَهْلُ الإِفْكِ مَا قَالُوا، فَبَرَّأَهَا اللَّهُ مِمَّا قَالُوا، وَكُلٌّ حَدَّثَنِي طَائِفَةً مِنَ

الْحَدِيث الَّذِي حَدَّثَنِي، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: وَلَكِنِّي وَاللهِ مَا كُنْتُ أَظُنُّ أَنَّ اللَّهَ يُنْزِلُ فِي بَرَاءَتِي وَحْيًا يُتْلَى، وَلَشَأْنِي فِي نَفْسِي كَانَ أَحْقَرَ مِنْ أَنْ يَتَكَلَّمَ اللَّهُ فِيَّ بِأَمْرٍ يُتْلَى، وَلَكِنِّي كُنْتُ أَرْجُو أَنْ يَرَى رَسُولُ اللهِ ﷺ فِي النَّوْمِ رُؤْيَا يُبَرِّئُنِي اللَّهُ بِهَا، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: ﴿ إِنَّ الَّذِينَ جَاءُوا بِالْإِفْكِ ﴾ الْعَشْرَ الْآيَاتِ.

رواه البخاري | ٧٥٠٠ ومسلم | ٧٠٢٠ وأحمد | ٢٥٦٢٣

وەک دەبینن ئەم حدیثەش بەڵگەی بەرزی الله ﷻ تێدایە کە لە ئاسمانەوە ئایەتی دابەزاندووە، هەروەها صیفاتی کەلامیشی تێدایە دایە عائشە دەڵێ: خۆمم زۆر لەوە بە کەمتر دەزانی کە الله ﷻ قسەم دەربارە بکات "وَلَشَأْنِي فِي نَفْسِي كَانَ أَحْقَرَ مِنْ أَنْ يَتَكَلَّمَ اللَّهُ فِيَّ بِأَمْرٍ يُتْلَى."

بەڵگەی دووەم: حدیثی دایکمان **زینب کچی جحش** ـە، أنس دەڵێ: زید کوڕی حارثە هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ گلەیی حاڵی خۆی دەکرد لەگەڵ خێزانەکەی زینب کچی جحش کە پێکەوە ناگونجێن، پێغەمبەر ﷺ پێی ووت: « ئارام بگرە تەقوای الله ـت هەبێ، وَ ﴿ أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ ﴾ ». أنس دەڵێ: ئەگەر ڕەسول الله ﷺ شتێکی لە وەحی

بشاردايەتەوە ئەم بابەتەی دەشاردەوە واتە زەواج كردنی لەگەڵ زینب كچی جحش. زینب شانازی بە خۆیەوە دەكرد، بە خێزانەكانی تری رەسول الله ﷺ دەوت: كەسەكانتان ئێوەیان داوە بە شوو، بەڵام من ئەوە الله ﷻ لە سەر حەوت تەبەقەی ئاسمانەوە منی دا بە شوو بە پێغەمبەر ﷺ.

عَنْ أَنَسٍ قَالَ: جَاءَ زَيْدُ بْنُ حَارِثَةَ يَشْكُو، فَجَعَلَ النَّبِيُّ ﷺ يَقُولُ: « اتَّقِ اللَّهَ، وَ ﴿ أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ ﴾ ». قَالَ أَنَسٌ: لَوْ كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ كَاتِمًا شَيْئًا لَكَتَمَ هَذِهِ. قَالَ: فَكَانَتْ زَيْنَبُ تَفْخَرُ عَلَى أَزْوَاجِ النَّبِيِّ ﷺ، تَقُولُ: زَوَّجَكُنَّ أَهَالِيكُنَّ، وَزَوَّجَنِي اللَّهُ تَعَالَى مِنْ فَوْقِ سَبْعِ سَمَاوَاتٍ.

رواه البخاري | ٧٤٢٠ ومسلم | ٣٥٠٢ والترمذي | ٣٤٩٢ وأحمد | ١٣٣٦١

ووتم: هەركەس یەك تۆسقاڵ عەقڵی هەبێ ئەم حدیثەی بەسە كە دایە زینب ئاماژەی پێدەكات كە الله ﷻ لە سەر حەوت تەبەقەی ئاسمانەوە نیكاحەكەی دامەزراندووە، وە زینب شانازی بەم فەزڵێتەوە كردووە، كەچی ئەشاعیرە دەڵێن: "ناكرێ بوترێ الله لە ئاسمانە!" كاتێك

دایکانی ئیماندااران ئیثباتی صیفاتی بەرزی بۆ الله ﷻ دەکەن، ئیتر زەندیقانێکی وەک ئێوە کێیە هەتا بڵێ نابێ مەکان بۆ الله جێگیر بکرێ!

بەڵگەیەکی تر دەربارەی صیفاتی بەرزی کە الله ﷻ لە ئاسمانە و پێغەمبەر ﷺ بەو جۆرە وەصفی کردووە کە لە ئاسمانە ئەم حدیثەیە: ڕەسول الله ﷺ فەرموویەتی: سوێند بەو زاتەی نەفسی منی بە دەستە هیچ پیاوێک نییە داوا لە خێزانەکەی بکات بێتە سەر جێگای خەوتن و جووت بوون، بەڵام خێزانەکەی ڕەتی بکاتەوە، ئیللا ئەوەی لە ئاسمانە لێی تووڕەیە هەتا ئەو کاتەی پیاوەکەی لێی ڕازی دەبێ.

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: { **وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ مَا مِنْ رَجُلٍ يَدْعُو امْرَأَتَهُ إِلَى فِرَاشِهَا، فَتَأْبَى عَلَيْهِ إِلَّا كَانَ الَّذِي فِي السَّمَاءِ سَاخِطًا عَلَيْهَا حَتَّى يَرْضَى عَنْهَا** }.

رواه مسلم ا ٣٥٤٠

سەدان حدیثی تر دەبارەی علوی الله ﷻ کە لە ئاسمانە لەسەر عەرش هەن نامەوێ ئێستا هەموویان بهێنم بۆ ئەوەی حەجمی کتێبەکە لەو ئاستەی دیاریم کردووە گەورتر نەبێ، إن شاء الله دەستمان کردووە بە

نوسینی کتێبێک تایبەت بە صیفاتەکانی الله ﷻ لەوێدا هەرچی حدیث هاتبێ لەسەر علوی الله ﷻ لەگەڵ باقی صیفاتەکانی تر دەیانهێنین.

هەتا لای کافران و موشریکان زانراو بووە کە الله ﷻ لە ئاسمانە کەچی ئەشاعیرە عەقیدەیان ئەوەیە الله مەکانی نییە، بەڵکو لە هەموو شوێنێکە!

هەریەک لە إبن قدامە و الذهبي شیعری أمیة کوڕی أبي الصلت ـیان هێناوە سەرەڕای ئەوەی موشریک بووە، بەڵام ئیثباتی علو دەکات، ئەنجا قەولی ڕەسول الله ﷺ دێنین کە فەرموویەتی: « شیعرەکەی ئیمانی هێناوە، بەڵام دڵی کافرە ».

وقد إشتهر شعر أُمية بن أَبي الصلت:

مَجِّدُوا اللهَ فَهُوَ لِلْمَجدِ أَهلُ .. رَبُنَا في السَّماءِ أَمسى كَبيرَا

بِالبِنَاءِ الأَعلَى الَّذي سَبَقَ الخَلقَ .. وَسَوَّى فَوقَ السَّماءِ سَريرا

شَرْجَعًا ما يَنَالُه بَصَرُ الْعينِ .. تُرَى دونَه المَلائِكَةُ صُوَرَا

وقال النَبي ﷺ: « **آمَنَ شِعْرُهُ وَكَفَرَ قَلْبُهُ** ».

مسألة العلو لابن قدامة ا ٦٩ كتاب العلو للذهبي ا ٧٦

ئەو قەولەی ڕەسول الله ﷺ أبو العباس الفاكهی لە كتێبەكەیدا "أخبار مكة في قديم الدهر وحديثه" بە سەنەدی خۆی هێناویەتی دەڵێ:

حدثنا حسن بن حسين أبو سعيد، قال: حدثنا علي بن الصباح، قال: حدثنا هشام بن الكلبي، عن أبيه، قال: أُنشد النبي ﷺ شعر أُمية بن أبي الصلت، فقال ﷺ: « آمَنَ شِعْرُهُ وَكَفَرَ قَلْبُهُ ».

أَخبار مكة للفاكهي ا ١٩٧٣

ئەم حديثە ضعيفە، چونكە سەنەدەكەی متصل نییە هەتا ئەگاتەوە ڕەسول الله ﷺ قەطعی تێدایە،وە هەریەک لە هشام و محمد بن السائب الكلبی باوكی مەتروكن.

هەرچەندە حديثەكە ضعيفە، بەڵام شاهدێكی باشی هەیە لە صحيحن ڕەسول الله ﷺ داوای لە الشَّريد باوكی عمرو كردووە شيعری أُمیە كوڕی أَبی الصلت بۆ بخوێنێتەوە، دواتر فەرموویەتی خەریک بووە أُمیە كوڕی أَبی الصلت موسڵمان ببێ.

عمرو كوڕی الشريد لە باوكیەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: ڕۆژێک لە پشت پێغەمبەرەوە ﷺ سوار بووم، فەرمووی: « هیچت لایە لە شيعری أُمیە

كوڕی أبي الصلت؟ ». ووتم: بەڵێ. فەرمووی: « با بێ، بیڵێ ». بەیتێکم بۆی ووت، فەرمووی: « زیاتر ». پاشان بەیتێکی ترم بۆی ووت، فەرمووی: « زیاتر ». هەتا سەد بەیتم بۆی ووت.

عَنْ عَمْرِو بْنِ الشَّرِيدِ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: رَدِفْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَوْمًا، فَقَالَ: « **هَلْ مَعَكَ مِنْ شِعْرِ أُمَيَّةَ بْنِ أَبِي الصَّلْتِ شَيْءٌ؟** ». قُلْتُ: نَعَمْ. قَالَ: « **هِيهِ**». فَأَنْشَدْتُهُ بَيْتًا، فَقَالَ: « **هِيهِ** ». ثُمَّ أَنْشَدْتُهُ بَيْتًا، فَقَالَ: «**هِيهِ**». حَتَّى أَنْشَدْتُهُ مِائَةَ بَيْتٍ.

رواه مسلم | ٥٨٨٥ وأحمد | ١٩٤٧٦

وە هەروەها لە ڕیوایەتی أبی هریرە ـدا هاتووە ڕەسول الله ﷺ فەرموویەتی: « ڕاسترین کەلیمە شاعیر وتبێتی کەلیمەی لبید کوڕی ربیعە ـیە: هەموو شتێک غیری الله باطڵە، وە خەریک بووە أمیە کوڕی أبی الصلت موسڵمان ببێ ».

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: « **أَصْدَقُ كَلِمَةٍ قَالَهَا شَاعِرٌ كَلِمَةُ لَبِيدٍ: أَلَا كُلُّ شَيْءٍ مَا خَلَا اللَّهَ بَاطِلٌ وَكَادَ أُمَيَّةُ بْنُ أَبِي الصَّلْتِ أَنْ يُسْلِمَ** ».

رواه البخاري | ٦١٤٧ ومسلم | ٥٨٨٩ والترمذي في الشمائل | ٢٤٢ وابن ماجه | ٣٧٥٧ وأحمد | ١٠٠٧٤

أُمية بن عبدالله بن أَبي الصلت بن ربيعة الثقفي، شاعیرێکی سەردەمی جاهلي بووە خەڵکی طائف، یەکێک بووە لەوانەی ئارەقیان لەسەر خۆیان حەڕام کردووە، ساڵی **(٩)** هیجری وەفاتی کردووە.

وەک پێشتر ووتم ئەو حدیثەی کە یەکەم جار هێناومە « آمَنَ شِعْرَهُ وَكَفَرَ قَلْبَهُ ». لە ڕووی سەنەدەوە سابت نەبووە، بەڵام دوو حدیثەکەی دوای خۆی ئەوە نیشان دەدەن کە ئەصڵێکی هەیە و هەمان مانای ئەو حدیثەیان هەیە لە یەکەمیان باس لەوە دەکات سەد بەیت شیعری أُمیە کوڕی أبی الصلت ـ ی بۆ ڕەسول الله ﷺ وتووە، لە دووەمیاندا خودی ڕەسول الله ﷺ دەفەرمویٚ وەخت بوو أُمیە موسڵمان ببیٚ، بۆ ئەوەی فەرمووە؟ لەبەرئەوەی شیعرەکانی بۆ خوێندراوەتەوە کە ئیثباتی صیفاتی بەرزییەتی الله ﷻ تێدا بووە وەک چۆن لە ڕیوایەتەکەی الفاکهی هاتووە و إبن قدامە و الذهبی تەخریجیان کردووە.



## بەراوردی نێوان عەقیدەی جەهمییە و ئەشاعیرە

تەئویل دینی جەهمییەکانە بە تەئویل هەرچی صیفاتی الله ﷻ ڕەتیدەکەنەوە، ئەم تەئویلە هەمان دینی ئەشاعیرەشە و بوونەتە میراتگری جەهمییەکان.

زۆرێک لە خەڵکی وا دەزانن تەئویلی جەهمییەکان شتێکی ترە و هی ئەشاعیرە شتێکە جیاوازە لەوەی یەکەم دانە، ئەمە جەهلە بە عەقیدەی سەلەف، چونکە لای سەلەف تەئویل وجوودی نەبووە، بەڵکو جەهمییەکان دایان هێنا، ناکرێ تۆ جەهمیەکانت پێ کافربێ لەبەر تەئویلەکەیان کە دروستە کافرن، بەڵام هەمان تەئویل ئەشاعیرە دەیکەن ئەوانت پێ کافر نەبێ نەک کافر بەڵکو موبتەدیعیش نەبن بگرە ئەهلی سوننە بن! تەئویلی جەهمییەکان بە لاتەوە ژەهربێ، بەڵام ئەوەی ئەشاعیرە هەنگوین!!

ئێستا هەندێک نمونەی ڕەتکردنەوەی صیفات دادەنێین لە لایەن جەهمیەکانەوە کە هەمان ڕەتکردنەوەی صیفاتە لە لای ئەشاعیرە، کاتێک وورد دەبیتەوە لە تەئویلەکەی ئەشاعیرە دەبینی هەمان تەئویلەکەی جەهمییەکانە بێ کەم و زیاد.

**حسن کوڕی البزار** دەڵێ: پیاوێک هات بۆ لای بشر المریسی، پێی ووت: ئەی باوکی عبدالرحمن، لەگەڵ ئەهلی حدیث دادەنیشم، هەرکات حدیث ڕیوایەت بکەن لە ڕەسول الله ﷺ ڕەتیبکەمەوە، پێم دەڵێن: تۆ کافری. چی بکەم؟ ووتی: هەرکات حدیثی پێغەمبەریان ﷺ هێنا، بڵێ: ڕاست دەکەن، بەڵام تەضعیفی بکە بڵێ نەخۆشییەک عیللەیێکی هەیە بووەتە هۆکاری ضەعیف بوونی.

أَخبرنا محمد بن علي الوراق، قال: حدثنا محمد بن إِسماعيل الترمذي، قال: سمعت الحسن بن البزار، يقول: جاء رجل إِلى المريسي، فقال: يا أَبا عبدالرحمن، أُذاكِر أَصحاب الحديث، فكُلما ذكروا الحديث عن النبي ﷺ فرددته، يقولون: أَنت كافر. قال: فكيف أَصنع؟ قال: إِذا ذكروا حديث النبي ﷺ قل: صدقت، ثم اضربه بِعِلَّة، فقل : له عِلَّة.

كتاب السنة للخلال | ١٧٢٣

**الدارمی** دەڵێ: پێمان گەیشتووە کە هەندێک لە هاوەڵانی المریسی پێیان وتووە: ئەو سەنەدە بەهێزانەی کە ئەهلی سوننە ئیحتجاجی پێدەکەن دژمان لە ڕەد دانەوەی مەزهەبەکەمان لە کاتێکدا ناکرێ بە درۆیان بخەینەوە؟ وەک: سفیان عن منصور عن الزهری. وە الزهری عن سالم.

وه أيوب، إبن عون، إبن سيرين، عمرو بن دينار، له جابر كوڕى عبدالله، له پێغەمبەرەوە ﷺ ئەو جۆرە سەنەدانە چی لێبکەین؟ المريسى ووتی: ڕەدیان مەکەنەوە کەشف ببن، بەڵکو بە تەئویل لەگەڵیان بوەستنەوە، بەم جۆرە ڕەدتان کردوونەتەوە بە نەرمی لە کاتێکدا ناتوانن بە توندی ڕەدی بکەنەوە.

قال الدارمي: وبلغنا أَنَّ بعض أَصحاب المريسي قالوا له: كيف تصنع بهذه الأَسانيد الجياد التي يحتجون بها علينا في رَدّ مذهبنا مما لا يمكن التكذيب بها؟ مثل: سفيان عن منصور عن الزهري. والزهري عن سالم. وأَيوب، وابن عَون، وابن سيرين، وعمرو بن دينار، عن جابر رضي الله عنه، عن النبي ﷺ وما أَشبهها؟ قال: فقال المريسي: لا تردّوه فتفتضحوا، ولكن غالطوهم بالتأويل، فتكونوا قد رددتموها بلُطفٍ إِذ لم يمكنكم ردّها بِعُنف.

نقض عثمان بن سعيد على المريسي ١ صـ: ٦٤٧

وەک بینیتان ئەوە ئامۆژگاری بشر المريسى جەهمییە بۆ ئەتباعەکانی هەتا حدیثەکانی صیفات هەرچەندە سەنەدەکانیان لە قیمەی صیحەتندابێ، بەڵام بە طەریقەی تەئویل بە نەرمی ڕەتیان بکەنەوە، ئێ

ئەمە ڕێک هەمان مەزهەبی ئەشاعیرەیە ڕەتکردنەوەی صیفات بە تەئویل بە نەرمی و شەرمنانە، هەر بۆیەش پێیان وتراوە: مێینەی جەهمییەکان.

هەرووەها **الدارمی** دەڵێ: هەتا دەربارەی تۆ پێم گەیشتووە لە غیری ڕیوایەتی ئەم موخالیفەم، کە وتووتە: هیچ شتێک نییە هێندەی قورئان دەعوا و مەزهەبی ئێمە هەڵبوەشێنێتەوە، بەڵام هیچ ڕێگایەک نییە بۆ ڕەتکردنەوەی، ئیللا ڕێگای تەئویل نەبێ .

قال الدارمي: حتى بلغني عنك من غير رواية المُعارض، أنك قلت: ما شيء أنقض لدعوانا من القرآن، غير أنه لا سبيل إِلى دفعه، إِلا مكابرة بالتأويل.

نقض عثمان بن سعيد على المريسي ا صـ : ٢٧٨

بینیتان المریسی جەهمی چۆن قورئانیشی بە تەئویل ڕەتکردووەتەوە، دەی ئەشاعیرەش هەمان مەسلەکیان گرتووەتەبەر بەرامبەر ئایاتی صیفات، ڕەتیان دەکەنەوە بە هەمان طەریقەی جەهمییەکان، بڕۆن لێیان بپرسن چی دەڵێن دەربارەی ئەو ئایەتانەی باسی إِستوائی الله دەکەن لەسەر عەرش بزانن هەمان تەئویلی جهم کوڕی صفوان ناهێننەوە کە إِستواء واتە إستولی، یاخود دەربارەی ئەو ئایەتانەی باسی دەست « الیَد

» دەکەن لێیان بپرسن، بزانن هەمان تەئویلی بشر المريسى ناهێننەوە لەوەی اليَد بە واتای رزق و نعمة و قدرة دێ!

دەربارەی ئایات و ئەحادیثی صیفات قسە لەگەڵ هەر ئەشعەرییەک بکەی لە عالمیانەوە هەتا نەزان هەموویان لەسەر یەک عەقیدە و مەنهەجن ئەویش تەئویلی صیفاتە، بۆ زیاتر وازحی بابەتەکە لێرەدا **(٤)** تەئویلاتی النووي دەهێنم کە یەکێکە لە فەقیهەکانی ئەشاعیرە و هەستاوە بە شەرح کردنی صحیحی مسلم، بزانن بەقەد نوکە دەرزییەک جیاوازی هەیە لەگەڵ تەئویلەکەی بشر المريسى جەهمی.

١- أبي هريره دەڵێ: کۆمەڵێک خەڵک پرسیاریان کرد لە ڕەسول الله ﷺ: یا ڕەسول الله، لە ڕۆژی قیامەتدا پەروەدگارمان دەبینین؟ ڕەسول الله ﷺ فەرمووی: « ئایا هەریەک لە ئێوە مانگ چواردە شەو بێ لێتان وون دەبێ و پێویست دەکات ئیزدحام دروست بکەن بۆ بینینی؟ ». ووتیان: نەخێر یا ڕەسول الله. فەرمووی: « خۆر کاتێک ئاسمان هەوری تێدا نەبێ وون دەبێ لێتان و پێویست دەکات ئیزدحام دروست بکەن بۆ بینینی؟ ». ووتیان: نەخێر یا ڕەسول الله. فەرمووی: « دەی ئێوەش بە دڵنیاییەوە لە قیامەتدا الله ﷻ دەبینن کاتێک حەشری خەڵکی دەکات، دەفەرموێ:

هەرکەسێک لە دونیا چی پەرستووە با شوێنی بکەوێ، ئیتر ئەوەی خۆری پەرستووە شوێنی خۆر دەکەوێ، ئەوەی مانگی پەرستووە شوێنی مانگ دەکەوێ، ئەوەی طاغوتانی پەرستووە شوێنی طاغوتان دەکەوێ، هەتا ئەم ئوممەتە دەمێنێتەوە لەگەڵ موونافیقەکانی ..... هەتا کۆتایی حدیثەکە» .

(... عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَزِيدَ اللَّيْثِيِّ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنهُ أَخْبَرَهُ أَنَّ نَاسًا قَالُوا لِرَسُولِ اللهِ ﷺ: يَا رَسُولَ اللهِ، هَلْ نَرَى رَبَّنَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «هَلْ تُضَارُّونَ فِي رُؤْيَةِ الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ؟». قَالُوا: لَا يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: «هَلْ تُضَارُّونَ فِي الشَّمْسِ لَيْسَ دُونَهَا سَحَابٌ؟». قَالُوا: لَا يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: «فَإِنَّكُمْ تَرَوْنَهُ كَذَلِكَ يَجْمَعُ اللَّهُ النَّاسَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَيَقُولُ: مَنْ كَانَ يَعْبُدُ شَيْئًا، فَلْيَتَّبِعْهُ، فَيَتَّبِعُ مَنْ كَانَ يَعْبُدُ الشَّمْسَ الشَّمْسَ، وَيَتَّبِعُ مَنْ كَانَ يَعْبُدُ الْقَمَرَ الْقَمَرَ، وَيَتَّبِعُ مَنْ كَانَ يَعْبُدُ الطَّوَاغِيتَ الطَّوَاغِيتَ، وَتَبْقَى هَذِهِ الْأُمَّةُ فِيهَا مُنَافِقُوهَا، فَيَأْتِيهِمُ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى فِي صُورَةٍ غَيْرِ صُورَتِهِ الَّتِي يَعْرِفُونَ، فَيَقُولُ: أَنَا رَبُّكُمْ، فَيَقُولُونَ: نَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْكَ هَذَا مَكَانُنَا حَتَّى يَأْتِيَنَا رَبُّنَا، فَإِذَا جَاءَ رَبُّنَا عَرَفْنَاهُ، فَيَأْتِيهِمُ اللَّهُ تَعَالَى فِي صُورَتِهِ الَّتِي يَعْرِفُونَ، فَيَقُولُ: أَنَا رَبُّكُمْ، فَيَقُولُونَ: أَنْتَ رَبُّنَا، فَيَتَّبِعُونَهُ».....) رواه مسلم | ٢٩٩

**النووي** له شەرحی ئەم حدیثەدا دەڵێ: دەربارەی قەولی ڕەسول الله ﷺ: « **فَيَأْتِيهِمُ اللَّهُ فِي صُورَةٍ غَيْرِ صُورَتِهِ الَّتِي يَعْرِفُونَ، فَيَقُولُ: أَنَا رَبُّكُمْ، فَيَقُولُونَ: نَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْكَ هَذَا مَكَانُنَا حَتَّى يَأْتِيَنَا رَبُّنَا، فَإِذَا جَاءَ رَبُّنَا عَرَفْنَاهُ، فَيَأْتِيهِمُ اللَّهُ تَعَالَى فِي صُورَتِهِ الَّتِي يَعْرِفُونَ، فَيَقُولُ: أَنَا رَبُّكُمْ، فَيَقُولُونَ: أَنْتَ رَبُّنَا، فَيَتَّبِعُونَهُ** ». بزانە ئەهلی عیلم سەبارەت بە ئایات و ئەحادیثی صیفات دوو قەولیان هەیە:

یەکەم: مەزهەبی زۆربەی سەلەف یاخود هەموویان: ئەوەیە قسە لەسەر ماناکەی ناکرێ، بەڵکو دەڵێن: واجبە لەسەرمان باوەڕمان پێی هەبێ، وە باوەڕمان وایە کە مانایەکی هەیە شیاوی گەورەیی الله تعالى بێ، لەگەڵ باوەڕی تەواومان کە الله تعالى هیچ هاوشێوەیەکی نییە، وە پاک و بێگەردە لەوەی بە جسم دابنرێ و بجوڵێی و مەکانی خۆی جێبهێڵێ و لە جهەیەک بێ، وە صیفاتەکانی وەک صیفاتی مەخلوقات نییە، ئەم قەولە مەزهەبی کۆمەڵێکیشە لە ئەهلی کەلام "واتە ئەشاعیرە"، هەندێک لە موحەقیقەکانیان هەڵیان بژاردووە و لەسەرینی، وە طەریقەیەکی سەلامەتە.

دووەم: مەزهەبی زۆربەی زۆری ئەهلی کەلامە: تەئویل دەکرێ بەو جۆرەی دەگونجێ و شیاوە، وە ڕێ پێدراوە تەئویلی بکرێ بۆ ئەو کەسانەی کە ئەهلی تەئویلن، شارەزان بە زمانی عەرەبی و قەواعدەکانی ئوصول و فروع، بە پێی ئەم قەول و مەزهەبە بێ، ئەوە دەبارەی قەولی ڕەسول الله ﷺ: « فَيَأْتِيهِمُ اللَّهُ ». الإِتيَان مەبەست لێی ئەوەیە خەڵکی الله ﷻ دەبینن، لەبەرئەوەی عادەتەن کەسێک ماوەیەک دیار نەبێ لە پێش چاوی خەڵکی ئەوە ناتوانرێ ببینرێ ئیللا بەو جۆرە نەبێ کە بێتە لایان، لێرەدا هاتن تەعبیر کراوە بە بینین بە شێوەی مەجاز نەک بە حەقیقی. وە وتراوە: الإِتیان کردارێکە لە کردارەکانی الله تعالی ناوی لێناوە إِتيان. وە وتراویشە : مەبەست لە « يَأْتِيهِمُ اللَّهُ» واتە هەندێک لە مەلائیکەی الله دێن.

قوله ﷺ: « فَيَأْتِيهِمُ اللَّهُ فِي صُورَةٍ غَيْرِ صُورَتِهِ الَّتِي يَعْرِفُونَ، فَيَقُولُ: أَنَا رَبُّكُمْ، فَيَقُولُونَ: نَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْكَ هَذَا مَكَانُنَا حَتَّى يَأْتِيَنَا رَبُّنَا، فَإِذَا جَاءَ رَبُّنَا عَرَفْنَاهُ، فَيَأْتِيهِمُ اللَّهُ تَعَالَى فِي صُورَتِهِ الَّتِي يَعْرِفُونَ، فَيَقُولُ: أَنَا رَبُّكُمْ، فَيَقُولُونَ: أَنْتَ رَبُّنَا، فَيَتَّبِعُونَهُ ». اعلم أَنَّ لأَهل العلم في أَحاديث الصفات وآيات الصفات قولين: أَحدهما وهو

مذهب معظم السلف أَو كلهم: أَنه لا يُتكَلَّم في معناها، بل يقولون: يُجب علينا أَن نؤمن بها، ونعتقد لها معنًى يليق بجلال الله تعالى وعظمته، مع اعتقادنا الجازم أَنَّ الله تعالى ليس كمثله شيء، وأَنه مُنَزَّه عن التجسيم والإِنتقال والتحَيُّز في جهة، وعن سائر صفات المخلوق. وهذا القول هو مذهب جماعة من المتكلمين، واختاره جماعة من محققيهم، وهو أَسلم.

والقول الثاني: وهو مذهب معظم المتكلمين: أَنها تتأَول على ما يليق بها على حسب مواقعها، وإِنما يسوغ تأْويلها لمن كان مِن أَهله، بأَن يكون عارفًا بلسان العرب وقواعد الأُصول والفروع، ذا رياضة في العلم، فعلى هذا المذهب يقال في قوله ﷺ: « فَيَأْتِيهِمُ اللَّهُ » أَنَّ الإِتيان عبارة عن رؤيتهم إِياه، لأَنَّ العادة أَنَّ من غاب عن غيره لا يمكنه رؤيته إِلا بالإِتيان، فعبرَّ بالإِتيان والمجيء هنا عن الرؤية مجازًا. وقيل: الإِتيان فعل من أَفعال الله تعالى سماه إِتيانًا. وقيل: المراد « بِيَأْتِيهِمُ اللَّهُ ». أَي يأْتيهم بعض ملائكة الله.

المنهاج شرح صحيح مسلم بن حجاج للنووي | **(٢٤/٣)**

ووتم: سەرنج بدەن چۆن لە هەردوو خاڵەكەدا خیلافی سەلەف دەكات و شوێن حەق نەكەوتووە و دەعوە بۆ باتڵ دەكات، هەرچی خاڵی یەكەمە

کاتێک دەڵێ: سەلەف قسە لەسەر ماناکەی ناکەن "لا يُتكَلَّم في معناها" بەو جۆرە نییە، بەڵکو سەلەف کاتێک ئایەت و حدیثی صیفات هاتبێ تەسلیم بوون پێی ظاهری ماناکەیان وەرگرتووە، بەڵام خۆیان لاداوە لە چۆنیەتییەکەی، کەچی النووی ئەشعەری دەڵێ مەزهەبی سەلەف ئەوە بووە قسەیان لەسەر مانای ئایات و ئەحادیثی صیفات نەکردووە!

**سفیان کوڕی عیینة** دەڵێ: هەر صیفاتێک الله ﷻ وەصفی خۆی پێکردبێ لە قورئاندا، چۆن دەخوێنرێتەوە ئەوە تەفسیر و ماناکەیەتی، نەدەوترێ چۆنە نەدەشوبهێنرێت.

قال إِسحاق بن موسى الأَنصاري، سمعت سفيان بن عيينة يقول: كُل ما وصف الله به نفسه في القرآن، فقراءته تفسيره لا كيف، ولا مثل.

كتاب الصفات للدارقطني | ٦٣ شرح أُصول اعتقاد أَهل السنة للالكائي | ٧٣٦

پاشان النووي لە درێژەی قسەکانیدا باسی إِنتقال و جهە دەکات ظاهری قسەکەی ئەوەیە دەبێ تەنزیهی الله ﷻ بکرێ لە صیفاتی نزول،

چونکه تەنەقولی تێدایە! لە کاتێکدا حدیثی صحیحمان هەیە لەسەر نزولی الله ﷻ لە هەموو شەوێکدا.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: « الله تبارک وتعالی هەموو شەوێک دادەبەزێتە ئاسمانی دونیا، کاتێک ئاخیر بەشی شەو دەمێنێ، دەفەرموێ: کێ دوعا دەکات هەتا وەڵامی بدەمەوە، کێ داوام لێدەکات هەتا پێی ببەخشم، کێ داوای لێخۆشبوونم لێدەکات هەتا لێی خۆشبم ».

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: { **يَنْزِلُ رَبُّنَا تَبَارَكَ وَتَعَالَى كُلَّ لَيْلَةٍ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا، حِينَ يَبْقَى ثُلُثُ اللَّيْلِ الْآخِرُ، يَقُولُ: مَنْ يَدْعُونِي فَأَسْتَجِيبَ لَهُ؟ مَنْ يَسْأَلُنِي فَأُعْطِيَهُ؟ مَنْ يَسْتَغْفِرُنِي فَأَغْفِرَ لَهُ؟** }.

رواه البخاري | ١١٤٥ ومسلم | ١٧٧٢ وأَبو داود | ١٣١٥ والترمذي | ٣٨٠٥ وابن ماجه | ١٣٦٦ والدارمي | ١٥٠٤ وأَحمد | ٧٥٩٢ والدارقطني في كتاب النزول | ٢٩ واللالكائي في شرح أُصول اعتقاد أَهل السنة | ٧٤٥

به هەمان شێوەش تەنزیهی خالق دەکات لە جهه و مەکان، لە کاتێکدا پێشتر بە ئایەت و حدیثی صحیح و ئەقوالی سەلەف ڕوونمان کردەوە الله ﷻ لە ئاسمانە لەسەر عەرش.

دەربارەی خاڵی دووەمیشی کە بە تەواوی ڕەوایەتی دەدات بە تەئویل، ئەگەر هاتوو کەسێک ئەهل بێ بە تەئویل و شارەزای زمانی عەرەبی بێ، جا لێرەدا وەک بشر المریسي دەست دەکاتە ڕەتکردنەوەی صیفات و دەڵێ: قەولی ڕەسول الله ﷺ « فَيَأْتِيهِمُ اللَّهُ » کردارێکە لە کردارەکانی الله ناوی ناوە إِتیان! یاخود مەبەست لێی ئەوەیە مەلائیکە دێن! وازحە صیفاتی إِتیان ڕەتدەکاتەوە پێی وایە الله ﷻ نایەت، بەڵکو مەلائیکە دێن یاخود فعلێکی الله ﷻ دێ کە مەخلوقە و ناوی لێناوە إِتیان! ئەوە ڕێک عەینی تەئویلی جەهمییەکانە.

دواتر سەیری ئەو لفظەی بکەن دەڵێ: ”وە ڕێ پێدراوە تەئویلی صیفات بکرێ بۆ ئەو کەسانەی کە ئەهلی تەئویلن، شارەزان بە زمانی عەرەبی_ وإِنما یسوغ تأویلها لمن کان مِن أَهله، بأَن یکون عارفًا بلسان العرب.“

ئەمە باتڵترین قسەیە بە چ دین و شەرعێک تەئویل سائغە بۆ کەسێک ئەهلی بێ لە کاتێکدا الله ﷻ ئەو قورئانە بە زمانێکی عەرەبی ڕوون دابەزاندووە دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّهُ لَتَنزِيلُ رَبِّ الْعَالَمِينَ * نَزَلَ بِهِ الرُّوحُ الْأَمِينُ * عَلَى قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ الْمُنذِرِينَ * بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ مُّبِينٍ﴾ الشعراء : ١٩٥-١٩٢ کاتێک ئەو قورئانە هێندە وازح و ڕوونبێ ئیتر چ پێویست دەکات تەئویلی صیفات بکرێ و لفظەکەی لەو مەبەستە لا بدرێ کە بۆی هاتووە؟! وە ئەهلی تەئویل کە بە حسابی خۆیان شارەزان بە لوغەی عەرەب بێن تەئویلی بکەن و صیفاتمان پێ بناسێنن!!

ئیجماع سابت بووە لەسەر تەرک کردنی تەئویل، ڕەسول الله ﷺ تەئویلی نەکردووە، هەموو صەحابە تەئویلیان نەکردووە، تابعین و ئەتباعی تابعین تەئویلیان نەکردووە، عولەمای ڕاسخین تەئویلیان نەکردووە، ئیجماع لەسەر تەرکی تەئویل دامەزراوە، وە الله ﷻ ئوممەتی ڕەسولەکەی لەسەر گومڕایی کۆ ناکاتەوە، هەموو ئەهلی سوننە لە قەدیمەوە هەتا ئێستا لەسەر ئەوەن ئەو صیفاتانە چۆن هاتوون بەو جۆرە وەردەگیرێن لەسەر ظاهیرەکەیان، تۆ کاتێک تەئویل بە ڕەوا دەزانی ئەوە زمانی حاڵت ئەوەیە تەئویل لە دوو حاڵەت بەدەر نییە، یان ئەوەیە ڕەسول

الله ﷺ، وە صەحابەکانیشی زانیویانە یاخود نەیانزانیوە، ئەگەر دەڵێی نەیانزانیوە، ئێ دین ڕەسول الله ﷺ هێناویەتی ئیتر چۆن دەکرێ غیری ئەو بیزانێ؟! دەکرێ بابەتێک پەیوەندی بە عەقیدەوە هەبێ الله ﷻ شاردبێتیەوە لە ڕەسولەکەی، بەڵام نیشانی ئەشاعیرەی دابێ!

یاخود ئەوەیە دەڵێی ڕەسول الله ﷺ لەگەڵ هاوەڵەکانی زانیویانە، بەڵام بێدەنگ بوون لێی، دەی شتێک ئەوان لێی بێدەنگ بووبن واجبە تۆش بێدەنگ ببی لێی، تەئویل یان ئەوەیە لە عەقیدە و دینە، دین بە تەئویل نەبێ کامڵ نابێ، یاخود لە دین نییە، هەرکەسێک دەعوای ئەوە بکات بەشێکە لە دین بە بێ تەئویل دین کامڵ نابێ، ئەی چی دەکات لە ئایەتی: ﴿ الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ ﴾؟ ئایا دین کاتێک کامڵ بووە پێش تەئویل یاخود دوای تەئویل کامڵ بووە و ئێوەی تەئویلچی هاتن لەو نەقصە تەواوتان کرد؟ ئەگەر لە دین بووایە، بەڵام ڕەسول الله ﷺ لەگەڵ صەحابەکانی قبوڵیان نە کردبێ، ئەوە دینیان بە کامڵی نە گەیاندووە کاتێک تەئویلیان شاردووەتەوە و دینەکەیان ناقص بووە هەتا تەئویلچییەکان کامڵیان کردووە! ئەمە قسەی موسڵمانان نییە و نابێ هیچ موسڵمانێک ئەوە عەقیدەی بێ، کاتێک تەئویل بەشێک بێ لە دین، کەچی

ڕەسول الله ﷺ بە ئوممەتەکەی نە گەیاندبێ، ئەوە خیانەتی لێکردوون کە ئەمری دینەکەی لێ شاردوونەتەوە، ئەی چی دەکەن لە ئایەتی: ﴿ يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ﴾؟ لازمی قسەتان ئەوەیە ڕەسول الله ﷺ ڕاستگۆ نەبووە لە گەیاندنی دیندا، ئەمەش کوفرە بە الله ﷻ وە ڕەسولەکەی ﷺ.

صیفاتەکانی الله ﷻ ڕێگای تێگەیشتن و گەیشتن پێیان لە ڕێی عەقڵەوە نابێ، چونکە عەقڵ صیفاتێک دەزانێ کە بینیبێتی یاخود هاوشێوەکەی بینیبێ، ئێ هیچ عەبدێک نییە توانیبێتی الله ﷻ ببینێ هەتا وەصفی چۆنیەتی صیفاتەکەی بکات و بیزانێ و وەصفی بکات بۆ خەڵکی، وە هاوشێوەشی نییە هەتا وەصفی صیفاتەکەی بچوێنرێ بە صیفاتی هاوشێوەکەی، ماوەتەوە صفاتەکانی الله ﷻ تەوقیفین وەستاون لەسەر بەڵگەی سەمعی واتە ئەوەی دەلیلی لەسەر هاتووە لە قورئان و حدیث، ئەوەی بەڵگەی لەسەرهاتووە ناوی صیفاتەکانە نەک چۆنیەتییەکەیان، کەواتە واجبە لەسەر موسڵمانان لەو حاڵەدا بوەستن باوەڕیان بە هەموو صیفاتەکان هەبێ بە بێ گەڕان و داوا کردنی چۆنیەتییەکەیان.

٢- پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەو کەسانەی عادل و دادگەرن لە ڕۆژی قیامەتدا لەسەر میمبەری نورن لای دەستە ڕاستی الله ﷻ، وە هەردوو دەستی الله ڕاستن، ئەو کەسانەن عادلن لە حوکمدا لە نێوان ئەهلەکانیان و ئەوانەشی لە ژێر دەستیاندان.

حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ، وَزُهَيْرُ بْنُ حَرْبٍ، وَابْنُ نُمَيْرٍ، قَالُوا: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ عَمْرٍو -يَعْنِي ابْنَ دِينَارٍ- عَنْ عَمْرِو بْنِ أَوْسٍ، عَنْ عَبْدِاللَّهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ ابْنُ نُمَيْرٍ: وَأَبُو بَكْرٍ: يَبْلُغُ بِهِ النَّبِيَّ ﷺ. وَفِي حَدِيث زُهَيْرٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: « **إِنَّ الْمُقْسِطِينَ عِنْدَاللهِ عَلَى مَنَابِرَ مِنْ نُورٍ عَنْ يَمِينِ الرَّحْمَنِ عَزَّ وَجَلَّ، وَكِلْتَا يَدَيْهِ يَمِينٌ، الَّذِينَ يَعْدِلُونَ فِي حُكْمِهِمْ وَأَهْلِيهِمْ وَمَا وَلُوا** ».

رواه مسلم | ٤٧٢١

**النووی** لە شەرحی ئەم حدیثەدا دەڵێ: قەولی ڕەسول الله ﷺ: « **عَنْ يَمِينِ الرَّحْمَنِ** ». ئەوە لە حدیثەکانی صیفاتە، لە سەرەتای دەست پێکردنی شەرح کردنی ئەم کتێبە ئاماژەمان پێدا کە عولەما ئیختلافیان هەبووە تیایدا، هەیان بووە وتوویەتی: باوەڕمان پێی هەیە قسە ناکەین لەسەر

تەئویل کردنی، وە ماناکەشی نازانین، بەڵکو پێیان وایە ظاهرەکەی بەو جۆرە نییە کە هاتووە، وە مانایەکی هەیە کە شیاوە بە زاتی الله تعالی، ئەمە مەزهەبی جمهوری سەلەف و کۆمەڵێک لە ئەهلی کەلامە.

وە قەولی دووەمیان: تەئویل دەکرێ بەو جۆرەی شیاوە، ئەمەش قەولی جمهوری ئەهلی کەلامە.

ئەمما قەولی ڕەسول الله ﷺ: « وَكِلْتَا يَدَيْهِ يَمِينٌ ». ئاگادار بن مەبەست لە دەست ئەندام نییە، الله پاکە لەوە موستەحیلە ئەوە بدرێتە پاڵ الله تعالی.

أَما قوله ﷺ: « عَنْ يَمِينِ الرَّحْمَنِ » فهو من أَحاديث الصفات، وقد سَبَقَ في أَول هذا الشرح بيان اختلاف العلماء فيها، وأَنَّ منهم مَن قال: نؤمن بها ولا نتكلَّم في تأَويله، ولا نعرف معناه، لكن نعتقدُ أَنَّ ظاهرها غيرُ مُراد، وأَنَّ لها معنى يليق بالله تعالى، وهذا مذهب جماهير السلف وطوائف من المتكلمين. والثاني: أَنها تُؤَوِل على ما يَليق بها، وهذا قول جمهور المتكلمين.

أَما قوله ﷺ: « وَكِلْتَا يَدَيْهِ يَمِينٌ ». فتنبه على أَنَه ليس المُراد باليمين جارحَة، تعالى الله عن ذالک، فإِنها مُستحيلة في حَقِّه سبحانه وتعالى.

المنهاج شرح صحيح مسلم بن حجاج للنووي **(٢٢٧/١٢)**

ووتم: ئەو بەشەی ووتەکەی دەڵێ: "لە سەرەتای ئەم شەرحەدا ئاماژەمان بۆ ئیختلافی عولەما کردووە" مەبەستی لەو قەولەی پێش ئێستایەتی شەرحی ئەو حدیثە دەکات کە ئیمامی مسلم لە کتاب الإیمان بە ژمارە **(٢٩٩)** هێناویەتی کە پێشتر هێنام.

دواتر واللە سەلەف لە بابەتی صیفاتدا هیچ خیلافێک نەبووە لە نێوانیاندا، لە فقهدا دەگونجێ خیلاف، بەڵام لە عەقیدەدا ولله الحمد هەموویان لەسەر یەک مەنهەج بوون، خیلاف لە بابەتی عەقیدەدا ممنوعە جا وەرە مەسئەلەکە صیفاتی اللە ﷻ بێ! پاشان وەک سەلەفە ئەشعەرییەکانی پێش خۆی هەرکات بیانەوێ صیفاتێک ڕەتبکەنەوە دەڵێن: ناکرێ فڵان صیفات سابت بکەین، چونکە جارحە!

٣- پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: « آدم و موسی موناقەشە دەکەن، موسی دەڵێ: ئەی ئادەم، تۆ باوکانی بێ هیوات کردین، بوویتە هۆکاری

دەرکردنمان لە بەهەشت. ئادەم ووتی: تۆ ئەی موسى ئەو کەسەی کە الله ﷻ جیای کردیتەوە لە باقی پێغەمبەرانی تر، ڕاستەوخۆ بەبێ وەحی قسەی لەگەڵ کردی، بە دەستی خۆی تەوراتی بۆ نوسیت، لۆمەی من دەکەی لەسەر کردەوەیەک ئەنجاممدا کە الله لەسەری نوسیووم پێش چڵ ساڵ لە دروست بوونم؟ ». پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: « پێغەمبەر ئادەم حوجەی موسى پێغەمبەری نەهێشتەوە، حوجەی موسى پێغەمبەری نەهێشتەوە » .

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «**احْتَجَّ آدَمُ وَمُوسَى، فَقَالَ مُوسَى: يَا آدَمُ، أَنْتَ أَبُونَا خَيَّبْتَنَا، وَأَخْرَجْتَنَا مِنَ الْجَنَّةِ. فَقَالَ لَهُ آدَمُ: أَنْتَ مُوسَى، اصْطَفَاكَ اللَّهُ بِكَلَامِهِ، وَخَطَّ لَكَ بِيَدِهِ، أَتَلُومُنِي عَلَى أَمْرٍ قَدَّرَهُ اللَّهُ عَلَيَّ قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَنِي بِأَرْبَعِينَ سَنَةً**؟ ». فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: « **فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى، فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى** ». وَفِي حَدِيثِ ابْنِ أَبِي عُمَرَ، وَابْنِ عَبْدَةَ قَالَ أَحَدُهُمَا: « **خَطَّ** ». وَقَالَ الْآخَرُ: « **كَتَبَ لَكَ التَّوْرَاةَ بِيَدِهِ** ».

رواه البخاري | ٣٤٠٩ ومسلم | ٦٧٤٢ وأبو داود | ٤٧٠١ والترمذي | ٢١٣٤ وابن ماجه | ٨٠

**النووی** له شەرحی ئەم حدیثەدا دەڵێ: قەولی ڕەسول الله ﷺ: «اصْطَفَاكَ اللَّهُ بِكَلَامِهِ، وَخَطَّ لَكَ بِيَدِهِ». دەربارەی صیفاتی دەست دوو قەول هەیە هەروەک لە کتاب الإیمان و بابەکانی تر کە ئەحادیثی صیفاتی تێدایە هێناومە: یەکەمیان: باوەڕمان پێیەتی و تەئویلی ناکەین لەگەڵ ئەوەدا دەزانین کە مەبەست لێی ظاهرەکەی نییە بەڵکو شتێکی ترە. دووەمیان: مەبەست لە الید دەست نییە، بەڵکو تەئویل دەکرێ بە قودرە.

قوله: « اصْطَفَاكَ اللَّهُ بِكَلَامِهِ، وَخَطَّ لَكَ بِيَدِهِ » في اليد هنا مذهبان السابقان في كتاب الإيمان ومواضع في أَحاديث الصفات: أَحدهما الإِيمان بها ولا يتعرض لتأويلها مع أَنَّ ظاهرها غير مُراد. والثاني: في تأويلها على القدرة.

المنهاج شرح صحيح مسلم بن حجاج للنووي | **(٢١٣/١٦)**

٤- پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: دڵی نەوەکانی ئادەم لە نێوان دوو پەنجەن لە پەنجەکانی الله ﷻ وەک یەک دڵ، هەرچۆنێک ویستی لەسەربێ دەیان جوڵێنێ و وەریان دەگەڕێنێ ». پاشان فەرمووی: « اللهم جوڵێنەر و بەکارخەری دڵەکان، دڵمان بەکاربێنە لە طاعەتەکەتدا ».

...حَدَّثَنَا حَيْوَةُ، أَخْبَرَنِي أَبُو هَانِئٍ، أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا عَبْدِالرَّحْمَنِ الْحُبُلِيَّ، أَنَّهُ سَمِعَ عَبْدَاللَّهِ بْنَ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ يَقُولُ: إِنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: « إِنَّ قُلُوبَ بَنِي آدَمَ كُلَّهَا بَيْنَ إِصْبَعَيْنِ مِنْ أَصَابِعِ الرَّحْمَنِ كَقَلْبٍ وَاحِدٍ، يُصَرِّفُهُ حَيْثُ يَشَاءُ ». ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: « اللَّهُمَّ مُصَرِّفَ الْقُلُوبِ، صَرِّفْ قُلُوبَنَا عَلَى طَاعَتِكَ ».

رواه مسلم ا ٦٧٥٠

النووی له شەرحی ئەم حدیثەدا دەڵێ: قەولی ڕەسول الله ﷺ: « إِنَّ قُلُوبَ بَنِي آدَمَ كُلَّهَا بَيْنَ إِصْبَعَيْنِ مِنْ أَصَابِعِ الرَّحْمَنِ كَقَلْبٍ وَاحِدٍ، يُصَرِّفُهُ حَيْثُ يَشَاءُ ». ئەمە لە ئەحادیثی صیفاتە وەک تازە تێپەڕی دوو قەول لەسەری هەیە: یەکەمیان: باوەڕمان پێیان هەیە و تەئویلی ناکەین وە ناشزانرێ ماناکەیان چییە، باوەڕمان پێیان هەیە کە حەقە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا مەبەست لێی ظاهرەکەیان نییە، بەڵکو مەبەستی لە شتێکی ترە، الله تعالى فەرموویەتی: ﴿ لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ ﴾.

دووەمیان: تەئویل دەکرێ بەو شێوازەی دەگونجێ و شیاوە، لەسەر ئەم قەولەیان دەوترێ: مەبەست لە الید دەستی حەقیقی نیە، بەڵکو مەجازە،

هەروەک چۆن دەوترێ: فڵانە کەس لە ژێر دەستمدایە، خۆ مەبەستی ئەوە نییە لە ناو دەستیدابێ، بەڵکو مەبەست ئەوەیە لە ژێر قودرەت و دەسەڵاتیدایە.

قوله ﷺ: « إِنَّ قُلُوبَ بَنِي آدَمَ كُلَّهَا بَيْنَ إِصْبَعَيْنِ مِنْ أَصَابِعِ الرَّحْمَنِ كَقَلْبٍ وَاحِدٍ، يُصَرِّفُهُ حَيْثُ يَشَاءُ ». هذا من أَحاديث الصفات وفيها قولان السابقان قريبًا: أَحَدهما الإِيمان بها مِن غير تَعرض لتأْويل ولا معرفة المعنى، بل يؤمن بأَنها حَقٌّ، وأَنَّ ظاهرها غير مُراد قال الله تعالى: ﴿ لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيءٌ ﴾. والثاني: يَتأَول بحسب ما يليق بها، فعلى هذا: المُراد المجاز، كما يُقال: فلان في قبضتي وفي كَفي، لا يُراد بِهِ أَنَّه حالٌ في كَفِه، بل المُراد تحت قُدرتي.

المنهاج شرح صحيح مسلم بن حجاج للنووي | **(٢١٧/١٦)**

ووتم: قسەم لەسەر خاڵی دووەمی نییە، چونکە ڕوون و وازحە تەئویلێکی خاڵصە، قسەم لەسەر خاڵی یەکەمیەتی کە بە حسابی خۆی ئیثباتی صیفاتە لەسەر مەنهەجی سەلەف! کەچی لەوەشدا وانییە و خیلافی سەلەفە، بەڵکو لێرەشدا هەر پەکخستنی صیفاتە بە شێوەی تەفویز "تفويض" سەلەف وتوویانە ظاهرەکەی وەردەگرین صیفاتەکە لەسەر چ

شێواز و کەلیمەیەک هاتبێ ئەوە ماناکەیەتی، بەڵام النووی دەڵێ: "نازانرێ ماناکەی چییە، مەبەست لێ ظاهرەکەی نیە"

ئەوە مشتێکە لە خەرمانی تەئویلاتی النووی لە شەرحەکەیدا لەسەر صحیحی مسلم، پێم خۆشە بچن بە چاوی خۆتان تەماشای بکەن لە یەکەم لاپەڕەیەوە هەتا کۆتا لاپەڕەی هەر حدیثێکی صیفات دێتە بەردەستی بە تەئویلەکەی جهم کوڕی صفوان و بشر المریسی ڕەتیدەکاتەوە، کەچی لە ئاخیریشدا هەر ئیمامە! خاک بەسەر جهم و بشر چۆن ناویان خراپ دەرچووە! والله العظیم ئەو قەولانەی نەووی ئەگەر بە ناوی بشر المریسی بڵاوبکرێنەوە خەڵکی لەعنەت دەنێرن بۆ خاوەن قەولەکە واتە بشر، بەڵام کاتێک دەڵێی ئەوە نەووی وا دەڵێ خەڵکی جاهل و موعەشعر دەڵێن ئەوە ئیمامی نەوەوییە !

هەتا بزانن قسەی ئەشاعیرە لە یەکەمیانەوە هەتا ئاخیریان، لە نەرم و شلیانەوە هەتا غولاتیان، لە فەقیهیانەوە هەتا جاهیل و سەفیهیان، لە عاقڵیانەوە هەتا بێ عەقڵیان یەک قسەیە و جیاوازی تێدا نییە، ئەویش تەعطیلی جەهمییەکانە، بۆ ئەم قسەیەشم بەڵگەم پێیە ئێستا ڕوونی

دەکەمەوە بۆتان ئەوەی النووی و غیری ئەویش دەیڵێن و دەیکەن هەمان ووتە و فیعلی جەهمییەکانە.

**عثمان کوڕی سعید الدارمی** لە کتابی النقض علی المریسی کاتێک دێتە سەر صیفاتی دەست دەڵێ: ئەی مریسی دەعوا کردنت لە قەولی الله تعالی: ﴿ بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ ﴾. بەلای تۆوە الید واتە ڕزق، پێت وایە تەفسیری دوو دەست واتە: دوو ڕزق، ڕزقێکی فراون و ڕزقێکی لێخۆش بوو، ڕزقێکی حەڵاڵ و ڕزقێکی حەڕام.

قەولی: ﴿ يَدَاهُ ﴾. بەلای تۆوە واتە: ڕزقەکانی بەم تەئویلەشت دەرچووی لە هەموو حەد و لوغەی عەرەب، شتێکت نەوتووە هیچ فەقیهێک لە فوقەها لێی تێبگات، دەرچووی لە هەموو لوغەی عەرەب و عەجەم، پێمان بڵێ ئەمەت لە کێوە وەرگرتووە لە ئەهلی عیلم لە عەرەب و فارس؟ تۆ هاتووی شتێکت هێناوە باتڵ و مەحاڵە، نە عەرەب لێی تێدەگات نە عەجەم، وە ناشزانین کەسێک هەبێ لە ئەهلی عیلم و مەعرفە پێش تۆ ڕێی چووبێتە تەفسیری لەم جۆرە.

وأَمَّا دعواک أَيها المرسي في قول الله تعالى: ﴿ بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ﴾. فزعمتَ أَنَّ تفسيرها عندک: رِزقَاه، رِزقُ مُوَسَّع، ورِزقُ مغفور، ورزقُ حلال، ورِزقُ حرام.

فقوله: ﴿ يَدَاهُ ﴾ عندک: رِزقَاهُ فقد خَرَجْتَ بهذا التأويل مِن حَدِّ العربية كُلِّها أَو مِن حَدِّ ما يفقهه الفقهاء، ومِن جميع لُغات العرب والعجم، فَمِمَّن تَلَقَّتَه، وعَمَّن رويته مِن أَهل العلم بالعربية والفارسية؟ فإِنک جِئتَ بِمُحَال، لا يعقله أَعجمي ولا عربي ولا نعلم أَحدًا مِن أَهلِ العلم والمعرفة سَبَقَکَ إِلى هذا التفسير.

نقض عثمان بن سعيد على المريسي ١ صـ: ١٧٠

دووباره دەڵێ: **عاصم الجحدرى** له تەفسیرى قەولى الله ﷻ: ﴿ مَا مَنَعَكَ أَن تَسْجُدَ لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَيَّ ﴾. دەڵێ: مەبەست له کەلیمەی ﴿بِيَدَيَّ ﴾ دوو دەستە کە الله ﷻ ئادەمی بە هەردوو دەستی خۆی دروست کردووە.

دوای ئەمە ئیتر کێ لا دەکاتەوە بە لای تەئویلی ئەم مریسی ـیە، وە واز لە تەفسیری ئەو عولەما صاڵحانە دێنێ بۆ تەفسیری المریسی؟

تەماشاکەن ئەگەر تەئویلی دەست بکەن بە نیعمەت، ئایا دەکرێ و دەگونجێ تەئویلی قەولی ڕەسول الله ﷺ: « **يَطوِي اللهُ السَّمَوَاتِ بِيَمِنيهِ يَومَ الْقِيَامَةِ** ». بکرێ بوترێ الله ﷻ ئاسمانەکان بە نیعمەتەکەی دەپێچێتەوە؟! یاخود قەولی ﷺ :« **الْمُقْسِطُونَ عَلَى مَنَابِرَ مِن نُورٍ عَن يَمِينِ الرَّحْمَنِ** ». دەکرێ بوترێ: هەردوو نیعمەتەکەی الرحمن یەک دانەیە؟! ئەمە قەبیحترین مەحاڵ و قەبیحترین گومڕاییە، لەگەڵ ئەوەشدا گاڵتەجاڕی و پێکەنیناوییە، هیچ کەسێک نەبووە لە عەرەب و عەجەم پێش ئێوە بکەوێ لەم تەئویلەدا.

وحدثنا هُدبَة بن خالد، حدثنا سلام بن مِسكين، عن عاصم الجحدري، في قوله: ﴿ مَا مَنَعَكَ أَن تَسْجُدَ لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَيَّ ﴾. قال: بِيَدَيهِ.

فمن يلتفت بعد هذا إِلى تأويل هذا المريسي، ويَدَعُ تأويل هؤلاء الأَئمة العلماء الصالحين؟ أَرأَيتم إِذا تأَولتم أَنَّ يَدَ الله نعمته، أَفَيَحسنُ إِذا تأَولتم في قول رسول الله ﷺ: « **يَطوِي اللهُ السَّمَوَاتِ بِيَمِنيهِ يَومَ الْقِيَامَةِ** ». أَنه يطويها بنعمته، أَم قوله: « **الْمُقْسِطُونَ عَلَى مَنَابِرَ مِن نُورٍ عَن يَمِينِ الرَّحْمَنِ**». وكِلتا نعمتَي الرحمن نِعمَةٌ واحدة؟

هذا أَقبح مُحالٍ، وأَسمَجُ ضلالٍ، وهو مع ذالک ضُحکَةٌ وسُخريةٌ، ما سبَقکم إِلى مثلها أَعجمي أَو عربي.

نقض عثمان بن سعيد على المريسي ا صـ: ٢٠٢

وەک بینیتان قسەکانی بشر المریسی جەهمی لەگەڵ قسەکانی النووی ئەشعەری، دوو ڕووی یەک دراون هەڵقوڵاوی یەک سەرچاوەیە ئەویش تەعطیلەکەی جهم کوڕی صفوانە، فەرق و جیاوازی نێوانیان هێندەی فەرق و جیاوازی ئەم دیو لەگەڵ ئەو دیوی دراوێکی ئاسنە.



## بەراوردی نێوان عەقیدەی موعتەزیلە و ئەشاعیرە

یەکێک لەو فێڵانەی ئەشاعیرە دەیگرنەبەر ئەوەیە خۆیان بە ئەهلی سوننە ناو دەهێنن و دەست نیشان دەکەن، وە زۆربەی کات ئەو حدیثانەش دێنن کە ئەهلی سوننە دەیان هێنن و ڕوایەتیان کردوون، بەم فێڵە دڵی عەوامی خەڵکی ڕاو دەکەن، بەڵام لە حەقیقەتدا هەر ئەشاعیرەن و تەعطیلکەرانی صیفاتەکانی ڕەب العالمین ﷻ، هەرچەندە حدیثەکانی صیفاتیش بهێنن لە کتێبەکانیاندا، بەڵام بە بتی تەئویل ڕەتیان دەکەنەوە، بۆیە یەکێک لە تەریقەی ئەهلی بیدەع فێڵ و تەدلیسە بۆ ڕاوکردنی دڵی خەڵکانی تر.

عادەتەن وایە هیچ خاوەن عەقیدەیەکی باتڵ و لارو چەوت بە خۆی نالێ گومڕا و شەقی، بەڵکو خۆی بە ئەهلی حەق دەناسێنێ هەتاوەکو خەڵک لە خۆی کۆبکاتەوە و دەعوەیان بۆ ئەوە بکات کە خۆی لەسەریەتی، وە ئەگەر بێی سەیری کتێبەکان و مەجلیسەکانیان بکەی ڕاستەوخۆ بەیانی عەقیدەیان ناکەن، بەڵکو زۆربەی کات حدیث ڕیوایەت دەکەن، بەڵام دواتر لەو لفظە لای دەدەن کە حدیثەکە لەسەری هاتووە یاخود تەئویلی دەکەن بۆ عەقیدە باتڵەکەیان، یاخود قەولی سوننە دەهێنن

هەتا عەوام گومانی باشیان پێ ببەن، دواتر دەکەونە ڕاوکردنیان و ژەهراوی کردنی دڵ و جەستەیان.

**مفضل کوڕی مهلهل** دەڵێ: ئەگەر لە مەجلسی بیدعەچییەک دابنیشی ئەویش ڕاستەوخۆ بیدعەکەی خۆیت پێ بناسێنێ و بانگت بکات بۆی ئەوە حەزەری لێدەکەیت و لێی ڕادەکەی، بەڵام لێزانانە هەوڵت لەگەڵ دەدات سەرەتا حدیثەکانی ئەهلی سوننەت بۆ دەخوێنێتەوە، پاشان بیدعەکەیت پێ دەناسێنێ و تووشت دەکات، لەوانەیە بچێتە دڵتەوە، ئیتر چۆن و چ کاتێک لە دڵت دەردەچێ؟!

عن نوفل بن مُطهّر، قال: قال مُفضَّل بن مُهَلهَل: لو كان صاحب البدعة إِذا جلست إِليه رماك ببدعته حذرتَه، وفررتَ منه، ولكنَّه يُحَدِّثُك بأَحاديث السُّنةِ في بَدوِ مجلسه، ثم يُدخلُ عليك بدعته، فلعلَّها تلزمُ قلبك، فمتى تخرجُ من القلب!؟

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٤٢٥

ئەمە ڕێک حاڵی ئەشاعیرەیە لە لایەک دەڵێن ئێمە ئەهلی سوننەین و صیفاتین، کەچی لەو لاوە هەرچی صیفاتە ڕەتیدەکەنەوە کاتێک دێی

لەگەڵیان دادەنیشی و قسەکانیان ووردە دەکەیتەوە هەمان قەولی موعتەزیلەکانە.

أبو النصر السجزی دەڵێ: موعتەزیلە دەڵێن: ناتوانرێ الله تعالی ببینرێ بە چاو، لە پێش چاو بینراو نییە و ناکەوێتە پێش چاو.

ئەشعەری دەڵێ: بینراوە و دەکەوێتە پێش چاو، بەڵام بە چاو نابینرێ ڕووبەڕوو، بەم جۆرە خیلافی موعتەزیلە نیشان دەدات، لە کاتێکدا لە ئەصڵدا موافقیانە لە ڕەتکردنەوەی بینین.

موعتەزیلە دەڵێن: دروست نییە و نابێ وەصفی الله بکرێ بەوەی قسە دەکات، چونکە کەلام پێکهاتووە لە حەرف و صەوت.

ئەشعەری دەڵێ: دروستە و دەکرێ وەصفی الله بکرێ کە قسە دەکات، بەڵام کەلامەکەی صەوت و حەرف نییە، ئەوەی موعتەزیلە ڕەتیان کردەوە ئەمیش ڕەتیکردەوە، شتێکی سابت کرد کە عەقڵ نایبڕێ، چۆن دەکرێ کەلام وجوودی هەبێ، بەڵام پێکنەهاتبێ لە صەوت و حەرف؟! وای نیشان دەدا خیلافی هەیە لەگەڵیان، لە کاتێکدا لە ئەصڵدا موتەفیقە لەگەڵیان.

موعتەزیلە حدیثی المعراج بەرزبوونەوەی ڕەسول اللە ﷺ بۆ ئاسمان ڕەتدەکەنەوە.

ئەشعەری دەڵێ: حدیثی المعراج بەرزبوونەوە سابتە، بەڵام نابێ وەصفی اللە بکرێ بەوەی لەسەرەوەیە لە بەرزی، سەرەتا خیلافی موعتەزیلە نیشان دەدات، بەڵام لە ئەصڵدا موافیقە لەگەڵیان و حدیثی المعراج بە درۆ دەخاتەوە.

موعتەزیلە دەڵێن: سورەت و ئایەتەکانی قورئان مەخلوقن.

ئەشعەری دەڵێ: قورئان کەلامی اللە ـیە، بەڵام سورەت و ئایەتەکان کەلامی اللە نین، بەڵکو عیبارەتن لە کەلامی اللە کە مەخلوقە.

موافیقە لەگەڵیان لەوەی قورئان مەخلوقە زیاد لەوانیشی وتووە کە سورەت و ئایەتەکان لە قورئان نین، وە کەلامی اللە ﷻ نین، لە مەزهەبی ئەشاعیرەدا قورئان مەخلوق نییە، بەڵام موتەفیقن کە سورەت و حەرفەکانی مەخلوقن، ئەگەر حەرف و سورەتەکانی مەخلوق بن، ئەوە ناکرێ بوترێ قورئان مەخلوق نییە، کەواتە دەڵێن مەخلوقە.

قال السجزي: فإِنَّ المُعتزلة قالت: لا تجوز رُؤيةُ الله تعالى بالأَبصار، وأَنَّه ليس بِمَرْئِيٍّ.

وقال الأَشعري: هُوَ مَرْئِيٌّ، ولا يُرى بالأَبصارِ عن مُقابَلَةٍ، فأَظهَرَ خلافهم، وهُوَ موافق لهم.

وقالت المُعتزلة: لا يجوز أَن تُوصَف ذات اللهِ بالكلام، ولا كلام إِلَّا ما هو حرف وصوت.

وقال الأَشعري: يَجِبُ وصْفُ ذاته سبحانه بالكلام، وليس بحرفٍ، ولا صوتٍ. فنفى ما نفته المُعتزلة، وأَثبتَ ما لا يُعقَل، فهُوَ مُظهر خِلافَهم، موافق لهم في الأَصل.

وأَنكرَت حديثَ المعراج .

وقال الأَشعري: إِنَّه ثابت، ثم قال: الله لا يجوز أَن يوصف أَنَّه فَوق، فكذَّبَ بما في حديث المعراج، فصَار موافقًا لهم مع إِظهاره الخِلاف.

وقالت المُعتزلة: السُّوَر والآيُ مخلوقة، وهِي قرآن مُعجِز.

وقال الأَشعري: القرآن كلام الله سبحانه، والسُّوَر والآيُ ليست بكلام الله، وإِنَّما هي عبارة عنه، وهيَ مخلوقة.

فوافقهم في القول بخلقها، وزاد عليهم بأَنها ليست قرآنًا، ولا كلام الله سبحانه. فإِن زعموا أَنهم يُقِرُّنَ بأَنها قرآن. قيلَ لهم: إِنمَا يُقِرُّنَ بذالک على وجه المجاز، فإِنَّ من مذهبهم أَنَّ القرآن غير مخلوق، وأَنَّ الحروف مخلوقة، والسُّوَر حروف بالاتفاق، مَنْ أَنكر ذالک لم يُخاطب.

وإِذا كانت حروفًا مخلوقةً، لم يَجُزْ أَن يكونَ قرآنًا غير مخلوقٍ.

الرد على من أَنكر الحرف والصوت للسجزى ا صـ : ٥٣-٥٤

بەهەمان شێوەی **السجزى إبن الحنبلى** ـش بەراوردی نێوانیان دەكات كە قەولی ئەشاعیرە هاوتا و موتابیقی قەولی موعتەزیلەیە. دەڵێ: موعتەزیلە دەڵێن: ئەم قورئانە عەرەبییە پێكهاتووە لەو حەرف و كەلیمات و سورەتانەی كە الله دایبەزاندووە بۆ محمد، هیچ قورئانێكمان نییە ئەوە نەبێ، وە الله هیچ كەلامێكی تری نییە ئەوە نەبێ، بەڵام ئەم قورئانەی دروست كردووە لە ناو مەخلوقێكی تردا.

ئەشاعیرە دەڵێن: ئەم سەد و چواردە سورەتەی قورئان، زمانێكی عەرەبی مەخلوق و داهێنراوە، كەلامێكی قەدیم نیە، كەلامی الله نییە، موافەقەی موعتەزیلەن لەوەدا قورئان مەخلوقە، تەنانەت لەوان زیاتریش دەڵێن لە ئینكاركردنی كە تاكە كەلامی الله نییە، بەڵكو كەلامی تریشی

هەيە، ئەویش ئەوەیە کەلامێکە لە نەفسی خالقدایە دانەبەزیوە و دانابەزێ "معنی قائم بالنفس" دانەبەزیوەتە سەر پێغەمبەرمان و هیچ پێغەمبەرێکی تر، وە لوغە نییە، وە پێکنەهاتووە لە ئایات و کەلیمات و حەرف.

قال إِبن الحنبلي: المُعتزلة قالوا: هذا القرآن العربي الذي هو سُوَرٌ وحُروف وآياتٌ وكلماتٌ هُو الذي أَنزله الله على محمدٍ، وليس لنا قرآن غيره، ولا للهِ كلام غيره، لكنه مخلوق مُحدَثٌ خلقه في غيره.

وقالت الأَشعرية: هذه المائة وأَربعَ عشرة سُورة التي هي سبعَةٌ أَسباع وثلثون جُزءًا، لُغةٌ عربيةٌ مخلوقةٌ مُحدثةٌ، وليست قديمةً، ولا بكلام الله، فوافقوا المُعتزلة في أَنَّه مخلوق، وزادوا عليهم بجحده، وأَنَّه ليس بكلام، بل لله كلامٌ غير هذا، وهُوَ معنى قائم في النَّفس لم ينزل على نبينا ولا غيره، وليس بِلُغة ولا بآيات ولا حروفٍ ولا كلماتٍ.

الرسالة الواضحة لابن الحنبلي ا صـ : ٤٧٤

**إبن عقيل** دەڵێ: قەولی ئەشاعیرە کە دەربارەی قورئان دەڵێن قورئان کەلامی اللە ـیە، بەڵام قەدیمە لای خۆیەتی دانەبەزیوە ئەوە ڕازاندنەوەی گومڕایی و باتڵە خەڵکی پێدەخەڵەتێنن، ئەنا گومانی تێدا نییە قورئان بە

لايانەوە مەخلوقە، بۆ عولەما کەشف بووە تێگەیشتن لەم قەولەیان، ئەشاعیرە هەنگاوێک دێنە پێشەوە بەرەو موعتەزیلە، وە ئازایەتی ئەوەشیان نییە بڵێن موعتەزیلەین، وە هەنگاوێک دەچنەوە دواوە ڕووەو ئەهلی حدیث دەچن بۆ ئەوەی عەقیدەی خۆیانی پێبشارنەوە، ئەگەر لێیان بپرسین قەول و مەزهەبتان چییە دەربارەی قورئان دەڵێن قورئان کەلامێکی قەدیمە مەخلوق نییە، وە ئەگەریش بڵێین قورئان چییە ئایا ئەو سورەت و ئایەتانە نییە کە لە لە موصحەف نوسراوە؟ ئایا ئەوە نییە کە لە دڵی حافظ قورئانەکاندایە؟ ئایا ئەوە نییە کە خەڵک دەیخوێنێتەوە و دەبیستریٚ؟ دەڵێن: ئەوەی دەیڵێن و ئیشارەتتان بۆی کرد حیکایەتێکە عیبارەت دەکات لە قورئان. ئەمما قورئان ئەوە کەلامێکە لە نەفسی الله ﷻ دەرنەچووە و مەخلوقات هەستیان پێی نەکردووە، تەماشاکەن ئەی کۆمەڵی موسڵمانان بەر ڕەحمەتی الله بکەون سەرنج بدەن چۆن قەولی موعتەزیلەیان هێناوە لە ڕوویەکەوە دەیهێنن کە موخالەفەی ڕوویەکەی تری دەکات، وە گوێم بۆ بگرن چۆن دەعواکەیان پووچەڵ دەکەمەوە و عەقیدەکەیانتان بۆ بەیان دەکەم ببینن دەربارەی قورئان کەوتوونەتە چ گومڕاییەک کە گومانی تێدا نییە خیلافی قورئان و کەلامی الله قسە دەکەن.

قال أَبو الوفاء إِبن عقيل: وقولهم القديم عنده بذاته إِنَّما هي زَخاريف لَبَسوا بها ضلالتهم وإِلا فالقرآن عندهم مخلوق لا مَحالة. قد انكشف للعلماء فَهم هذه المقالة يَقدمون رِجلاً نحو الإِعتزال فلا يَتَجاسرون، ويُؤَخرون أُخرى نحو أَهل الحديث ليستَتِروا فلا يتظاهرون، وإِن قلنا ما مذهبكم في القرآن قالوا قديم غير مخلوق، وإِن قلنا فما القرآن أَليس السُوَر المسورة والآيات المسطرة في الصحف المطهرة؟ أَليس المحفوظ في صدور الحافظين؟ أَليس هو المسموع من أَلسن التالين؟ قالوا: إِنما هو حكايته وما أَشرتم إِليه عبارته. وأَمَّا القرآن فهو قائم في نفس الحق غير ظاهر لإِحساس الخلق. فنظروا معاشر المسلمين رحمكم الله إِلى مقالة المعتزلة كيف جاءوا بها في صورة تنافي الصورة واسمعوا ما أَقول مِن إِفساد دعواهم والبيان عن معتقدهم في القرآن من الزيغ والضلال وأَنهم قائلون بخلافه لا مَحَالَة.

مسألة القرآن لابن عقيل ا صـ : ٥٠

دووباره دەڵێ: وا من ئێستا هەندێک ئایەتتان بۆ دەهێنمەوە کە نیشانی دەدەن لەسەر عەقیدەی صەڕیحی موعتەزیلەکانن، وە قەولیان هەمان ئەو قەولەیە کە قورئان موخلوقە وە دینداریيان بەو عەقیدەیە کردووە، الله

ﷻ فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ هَذَا الْقُرْآنَ يَهْدِى لِلَّتِي هِىَ أَقْوَمُ ﴾الإسراء: ٩ هەروەها فەرموویەتی: ﴿ لَوْ أَنزَلْنَا هَذَا الْقُرْآنَ عَلَى جَبَلٍ لَّرَأَيْتَهُ خَاشِعًا مُّتَصَدِّعًا مِّنْ خَشْيَةِ اللَّه ﴾ الحشر : ٢١ هەموو ئوممەت موتەفیقن لەسەر ئەوەی « هذا » ئیشارەتە بۆ ئەو شتەی بە گوێ دەبیسترێ و بە زمان دەخوێندرێتەوە، لە کاتێکدا ئەشاعیرە دەڵێن « هذا » ئیشارەتی بۆ کراوە مەخلوقە، چونکە کەلامی قەدیم لە ناو نەفسی اللە ـدایە ﷻ "قائم في النفس"

ئەوە ڕێک هەمان قەولیان وتووە کە قورئان مەخلوقە، لای ئەوان اللە صیفەتێکی هەیە ناو دەهێنرێ بە قورئان، ئەوەی لە زاتی اللە ـدایە ئەوە نییە لە ئایەتەکە ئیشارەتی بۆ دەکرێ، نە بەدابەزین ئیشارەتی بۆ دەکرێ نە بەخوێندنەوە نە بەبیستن نە بەبینین و هەست هیچی قورئان نییە، بەڵکو قورئان کەلامێکی نەفسییە لە زاتی اللە ـدایە. بێگومان وتوویانە قورئان مەخلوقە خەڵکی عەوامیان وا تێگەیاندووە کە لە نەفسدا شتێکیان سابت کردووە ناویان ناوە کەلامی اللە.

هەروەها دەلیلێکی تر لەسەر ئەوەی وتوویانە قورئان مەخلوق و داهێنراوە ئەم ئایەتەیە کە اللە ﷻ فەرموویەتی: ﴿ فَأْتُوا بِعَشْرِ سُوَرٍ

مِّثْلِهِ مُفْتَرَيَاتٍ ﴾ هود : ١٣ هەروەها فەرموويەتی: ﴿ قُل لَّئِنِ اجْتَمَعَتِ الْإِنسُ وَالْجِنُّ عَلَى أَن يَأْتُوا بِمِثْلِ هَذَا الْقُرْآنِ لَا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا ﴾ الإسراء : ٨٨ ئایا پێتان وایە کە الله ﷻ فەرموویەتی بە جن و ئینسانەکان بڵێ شتێک بهێنن وەک ئەوەی لە نەفسی مندایە لەوەی کە تا ئێستا نەتانزانیوە و نەتان بیستووە، ئایا ئەمە هەروەک ئەوە نییە کە بفەرموێ: بتوانن وەک علمی من بهێنن یاخود وەک چاوی من بهێنن یاخود وەک قودرەتی من بهێنن کە هیچ هەست و نەفسێک درکی پێ نەکردووە، کاتێک تەحەدای عەرەبی کردووە و بێدەسەڵاتیانی نیشان داوە لەوەی وەک ئەو قورئانە بهێنن بۆمان دەردەکەوێ ئەوەی الله ﷻ ئیشارەتی بۆ کردووە ئەو قورئانەیە کە دەیبیستن و دەیناسن ئەگەر وا نەبوایە ئەوە هیچ دەلیلێک نییە بۆ ئەوەی شتێک بهێنن کە نەزانراوە و لە نەفسی الله ـدایە، چونکە شتێک لە نەفسی الله ـدابێ و شاراوەبێ لێیان ئیتر چۆن تەحەدای جن و ئینسانەکانی پێدەکات وەک ئەوە بهێنرێ، هەربۆیە دەبینی الله ﷻ هەواڵمان پێدەدات دەربارەی هەندێک پێغەمبەرەکانی "عیسی ﷺ" کە فەرموویەتی یا ڕەب تۆ دەزانی چی لە نەفسی مندایە، بەڵام من نازانم چی

له نەفسی تۆدایە: ﴿ تَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِي وَلَا أَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِكَ ﴾ المائدة : ١١٦ دەبینن الله ﷻ ئینکاری نەکرد لەم قەولەی پێغەمبەر عیسی.

ئەگەر وتیان: الله ئیشارەتی بۆ حیکایەتی ئەوە کردووە لە نەفسیدایە، وە عیبارەتەکەی ئەوەیە کە بە زمان دەخوێندرێتەوە و لە دڵەکاندا حفظ بووە و لە موصحەفەکاندا نوسراوە، ئەمما پێتان وابێ ئەو ئیشارەتە بۆ قورئانە کە صیفاتێکی زاتی الله ـیە ئەوە نەخێر وا نییە. پێیان دەڵێین: ئەمجار لە جاری یەکەم کوفرەکەتان قورستر و خراپترە، چونکە حیکایە واتە هاوشێوە و نمونەی وەک ئەو، ئێوە کە دەڵێن قورئان کەلامێکی نەفسییە ئەوەی دەیخوێنینەوە حیکایەتی ئەو قورئانەیە! ئەوە ئەو شوبهاندنەی لێی ڕادەکەن و خۆتانی لێبەری دەکەن تێی کەوتوون هەرچەندە خۆشتان بە گەورەتر و لە پێشتر دابنێن بەسەر ئەهلی حدیثدا بەو درۆ و فێڵ و چەواشەکارییەی ئەنجامی دەدەن بۆ داپۆشینی باتڵەکەتان و بە حەق نیشاندانی بە خەڵکی، ئەگەریش بڵێن الله تعالى لە نەفسیدا صیفەتێک هەیە دەتوانین و بۆمان هەیە وەک حیکایەتێک دەری ببڕین ئەویش تیلاوەکەمانە وە دەتوانین وەک ئەوەی نەفسی الله بهێنین

که قیرائه‌کەمانه، ئەوە بێگومان بە صەڕیحی دانتان ناوە بەوەدا کە وەصفی الله تعالی حیکایەت و گێڕانەوەی ئەو کەلامە نەفسییەیە نەک قورئان سەربەخۆ کەلامی الله بێ، ئەوە بە تەئکیدا کەوتوونەتە ئەو تەشبیهەی کە خۆتانی لێبەری دەکەن و لێی ڕادەکەن،

چونکە ئەگەر ئەو تیلاوەیە هاوشێوەی کەلامەکەی الله بێ ئەوە خەڵکی دەیانتوانی وەک ئەو کەلامە بهێنن مادام ئەو قورئانەی هەیە حیکایەتێک بێ لە کەلامی الله ئیتر کوا عەجز و بێدەسەڵاتییان؟ لەبەرئەوەی کەلامی الله ﷻ بە لای ئەوانەوە نە حەرفە نە صەوتە ئیتر چۆن دەکرێ هاوشێوەکەی حەرف و صەوت بێ؟! وە ئایا ئەم قسەیان هەروەکو ئەوە نییە کەسێک بڵێ عیلمی ئێمە وەک عیلمی الله وایە، وە بیستن و چاومان حیکایە و هاوشێوەی بیستنی الله و چاوی الله ـیە، خەڵکیتان خەڵەتاندوو حەقتان لێشاردنەوە واتان نیشانیاندا کە ئەهلی سوننەن! ئای چەندە دوورن لە ئەهلی سوننە و هەڵگری ئەو ناوەبن لە کاتێکدا ئێوە نەصی قورئان بە درۆ دەخەنەوە، الله ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَكَلَّمَ اللَّهُ مُوسَى تَكْلِيمًا ﴾ النساء : ١٦٤ ﴿ وَإِذْ نَادَى رَبُّكَ مُوسَى﴾ الشعراء : ١٠ ﴿ وَنَادَيْنَاهُ مِن جَانِبِ الطُّورِ الْأَيْمَنِ وَقَرَّبْنَاهُ

نَجِيًّا ﴾ مريم : ٥٢ کەچی ئێوە دەڵێن مەلائیکە واتە جبریل قسەی کردووە لەگەڵ موسی، وە موسی تێگەییوە لەوەی لە نەفسی الله ـدایە و خستوویەتیە دڵیەوە، الله ﷻ ئەوانەی بە درۆ خستووەتەوە کە تێگەیشتن بە کەلام ناو دەهێنن، ئەو کەسەش درۆ دەکات و الله ﷻ بە درۆی خستووەتەوە کە پێی وابێ کلامی مەلائیکە جبریل ئەوەیە لە نەفسی الله ـدایە و پێش وەحی کردن جبریل تێگەیشتووە لێی، الله ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ اللَّهُ إِلَّا وَحْيًا أَوْ مِن وَرَاءِ حِجَابٍ أَوْ يُرْسِلَ رَسُولًا فَيُوحِيَ بِإِذْنِهِ مَا يَشَاءُ إِنَّهُ عَلِيٌّ حَكِيمٌ ﴾ الشورى : ٥١ وە الله ﷻ ناوی هیچ پێغەمبەرێکی نەهێناوە کە قسەی لەگەڵ کرد بێ لەگەڵ ئەوەی وەحی بۆ هەموویان ناردووە و مەلائیکە دابەزیوە بۆیان، لێرەوە بۆمان دەردەکەوێ کە قسەکردنی حەقیقی بە بێ واسطەی وەحی تەنها بۆ هەندێکیان ڕوویداوە وەک پێغەمبەر موسی ﷺ، وە پێغەمبەرمان محمد ﷺ لە شەوی میعراجدا.

وە هەروەها فەرموویەتی: ﴿ إِنَّا أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ كَمَا أَوْحَيْنَا إِلَىٰ نُوحٍ وَالنَّبِيِّينَ مِن بَعْدِهِ وَأَوْحَيْنَا إِلَىٰ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالْأَسْبَاطِ وَعِيسَىٰ وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ وَهَارُونَ وَسُلَيْمَانَ وَآتَيْنَا دَاوُودَ

زَبُورًا ۞ وَرُسُلًا قَدْ قَصَصْنَاهُمْ عَلَيْكَ مِن قَبْلُ وَرُسُلًا لَّمْ نَقْصُصْهُمْ عَلَيْكَ وَكَلَّمَ اللَّهُ مُوسَىٰ تَكْلِيمًا ﴾ النساء : ١٦٤-١٦٣ الله ﷻ ناوی ئەو پێغەمبەرانەی هێناوە کە وەحی بۆ کردوون باسی قسەکردنی ڕاستەوخۆی نەکردووە لەگەڵیان ئیللا دانەیەکیان نەبێ کە موسی پێغەمبەرە ﷺ جیای کردووەتەوە لێیان بە بێ واسطە قسەی لەگەڵی کردووە، کاتێک ناوی ئەوانەی هێناوە، بەڵام لەگەڵ هیچکامیان باسی موکالەمە نەهاتووە ئیللا موسی نەبێ ئەوە ڕوونە کە قسەکردنی لەگەڵ ئەو لە ڕێی وەحی نەبووە، بەڵکو قسەکردنی ڕاستەوخۆ و حەقیقی بووە، چونکە ئەگەر وەحی بووایە ئەوە جیای نەدەکردەوە لەو پێغەمبەرانەی تر کە ناوی هێناون لە ڕێگەی وەحییەوە پەیامی بۆ ناردوون.

وە کاتێک باسی پێغەمبەر سلیمان دەکات ﷺ دەفەرموێ: ﴿ فَفَهَّمْنَاهَا سُلَيْمَانَ ﴾ الأنبياء : ٧٩ فەرق و جیاوازی دەخاتە نێوان فێرکردن و تێگەیاندن لەگەڵ قسەکردن، هەرکەسێک فێرکردن و تێگەیاندن "التفهيم" بە قسەکردنی ڕاستەوخۆ "تكليم" ناو بهێنێ ئەوە بیدعە و زمانێکی تایبەتی بۆ خۆی داهێناوە.

وە هەروەها پێتان وایە کە الله ﷻ قسەی نەکردووە لەگەڵ موسى ﷺ، بەو پێیەبێ غیری الله بە موسی پێغەمبەری وتووە: من الله ـم، وە موسی بە غیری الله ـی وتووە: خۆتم نیشان بدە ڕێگەم پێبە بتبینم، وە بە غیری الله ـی وتووە: لێم خۆشبە! وە کاتێک الله ﷻ خۆی نیشانی شاخەکەدا ئەویش وورد و خاش بوو، ئێوە دەڵێن ئەوە مەلائیکە بووە خۆی نیشانداوە نەک الله! باشە ئەگەر وایە بۆچی بە درێژایی زەمەن مەلائیکە دادەبەزن و خۆیان نیشانی ئەو شاخانە دەدەن بۆچی شاخێک وورد و خاش نابێ؟!

یاخود بۆچی پێغەمبەران کاتێک کەلامی مەلائیکە دەبیستن لە هۆش خۆیان ناچن و نامرن؟!

وها أَنَذا أُذكر من آيات الكتاب ما يشهد بأَنهم بالإِعتزال الصريح قالوا وبالقول بخلق القرآن دانوا قال الله سبحانه: ﴿ إِنَّ هَذَا الْقُرْآنَ يَهْدِي لِلَّتِي هِيَ أَقْوَمُ ﴾ الإسراء : ٩ وقال: ﴿ لَوْ أَنزَلْنَا هَذَا الْقُرْآنَ عَلَى جَبَلٍ لَّرَأَيْتَهُ خَاشِعًا مُّتَصَدِّعًا مِّنْ خَشْيَةِ اللَّهِ ﴾ الحشر : ٢١ فقد اجتمعت الأُمة على أَنَّ قوله: « هذا » إِشارة إِلى هذا المسموع بالآذان المتلو بالأَلسن، وقد قالت الأَشاعرة إِنَّ هذا المشار إِليه هو المخلوق فإِن القديم قائم في النفس فقد

صرحوا بخلق القرآن إِذ لله صفة تسمى قرآنًا عندهم وما في ذات الله تعالى غير مشار إِليه لا منزلًا ولا متلوًا ولا ظاهرًا لحس ولا مسموعًا بأُذن. فقد قالوا بخلق القرآن في المعنى وأَرضوا العوام بأَن أَثبتوا في النفس شيئًا سموه كلامًا.

وأيضًا مِنَّ الدليل فإِنهم قالوا بحدث القرآن والله يقول: ﴿ فَأْتُوا بِعَشْرِ سُوَرٍ مِّثْلِهِ مُفْتَرَيَاتٍ ﴾ هود : ١٣ ﴿ قُل لَّئِنِ اجْتَمَعَتِ الْإِنسُ وَالْجِنُّ عَلَىٰ أَن يَأْتُوا بِمِثْلِ هَٰذَا الْقُرْآنِ لَا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا ﴾ الإسراء : ٨٨ أَفتراه سبحانه يقول قل فأتوا بمثل ما في نفسي مما لم يعرفونه ولم يسمعونه، وهل هذا إِلا بمثابة قوله: فأتوا بمثل علمي أَو بمثل عيني أَو بمثل قدرتي مما لم يدركه الإِحساس ولم يظهر لإِدراكات النفس. فلما تَحَدَّ العرب وعجّزهم وقال بمثل هذا علمنا أَنه إِنما أَشار إِلى ما سمعوه وعرفوه وإِلا فلا حجة عليهم عند عجزهم عن الإِتيان بما جهلوه. وما في نفس الله تعالى لا صلة إِليه ولا وقوف عليه ولا يقدر أَحد على التحدي به قال الله سبحانه إِخبارًا عن بعض أَنبيائه: ﴿ تَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِي وَلَا أَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِكَ ﴾ المائدة : ١١٦ ولم ينكر عليه.

فإن قالوا: إنما أشار إلى حكاية ما في نفسه وعبارته وهو هذا المتلو بالألسن المحفوظ في الصدور المكتوب في المصاحف، فأما أن تشيروا إلى ما في ذاته فلا. قلنا لهم: أنتم أكفر وأغلظ منكم في الأول لأن الحكاية هي المثال والشبه والنظير فإن تنصلكم هو التشبيه وإن ذراكم على أصحاب الحديث بالكذب والتمويه وإذا قلتم لله تعالى في نفسه صفة نعقل حكايتها وهي تلاوتنا ونأتي بمثلها وهي قراءتنا فقد صرحتم بأن وصف الله تعالى تحكية ووقعتم فيما تنصلتم منه من التشبيه، ولأنَّ هذه التلاوات لو كانت حكايات لكان الناس قد أتوا بمثل كلام الله تعالى فأين عجزهم؟ ولأنَّ كلام الله تعالى عندهم ليس بحرف ولا صوت فكيف حكايته حرفً وصوتًا. وهل هذه الحكاية إلا بمثابة من قال إنَّ علومنا كعلم الله وسمعنا وبصرنا حكاية سمع الله وبصره وإن كان سمعه ليس بحاسة وأسماعنا حاسة، وموهتم على الناس أنكم من أهل السنة! وما أبعدكم من هذه التسمية مع تكذيبكم بنص القرآن والله تعالى يقول: ﴿وَكَلَّمَ اللَّهُ مُوسَى تَكْلِيمًا﴾ النساء : ١٦٤ ﴿وَإِذْ نَادَى رَبُّكَ مُوسَى﴾ الشعراء : ١٠ ﴿وَنَادَيْنَاهُ مِن جَانِبِ الطُّورِ الْأَيْمَنِ وَقَرَّبْنَاهُ نَجِيًّا﴾ مريم : ٥٢ وقلتم إنَّ الملك كلمه والله ألهمه وفهمه، وقد أكذب الله تعالى مَن سمى التفهيم كلامًا والإفهام من النداء وكذب من جعل كلام الملك كلامًا

له سبحانه فقال تعالى: ﴿ وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ اللَّهُ إِلَّا وَحْيًا أَوْ مِن وَرَاءِ حِجَابٍ أَوْ يُرْسِلَ رَسُولاً فَيُوحِيَ بِإِذْنِهِ مَا يَشَاءُ إِنَّهُ عَلِيٌّ حَكِيمٌ ﴾ الشورى : ٥١ ولم يَسم أَحدًا مِن الأَنبياء كليمًا مع كونه أَوحى إِليهم وأَرسل إِليهم الملائكة فعلمنا أَنَّ التكليم حقيقة لم يحصل إِلا لقسم منهم وهو الذي كلمه الله لا برسول ولا وحيًا مثل موسى ﷺ مِن وراء حجاب ونبينا ﷺ مِن وراء معراج.

وقال سبحانه: ﴿ إِنَّا أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ كَمَا أَوْحَيْنَا إِلَىٰ نُوحٍ وَالنَّبِيِّينَ مِن بَعْدِهِ وَأَوْحَيْنَا إِلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالْأَسْبَاطِ وَعِيسَى وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ وَهَارُونَ وَسُلَيْمَانَ وَآتَيْنَا دَاوُودَ زَبُورًا * وَرُسُلًا قَدْ قَصَصْنَاهُمْ عَلَيْكَ مِن قَبْلُ وَرُسُلاً لَّمْ نَقْصُصْهُمْ عَلَيْكَ وَكَلَّمَ اللَّهُ مُوسَىٰ تَكْلِيمًا ﴾ النساء : ١٦٤-١٦٣

فذكر الله تعالى الأَنبياء الذين أَوحى إِليهم وأَلهمهم ولم يضف إِليهم التكليم ولا واحدًا منهم سماه بالكليم ثم أَفرد موسى بالذكر فدل على أَنَّ الكلام كان لموسى بخصيصه ليست إِلا بنفي الوسائط، وكلامه بنفسه سبحانه أَوجب له اسم كليم وإِلا فمعلوم أَنَّ كثرة هؤُلاء مذكورين لم يسم أَحدًا كليمًا ولا مكلمًا فانقطع عنهم موسى وأَفرده باسم المكالمة منهم.

وقال في حق سليمان: ﴿ فَفَهَّمْنَاهَا سُلَيْمَانَ ﴾ الأنبياء : ٧٩ ففرق بين التفهيم والتكليم، فمن سمى التفهيم تكليمًا فقد وضع لنفسه بدعة ولغة.

وزعمتم أَنَّ غير الله يقول لموسى: إِنني أَنا الله، وموسى يقول لغير الله: أَرني أَنظر إِليك، ويقال لغيره: تبت إِليك، وتجلى غير الله للجبل فجعله دكًا. أَترى الملائكة يتجلون للجبال على استمرار الزمان فلا تندك ولا تنهد.

أَوَ ليس الأَنبياء يسمعون كلام الملائكة فلا يصعقون ولا يفرقون؟
مسألة القرآن لابن عقيل ا صـ : ٥١-٥٥

ئەشاعیرە موتەفیقی موعتەزیلەن لەوەی کە ئەو قورئانەی مەوجودە لە موصحەفەکان و مەحفوظە لە دڵەکاندا، بە حەقیقی کەلامی الله نییە، بەڵکو حیکایەت و عیبارەتە لێی، چونکە کەلامی الله بە حەق ئەوە مانایەیە کە لە دڵدایە "واتە النفسي قائم بذاتە" هیچ کەسێک لێی نەبیستووە، وە خودی الله ﷻ نەیبیستووە لە خۆی، بەڵکو جبریلی تێگەیاندووە، وە ئەویش فێری پێغەمبەری کردووە، بەم جۆرە ئەو قورئانە قەولی جبرائیل و محمد پێغەمبەرە!

کەواتە موعتەزیلە و ئەشاعیرە موتەفیقن لەسەر ئەوەی قورئان مەخلوقە.



## قورئان کەلامی الله ـیە ﷻ لە ئاسمانەوە دابەزیوە

ئەو قورئانەی کە مەوجوودە لامان لە ناو موصحەفەکاندا بە حەقیقی کەلامی الله ـیە ﷻ، وە قسەی پێکردووە جبریل علیه السلام بیستوویەتی و بە ئەمری الله ﷻ هێناویەتی بۆ ڕەسول الله ﷺ، ئەگەر ئەو قورئانە کەلامی الله نەبووایە چ مانایەک دەمایەوە بۆ ئەو قەولەی ڕەسول الله ﷺ کە نەهی کردووە لە سەفەر کردن بە قورئانەوە بۆ وولاتانی کوفر هەتا قورئان تووشی سووکایەتی پێکردن نەبێتەوە؟

**عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يَنْهَى أَنْ يُسَافَرَ بِالْقُرْآنِ إِلَى أَرْضِ الْعَدُوِّ، مَخَافَةَ أَنْ يَنَالَهُ الْعَدُوُّ.**

رواه البخاري ا ٢٩٩٠ ومسلم ا ٤٨٤٠ وأَبو داود ا ٢٦١٠ وابن ماجه ا ٢٨٧٩ ومالک ا ١٠٠٧ وأَحمد ا ٤٥٢٥ وابن أَبي داود في كتاب المصاحف ا ٦٩٦ وابن بطة في الإبانة الكبرى ا ٢١٨٥

ئەشاعیرە پێیان وایە کەلامی الله دانەبەزیوە و دانابەزێ، ئەوەی دابەزیوە عیبارەتە لە کەلامی الله، جبریل لەو کەلامە تێگەییوە کە لە نەفسی الله ـدایە و هێناویەتی بۆ محمد، هەربۆیە دەبینی بە حەقیقی نەفی

نزولی قورئان دەکەن، لە کاتێکدا ئەو قورئانە لە ڕێی وەحییەوە دابەزیوە بۆ ڕەسول الله ﷺ، قَالَ ﷻ: ﴿ قُلْ أَيُّ شَيْءٍ أَكْبَرُ شَهَادَةً قُلِ اللَّهُ شَهِيدٌ بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَذَا الْقُرْآنُ لِأُنذِرَكُم بِهِ وَمَن بَلَغَ ﴾ الأنعام : ١٩ وَقَالَ: ﴿ ذَلِكَ مِمَّا أَوْحَى إِلَيْكَ رَبُّكَ مِنَ الْحِكْمَةِ ﴾ الإسراء : ٣٩ وَقَالَ: ﴿ وَاتْلُ مَا أُوحِيَ إِلَيْكَ مِن كِتَابِ رَبِّكَ لَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَاتِهِ وَلَن تَجِدَ مِن دُونِهِ مُلْتَحَدًا ﴾ الكهف : ٢٧

وە پێیان وایە کەلامی الله مانایەکە لە نەفسی الله ـدایە قەت لێی جیا نابێتەوە، ئەوەی دابەزیوە عیلمی قورئان و فەهم و تێگەیشتنە لێی نەک قورئان بێ، هەروەها پێشیان وایە ئەو قورئانە الله ﷻ لە هەوادا خەلقی کردووە یاخود لە لوح المحفوظ خەلقی کردووە یان لە جسمێکدا خەلقی کردووە، وە جبریل وەری گرتووە و هێناویەتی بۆ پێغەمبەر ﷺ لە هەموو بارەکاندا قورئان بە لایانەوە حکایەتە لە کەلامی الله واتە هاوشێوەی کەلامی الله ـیە یاخود عیبارەتە لە کەلامی الله واتە کەلامی الله لە نەفسی الله ـدایە ئەوەی دەخوێنرێ و گوێی لێدەگیرێ دەربڕینێکە لەو کەلامەی لە نەفسی الله ـدایە! ئەمە خیلافی چەندان ئایەتی قورئانە کە

بە وازحی ئەوە ڕوون دەکەنەوە کە ئەو قورئانە کە کەلامی الله ـیە بە حەقیقی دابەزیوە.

قَالَ اللهُ ﷻ: ﴿ وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِ وَادْعُوا شُهَدَاءَكُم مِّن دُونِ اللهِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ البقرة : ٢٣ وَقَالَ: ﴿ آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ ﴾ البقرة : ٢٨٥ وَقَالَ: ﴿ نَزَّلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَأَنزَلَ التَّوْرَاةَ وَالْإِنجِيلَ ۞ مِن قَبْلُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَأَنزَلَ الْفُرْقَانَ ﴾ آل عمران : ٢-٣ وَقَالَ: ﴿ هُوَ الَّذِي أَنزَلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ مِنْهُ آيَاتٌ مُّحْكَمَاتٌ هُنَّ أُمُّ الْكِتَابِ وَأُخَرُ مُتَشَابِهَاتٌ ﴾ آل عمران : ٧ وَقَالَ: ﴿رَبَّنَا آمَنَّا بِمَا أَنزَلْتَ وَاتَّبَعْنَا الرَّسُولَ فَاكْتُبْنَا مَعَ الشَّاهِدِينَ ﴾ آل عمران : ٥٣ وَقَالَ: ﴿ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لِمَ تُحَاجُّونَ فِي إِبْرَاهِيمَ وَمَا أُنزِلَتِ التَّوْرَاةُ وَالْإِنجِيلُ إِلَّا مِن بَعْدِهِ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴾ آل عمران : ٦٥ وَقَالَ: ﴿ وَقَالَت طَّائِفَةٌ مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ آمِنُوا بِالَّذِي أُنزِلَ عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَجْهَ النَّهَارِ وَاكْفُرُوا آخِرَهُ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴾ آل عمران : ٧٢ وَقَالَ: ﴿ قُلْ آمَنَّا بِاللهِ وَمَا أُنزِلَ عَلَيْنَا وَمَا أُنزِلَ عَلَىٰ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ

وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالْأَسْبَاطِ وَمَا أُوتِيَ مُوسَى وَعِيسَى وَالنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمْ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ ﴾ آل عمران : ٨٤ وَقَالَ: ﴿ إِنَّا أَنزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ لِتَحْكُمَ بَيْنَ النَّاسِ بِمَا أَرَاكَ اللَّهُ ﴾ النساء : ١٠٥ وَقَالَ: ﴿ وَأَنزَلَ اللَّهُ عَلَيْكَ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَعَلَّمَكَ مَا لَمْ تَكُن تَعْلَمُ ﴾ النساء : ١١٣ وَقَالَ: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا آمِنُوا بِاللهِ وَرَسُولِهِ وَالْكِتَابِ الَّذِى نَزَّلَ عَلَى رَسُولِهِ وَالْكِتَابِ الَّذِى أَنزَلَ مِن قَبْلُ ﴾ النساء : ١٣٦ وَقَالَ: ﴿ وَقَدْ نَزَّلَ عَلَيْكُمْ فِي الْكِتَابِ أَنْ إِذَا سَمِعْتُمْ آيَاتِ اللَّهِ يُكْفَرُ بِهَا وَيُسْتَهْزَأُ بِهَا فَلَا تَقْعُدُوا مَعَهُمْ حَتَّى يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ ﴾ النساء : ١٤٠ وَقَالَ: ﴿ لَّكِنِ الرَّاسِخُونَ فِي الْعِلْمِ مِنْهُمْ وَالْمُؤْمِنُونَ يُؤْمِنُونَ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ ﴾ النساء : ١٦٢ وَقَالَ: ﴿ لَّكِنِ اللَّهُ يَشْهَدُ بِمَا أَنزَلَ إِلَيْكَ أَنزَلَهُ بِعِلْمِهِ ﴾ النساء : ١٦٦ وَقَالَ: ﴿ وَأَنِ احْكُم بَيْنَهُم بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ وَاحْذَرْهُمْ أَن يَفْتِنُوكَ عَن بَعْضِ مَا أَنزَلَ اللَّهُ إِلَيْكَ ﴾ المائدة : ٤٩ وَقَالَ: ﴿ قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ هَلْ تَنقِمُونَ مِنَّا إِلَّا أَنْ آمَنَّا بِاللهِ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْنَا وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلُ وَأَنَّ أَكْثَرَكُمْ فَاسِقُونَ ﴾ المائدة

: ٥٩ وقَالَ: ﴿ يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ﴾ المائدة : ٦٧ وَقَالَ: ﴿ قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لَسْتُمْ عَلَىٰ شَيْءٍ حَتَّىٰ تُقِيمُوا التَّوْرَاةَ وَالْإِنجِيلَ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُمْ ﴾ المائدة : ٦٨ وَقَالَ: ﴿ وَلَوْ كَانُوا يُؤْمِنُونَ بِاللهِ وَالنَّبِيِّ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مَا اتَّخَذُوهُمْ أَوْلِيَاءَ وَلَٰكِنَّ كَثِيرًا مِّنْهُمْ فَاسِقُونَ ﴾ المائدة : ٨١ وقَالَ: ﴿وَإِذَا سَمِعُوا مَا أُنزِلَ إِلَى الرَّسُولِ تَرَىٰ أَعْيُنَهُمْ تَفِيضُ مِنَ الدَّمْعِ مِمَّا عَرَفُوا مِنَ الْحَقِّ ﴾ المائدة : ٨٣ وَقَالَ: ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا إِلَىٰ مَا أَنزَلَ اللَّهُ وَإِلَى الرَّسُولِ قَالُوا حَسْبُنَا مَا وَجَدْنَا عَلَيْهِ آبَاءَنَا ﴾ المائدة : ١٠٤ وَقَالَ: ﴿ وَقَالُوا لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ آيَةٌ مِّن رَّبِّهِ قُلْ إِنَّ اللَّهَ قَادِرٌ عَلَىٰ أَن يُنَزِّلَ آيَةً وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ الأَنعام : ٣٧ وَقَالَ: ﴿وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ إِذْ قَالُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ عَلَىٰ بَشَرٍ مِّن شَيْءٍ قُلْ مَنْ أَنزَلَ الْكِتَابَ الَّذِي جَاءَ بِهِ مُوسَىٰ نُورًا وَهُدًى لِّلنَّاسِ ﴾ الأَنعام : ٩١ وَقَالَ: ﴿ وَهَٰذَا كِتَابٌ أَنزَلْنَاهُ مُبَارَكٌ مُّصَدِّقُ الَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ وَلِتُنذِرَ أُمَّ الْقُرَىٰ وَمَنْ حَوْلَهَا ﴾ الأَنعام : ٩٢ وَقَالَ: ﴿ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَىٰ عَلَى اللهِ كَذِبًا أَوْ قَالَ أُوحِيَ إِلَيَّ وَلَمْ يُوحَ إِلَيْهِ شَيْءٌ وَمَن قَالَ سَأُنزِلُ مِثْلَ مَا أَنزَلَ اللَّهُ ﴾ الأَنعام : ٩٣

وَقَالَ: ﴿ إِنَّا أَنزَلْنَاهُ قُرْآنًا عَرَبِيًّا لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴾ يوسف : ٢ وَقَالَ: ﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ ﴾ الحجر : ٩ وَقَالَ: ﴿ وَإِذَا بَدَّلْنَا آيَةً مَّكَانَ آيَةٍ وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يُنَزِّلُ قَالُوا إِنَّمَا أَنتَ مُفْتَرٍ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ * قُلْ نَزَّلَهُ رُوحُ الْقُدُسِ مِن رَّبِّكَ بِالْحَقِّ لِيُثَبِّتَ الَّذِينَ آمَنُوا وَهُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُسْلِمِينَ * وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُ بَشَرٌ لِّسَانُ الَّذِي يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِيٌّ وَهَٰذَا لِسَانٌ عَرَبِيٌّ مُّبِينٌ ﴾ النحل : ١٠١-١٠٣ وَقَالَ: ﴿ وَنُنَزِّلُ مِنَ الْقُرْآنِ مَا هُوَ شِفَاءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ وَلَا يَزِيدُ الظَّالِمِينَ إِلَّا خَسَارًا ﴾ الإسراء : ٨٢ وَقَالَ: ﴿وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَاهُ قُرْآنًا عَرَبِيًّا وَصَرَّفْنَا فِيهِ مِنَ الْوَعِيدِ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ أَوْ يُحْدِثُ لَهُمْ ذِكْرًا ﴾ طه : ١١٣ وَقَالَ: ﴿ وَإِنَّهُ لَتَنزِيلُ رَبِّ الْعَالَمِينَ * نَزَلَ بِهِ الرُّوحُ الْأَمِينُ ﴾ الشعراء : ١٩٢-١٩٣ وَقَالَ: ﴿ تَنزِيلُ الْكِتَابِ مِنَ اللهِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ ﴾ الزمر : ١ وَقَالَ: ﴿ وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَآمَنُوا بِمَا نُزِّلَ عَلَىٰ مُحَمَّدٍ وَهُوَ الْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ ﴾ محمد : ٢ وَقَالَ: ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَرِهُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأَحْبَطَ أَعْمَالَهُمْ﴾ محمد : ٩ وَقَالَ: ﴿ وَيَقُولُ الَّذِينَ آمَنُوا لَوْلَا نُزِّلَتْ سُورَةٌ فَإِذَا أُنزِلَتْ

سُورَةٌ مُّحْكَمَةٌ وَذُكِرَ فِيهَا الْقِتَالُ ﴾ محمد : ٢٠ وَقَالَ: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا لِلَّذِينَ كَرِهُوا مَا نَزَّلَ اللَّهُ سَنُطِيعُكُمْ فِي بَعْضِ الْأَمْرِ ﴾ محمد : ٢٦ وَقَالَ: ﴿ تَنزِيلٌ مِّن رَّبِّ الْعَالَمِينَ ﴾ الواقعة : ٨٠ وَقَالَ: ﴿ تَنزِيلٌ مِّن رَّبِّ الْعَالَمِينَ ﴾ الحاقة : ٤٣ وَقَالَ: ﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا عَلَيْكَ الْقُرْآنَ تَنزِيلًا ﴾ الإنسان : ٢٣ وَقَالَ: ﴿ إِنَّا أَنزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ ﴾ القدر : ١

وەک بینیتان لەو ئایەتانەدا بە ڕوونی دیارە کە قورئان دابەزیوە هەموو ئەو ئایەتانە ئەوە ڕوون دەکەنەوە کە الله ﷻ کەلامەکەی خۆی دابەزاندووە ﴿ إِنَّا أَنزَلْنَاهُ ﴾. ﴿ وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَاهُ ﴾. ﴿ بَلِّغْ مَا أُنزِلَ﴾. ﴿ وَهَٰذَا كِتَابٌ أَنزَلْنَاهُ ﴾. ﴿ نَحْنُ نَزَّلْنَا ﴾. ﴿ لَتَنزِيلُ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾. ﴿ نَزَّلْنَا عَلَيْكَ الْقُرْآنَ ﴾. ئەم لەفظانە و غیری ئەوانیش دەلالەتی قەطعین لەسەر دابەزینی کەلامی الله ﷻ هیچ کەسێک نییە ڕەتیبکاتەوە ئیللا موعەطیلەی صیفات نەبێ. لە لایەکی تریشەوە ئەمە دەلیلیشە لەسەر ئەوەی الله ﷻ لە بەرزییە لە ئاسمان، چونکە ئایەتەکان هەموویان باسی دابەزینی قورئانی تێدایە لە سەرەوە بۆ خوارەوە، سەدان ئایەتی تر هەن،

بەڵام هێندە بەسە بۆ کەسێک خاوەن دڵێکی سەلیم و مێشکێکی صحیح بێ.

تەنانەت الله ﷻ تەحەدای کافرەکانی قورەیش دەکات کاتێک گومانیان لەو قورئانە هەبوو کە بۆ ڕەسول الله ﷺ دابەزیوە، داخۆ ئەوە قسەی الله ﷻ بێ یاخود ڕەسول الله ﷺ، الله ﷻ تەحەدایان دەکات کە بتوانن سورەتێک وەک ئەو قورئانە بهێنن. ﴿وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَى عَبْدِنَا فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِ وَادْعُوا شُهَدَاءَكُم مِّن دُونِ اللهِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ البقرة : ٢٣

وە تەحەدای هەموو ئینسانەکان و جنەکان دەکات بتوانن وەک ئەو قورئانە بهێنن هەرچەندە هەمووشیان هاوکار و پشتیوانی یەک بن. ﴿قُل لَّئِنِ اجْتَمَعَتِ الْإِنسُ وَالْجِنُّ عَلَى أَن يَأْتُوا بِمِثْلِ هَذَا الْقُرْآنِ لَا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا﴾ الإِسراء : ٨٨

دووبارە تەحەدای هەموو کافران دەکات کە بتوانن سورەتێک وەک ئەو قورئانە بهێنن، یاخود دە سورەت وەک ئەو قورئانە بهێنن. ﴿أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ قُلْ فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِّثْلِهِ وَادْعُوا مَنِ اسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ اللهِ

إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴾ يونس : ٣٨ ﴿ أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ قُلْ فَأْتُوا بِعَشْرِ سُوَرٍ مِّثْلِهِ مُفْتَرَيَاتٍ وَادْعُوا مَنِ اسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ اللهِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴾ هود : ١٣

كاتێک هەموو جن و ئینسانەکان نەتوانن سورەتێک وەک ئەو قورئانە بهێنن لە دەسەڵات و توانای هیچ کەسێکدا نەبێ، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو قورئانە کەلامی الله ـیە ﷻ، وە لە توانای هیچ گرۆیەکدا نییە وەک ئەو بهێنن، ئەو هەموو جەمعە نەتوانن هاوشێوەی قورئان بهێنن کەواتە موستەحیلە قورئان کەلامێکی نەفسی نییە هەروەک چۆن ئەشاعیرە دەعوای دەکەن کە گوایە کەلامی الله ﷻ لە نەفسیدایە!

بە هەمان شێوەش نەفی حەقیقی نزولی الله ﷻ، وە صیفاتەکانی فیعل نەفی و تەئویل دەکەن، هەروەها صیفاتە خەبەرییەکانی وەک: دەست، قاچ، پەنجە ڕەتدەکەنەوە. ئەشاعیرە لە ئەصڵدا موشەبیهەن، تەنها بە تەعطیلەوە نەوەستان و وازیان نەهێنا هەتا صیفاتەکانی خالقیان شوبهاند بە صیفاتی مەخلوق، بەو عەقڵە بچوک و نەخۆش و دڵە ڕەش و خاڵییەیان نازانن مامەڵە لەگەڵ صیفاتەکانی الله ﷻ بکەن، هەر صیفاتێکی بەنی ئادەم دەبینن لە پێش چاویان، پێیان وایە صیفاتەکانی خالق بەو جۆرەن

هەربۆیە ئەو هەموو صیفاتەی لە قورئان و حدیث هاتوون ڕەتیان دەکەنەوە، پێیان وایە ئەگەر ئەو صیفاتانە سابت بکەن ئەوە خالقیان شوبهاندووە بە مەخلوق! بە حسابی خۆیان لە شوبهاندن ڕایان کردووە، بەڵام کەوتنە ناو تەشبیهـ و تەعطیل ئیتر لە ژێر ناوی تەنزیهی خالقدا کەوتنە ڕەتکردنەوەی صیفاتەکانی الله ﷻ.



## الله ﷻ قسه دەكات بە صەوت

لای ئەهلی سوننە الله ﷻ قسە دەكات، وە قسەكانیشی دەنگی هەیە، بە پێچەوانەی ئەهلی تەعطیل جەهمییە و موعتەزیلە و ئەشاعیرە كە پێیان وایە الله قسە ناكات و دەنگی نییە.

وە دەنگی الله ﷻ لە دەنگی بنی آدم و هیچ مەخلوقات ناچێ هیچ صیفاتێكی هاوشێوەی صیفاتی مەخلوقات نییە ﴿ لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ ۖ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ ﴾. بە صحیحی سابت بووە كاتێک الله ﷻ قسە دەكات ئەهلی ئاسمانەكان صەوتی دەبیستن سوجدە دەبەن و لە هۆش خۆیان دەچن، وە ئاسمانەكان لەبەر شدەتی صەوتی الله ﷻ دەنگێک دەردەكەن وەک دەنگی ئاسن كاتێک بەر بەرد دەكەوێ.

**عبدالله كوڕی أحمد** دەڵێ: پرسیارم كرد لە باوكم رحمه الله دەربارەی كەسانێک كە دەڵێن: كاتێک الله ﷻ قسەی لەگەڵ پێغەمبەر موسی ﷺ كرد بە دەنگ قسەی نەكردووە صەوتی نەبووە؟ باوكم ووتی: الله ﷻ بە صەوت قسەی كردووە، ئەو حدیثانەی لەسەری هاتوون لەسەر ظاهرەكەیان وەریان دەگرین چۆن هاتوون بەو جۆرە وەریان دەگرین.

سأَلت أَبي رحمه الله، عن قومٍ يقولون: لمَّا كَلَّمَ الله عَزَّ وَجَلَّ موسى لم يَتَكَلَّم بِصَوت؟ فقال أَبي: بلى، إِنَّ ربَّکَ عَزَّ وَجَلَّ تكَلَّمَ بِصَوتٍ، هذه الأَحاديث نرويها كما جاءت.

كتاب السنة لعبدالله بن أَحمد | ٥٢٧

هەروەها باوکم ووتی: حدیثی **عبدالله کوڕی مسعود**: « **إِذَا تَكَلَّمَ الله عَزَّ وَجَلَ، سُمِعَ لَهُ صَوتُ كَجَرِّ السِّلْسِلَةِ عَلَى الصَّفْوَانَ** ». باوکم ووتی: ئەم حدیثە جەهمییەکان ئینکاری لێدەکەن واتە باوەڕیان بەوە نییە الله ﷻ قسە بکات.

وە باوکم ووتی: ئەوانە کافرن، دەیانەوێ خەڵکی بخەڵەتێنن وایان نیشان بدەن کە الله ﷻ قسە ناکات، هەرکەسێک پێی وابێ الله ﷻ قسە ناکات کافرە، ئێمە ئەو حدیثانە ڕیوایەت دەکەین بەو جۆرە دەیانگێڕینەوە کە هاتوون لەسەر ظاهرەکەیان.

وقال أَبي رحمه الله: حديث ابن مسعود رضي الله عنه: « إِذَا تَكَلَّمَ الله عَزَّ وَجَلَ، سُمِعَ لَهُ صَوتُ كَجَرِّ السِّلْسِلَةِ عَلَى الصَّفْوَانَ ». قال أَبي: وهذا الجهمية تُنكره.

وقال أَبي: هؤلاء كُفَار، يُريدون أَن يُمَوِّهُوا على النَّاس، مَن زَعَمَ أَنَّ الله عَزَّ وَجَلَ لم يَتكلَّم، فهوَ كافر، إِلا أَنَّا نَروي هذه الأَحاديث كما جاءت.

كتاب السنة لعبدالله بن أَحمد | ٥٢٨

ئەم حدیثە جگە لە ئیمامی أحمد هەریەک لە « سعيد بن منصور، أبو داود السجستاني، محمد بن نصر المروزي، إبن جرير الطبري، الدارقطني، الآجري، اللالكائي، البيهقى، الخطيب البغدادى » ڕیوایەتیان کردووە هەموویان لە طەریقی مسروق ئەویش لە عبدالله کوڕی مسعود، بێجگە لە الطبرى کە لە عامر الشعبى هێناویەتی ئەویش لە إبن مسعود، هەموویان لەسەر ئەوە موتەفیقن کە الله ﷻ قسە دەکات قسەکانیشی بە صەوتە، وە کاتێک مەلائیکەکانی ئاسمان دەنگی دەبیستن لە ترسدا دەچنە سوجدە و لە هۆش خۆیان دەچن بەم جۆرە دەمێننەوە هەتا جبریل دێ بۆ لایان، کاتێک جبریل دەبینن ئیتر ترسەکە بەریان دەدات و دێنەوە سەرخۆیان و پێی دەڵێن: پەروەردگارمان چی فەرموو؟ ئەویش دەڵێ: الحق الحق. ئەوانیش دەڵێن: الحق الحق.

حدثني أَبي، حدثنا عبدالرحمن بن محمد المَحَاربي، عن الأَعمَش، عن مُسلم، عن مسروقٍ، عن عبدالله: إِذَا تَكَلَّمَ الله عَزَّ وَجَلَ بِالوَحِي سَمِعَ

صَوتَهُ أَهلُ السَّمَاءِ، فَيَخِرُّنَ سُجَّدًا: ﴿حَتَى إِذَا فُزِّعَ عَن قُلُوبِهِم﴾ قال: سُكِّنَ عن قُلوبهم، نادى أَهل السماء: ماذا قال ربكم؟ قالوا: الحَقُ، قال: كَذا وكَذا.

كتاب السنة لعبدالله بن أَحمد | ٥٣٠

حدثني أَبو معمر، حدثنا جرير، عن الأَعمَش، قال: وحدثنا ابن نُمَير، وأَبو معاوية: كُلهم عن الأَعمش، عن مسلم، عن مسروقٍ، عن عبدالله، قال: إِذَا تَكَلَّمَ الله عَزَّ وَجَلَ بِالوَحِي سَمِعَ صَوتَهُ أَهلُ السَّمَاءِ لَهُ صَلصَلَةً كَصَلصَلَةِ الحَديدِ عَلَى الصَّفَاءِ.

كتاب السنة لعبدالله بن أَحمد | ٥٣١

حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، حَدَّثَنَا الْأَعْمَشُ، عَنْ مُسْلِمٍ، عَنْ مَسْرُوقٍ، قَال : قَالَ عَبْدِاللَّه: إِذَا تَكَلَّمَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ بِالْوَحْيِ سَمِعَ أَهْلُ السَّمَواتِ لِلسَّمَواتِ صَلْصَلَةً كَجَرِّ السِّلْسِلَةِ عَلَى الصَّفَا، فَيَصْعَقُونَ، فَلَا يَزَالُونَ كَذَلِكَ حَتَّى يَأْتِيَهُمْ جِبْرِيلُ، حَتَّى إِذَا جَاءَهُمْ جِبْرِيلُ عَلَيهِ السَّلَام، فَإِذَا أَتَاهُمْ جِبْرِيل فُزِّعَ عَنْ قُلُوبِهِمْ، قَالُوا: يَا جِبْرِيلُ، مَاذَا قَالَ رَبُّنَا؟ فَيَقُولُ: الْحَقَّ. فَيُنَادُونَ: الْحَقَّ! الْحَقَّ!

سنن سعيد بن منصور | ٤٧٣١

حَدَّثَنَا إِسْحَاق بْنُ إِبْرَاهِيم، حَدَّثَنَا وَكِيع، حَدَّثَنَا الْأَعْمَشُ، عَنْ أَبِي الضُحَى، عَنْ مَسْرُوق، عَنْ عَبْدِاللَّه، قَالَ: إِذَا تَكَلَّمَ اللَّهُ بِالْوَحْيِ سَمِعَ أَهْلُ السَّمَاءِ لِلسَّمَاءِ صَلْصَلَةً كَصَلْصَلَةً السِّلْسِلَةِ عَلَى الصَّفوَان، فَيَخِرُّونَ سُجَدًا، ثُمَ يَرّفَعُونَ رءُوسَهُم فَيَقُولُون: ﴿ مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ قَالُوا ﴾ فَيُقَال: قَال: ﴿الحَقَّ وَهُوَ الْعَلِيُّ الْكَبِيرُ ﴾.

تعظيم قدر الصلاة للمروزي | ٢١٧

حَدَّثَنِي يَعْقوبُ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ عُلَيَّة، عَنْ دَاود، عَنِ الشَعْبِيَّ، قَالَ: قَالَ ابْنُ مَسْعُودٍ فِي هَذه الْآيَة: ﴿ حَتَى إِذَا فُزِّعَ عَن قُلُوبِهِمْ ﴾. قَالَ: إِذَا حَدَث أَمْرُ عِندَ ذِي الْعَرْشِ، سَمِعَ مَن دُونَه مِنَ الْمَلَائِكَة صَوْتًا كَجَرِّ السِّلْسِلَةِ عَلَى الصَّفَا، فَيُغْشَى عَلَيْهِيم، فَإِذَا ذَهَبَ الْفَزَعُ عَن قُلُوبِهِمْ تَنَادَوا: ﴿ مَاذا قَالَ رَبُّكُمْ ﴾؟ قَالَ: فَيَقُولُ مَنْ شَاءَ الله: قَالَ الْحَقَّ، وَهُوَ الْعَلِيُّ الْكَبِيرُ.

تفسير إِبن جرير الطبري | **(٢٧٦/١٩)**

حَدَّثَنا أَحْمَدُ بْنُ أَبِي سُرَيْجٍ الرَّازِيُّ، وَعَلِيُّ بْنُ الْحُسَيْنِ بْن إِبْرَاهِيمَ، وَعَلِيُّ بْنُ مُسْلِمٍ، قَالُوا: حَدَّثَنا أَبُو مُعَاوِيَةَ، حَدَّثَنَا الْأَعْمَشُ، عَنْ مُسْلِمٍ، عَنْ

مَسْرُوقٍ، عَنْ عَبْدِاللَّه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: « إِذَا تَكَلَّمَ اللَّهُ بِالْوَحْيِ سَمِعَ أَهْلُ السَّمَاءِ لِلسَّمَاءِ صَلْصَلَةً كَجَرِّ السِّلْسِلَةِ عَلَى الصَّفَا، فَيَصْعَقُونَ، فَلَا يَزَالُونَ كَذَلِكَ حَتَّى يَأْتِيَهُمْ جِبْرِيلُ، حَتَّى إِذَا جَاءَهُمْ جِبْرِيلُ فُزِّعَ عَنْ قُلُوبِهِمْ ». قَالَ: « فَيَقُولُونَ: يَا جِبْرِيلُ، مَاذَا قَالَ رَبُّكَ؟ فَيَقُولُ: الْحَقَّ. فَيَقُولُونَ: الْحَقَّ الْحَقَّ ».

رواه أَبو داود ا ٤٧٣٨ وهذا لفظه و سنده. والبخاري في خلق أَفعال العباد ا ٤٨٢ وابن خزيمة في كتاب التوحيد ا ١٩٤ والآجري في كتاب الشريعة ا ٦٦٩ والبيهقي في الأَسماء والصفات ا ٤٦٠ واللالكائي في شرح أُصول اعتقاد أَهل السنة ا ٥٤٨ والخطيب في تاريخ بغداد ا (٣٩١/١١)

ئەم ڕیواتە ئەوەی مەحفوظە وەقفە لەسەر عبدالله کوڕی مسعود نەک مەڕفوع بێ. الدارقطني لە عیلەلی ئەو حدیثەدا دەڵێ: الأعمش لە أبی الضحی ئەویش لە مسروق ڕیوایەتی کردووە. دواتر ئەوانەی لە الأعمش هێناویانە خیلافیان هەیە: أبو معاویە الضریر لە الأعمش دەیهێنێ بە مەڕفوعی. وە هەریەک إبراهیم الجوهری و أحمد بن أبی سریج و علی بن إشکاب لە أبو معاویە ڕیوایەتیان کردووە.

هەروەها بە هەمان شێوە قران بن تمام لە الأعمش بە مەرفوعی ڕیوایەتی کردووە.

بێجگە لەو ناوانەی هێنامانن لە ئەصحابی أبی معاویە و الأعمش بە مەوقوفی هێناویانە واتە قەولی عبدالله کوڕی مسعودە. وە لە الحسن بن عبیدالله لە أبی الضحی دووبارە بە مەرفوعی هێنراوە. إبراهیم بن بشار و سفیان بن عیینە لێیەوە ڕیوایەتیان کردووە. بەڵام ئەوەی مەحفوظە وەقفە لەسەر إبن مسعود.

قال الدارقطني: يرويه الأَعمش، عن أَبي الضحى، عن مسروق. واختلف عن الأَعمش: فرواه أَبو مُعاوية الضرير، عن الأَعمش مرفوعًا. حدَّث به عنه: إِبراهيم بن سعيد الجوهري، وأَحمد بن أَبي سريج الرازي، وعلي بن إِشكاب .

وكذالک رواه قرّان بن تمام، عن الأَعمش، وقال فيه: رفع الحديث.

ورواه أَصحاب أَبي مُعاوية غير مَن سَمَّينا وأَصحاب الأَعمش موقوفًا. ورُوِي عن الحسن بن عبيدالله، عن أَبي الضحى مرفوعًا. حَدَّثَ به عنه: إِبراهيم بن بشار، عن ابن عيينة.

والموقوف هو المحفوظ.

العلل للدارقطني | **(٨٥٢/٢)**

به هەمان شێوەی الدارقطنی الخطیب البغدادي دواى ڕیوایەت کردنی دەڵێ: ئەوەی مەحفوظە وەقفە نەک مەڕفوع.

هكذا رواه ابن أَشكاب عن أَبي مُعاوية مرفوعًا، وتابعه على رفعه أَحمد بن أَبي سريج الرَّازي، وإِبراهيم بن سعيد الجوهري، وعلي بن مسلم الطوسي جميعًا عن أَبي مُعاوية، وهو غريب. ورواه أَصحاب أَبي مُعاوية عنه موقوفًا وهو المحفوظ من حديثه.

كما أَخبرنا علي بن محمد بن عبدالله المَعَدَّل، أَخبرنا محمد بن عمرو بن البختري الرَّزَّاز، حدثنا سعدان بن نصر، حدثنا أَبو مُعاوية، حدثنا الأَعمش عن مسلم ابن صُبيح عن مسروق عن عبدالله: إِنَّ الله إِذا تكلم بالوحي سمع أَهل السماء في السماء صلصلة كجر السلسلة على الصفا، فيصعقون فلا يزالون كَذالک حَتى يأْتيهم جبريل فُزِع عن قلوبهم، فيقولون: يا جبريل ماذا قال ربک؟ قال: فيقول: الحق، قال: فينادون: الحق الحق.

تاريخ بغداد للخطيب | (٣٩٢/١١)

هەمان ڕیوایەت هەریەک لە عثمان بن سعيد الدارمى لە كتاب الرد على الجهمية بە ژمارە | ١٥٨ وإبن خزيمة لە كتاب التوحيد بە ژمارە | ١٩٥ بە مەوقوفی هێناویانە.

ئەم ڕیوایەتەی عبدالله کوڕی مسعود هەرچەندە مەوقوفە، بەڵام حوکمی ڕەفعی هەیە، چونکە ناکرێ لە بابەتێکی غەیبی و تایبەت بە زاتی الله ﷻ صەحابە قسەی کردبێ ئەگەر لە ڕەسول الله ﷺ نەیبیستبێ زیاد لەمە شاهدێکی هەیە لە حدیثی أبو هريرة کە بە صەحیحی هاتووە سعيد کوڕی منصور و محمد کوڕی إسماعيل البخارى ڕیوایەتیان کردووە:

حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، سَمِعَ عِكْرِمَةَ يَقُولُ: حَدَّثَنَا أَبُو هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، رَفَعَهُ قَالَ: « إِنَّ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ إِذَا قَضَى الْأَمْرَ مِنَّ السَّمَاءِ، ضَرَبَتِ الْمَلَائِكَةُ بِأَجْنِحَتِهَا خَضْعًا لِقَوْلِهِ، كَأَنَّهُ سِلْسِلَةٌ عَلَى صَفْوَانٍ يَنْفُذُهُمْ ذَلِكَ، فَإِذَا فُزِّعَ عَنْ قُلُوبِهِمْ قَالُوا: مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ؟ قَالُوا لِلَّذِي قَالَ: ﴿الحَقَّ وَهُوَ الْعَلِيُّ الْكَبِيرُ﴾ ».

سنن سعيد بن منصور | ٤٧٣٢

حَدَّثنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِاللَّه، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَمْرٍو، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِي اللهُ عَنْهُ، يَبْلُغُ بِهِ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: « إِذَا قَضَى اللَّهُ الْأَمْرَ فِي السَّمَاءِ، ضَرَبَتِ الْمَلاَئِكَةُ بِأَجْنِحَتِهَا خُضْعَانًا لِقَوْلِهِ، كَأَنَّهُ سِلْسِلَةٌ عَلَى صَفْوَانٍ -قَالَ عَلِيٌّ: وَقَالَ غَيْرُهُ: صَفَوَانٍ- يَنْفُذُهُمْ ذَلِكَ، فَإِذَا فُزِّعَ عَنْ قُلُوبِهِمْ قَالُوا: ﴿ مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ قَالُوا الْحَقَّ وَهُوَ الْعَلِيُّ الْكَبِيرُ ﴾ ».

رواه البخاري | ٧٤٨١

ولله الحمد ڕوونمان کردەوە کە الله جَلَّ جَلَالُهُ قسە دەکات و ئەهلی ئاسمانەکان دەنگی دەبیستن، وە ئەم حدیثە بەڵگەشە لەسەر ئەوەی کە الله جَلَّ جَلَالُهُ لە ئاسمانە، سەرنج بدەنە سەرەتاکەی دەفەرموێ: « **إِذَا قَضَى اللَّهُ الْأَمْرَ فِي السَّمَاءِ** ».



## قورئان پێکهاتووە لە حەرف و صەوت

ئەشاعیرە دەڵێن کەلامی الله حەرف و صەوت نییە، بەڵکو کەلامێکە قائم بالنفس واتە لە نەفسی الله ـدایە، ئەوەی دابەزیوە عیبارەتە لەو کەلامە، وەک پێشتریش ووتمان هەموو کەلامێک پێکهاتووە لە حەرف و صەوت هەر کەلامێک حەرف و صەوت نەبێ پێی ناوترێ کەلام، لەبەرئەوەی قورئان کەلامی الله ـیە و دەخوێنرێتەوە و دەبیسترێ کەواتە لە حەرف و صەوت پێکهاتووە، ئەوەی دەنوسرێ و دەبیسترێ و دەخوێنرێتەوە کەلامی الله ـیە، قال الله ﷻ: ﴿ وَإِذَا قُرِئَ الْقُرْآنُ فَاسْتَمِعُوا لَهُ وَأَنصِتُوا لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴾ الأعراف: ٢٠٤ ئەمە دەلالەت لەسەر ئەوە دەکات ئەوەی دەبیسترێ قورئانە، ئەوەشی گوێی لێدەگیرێ قیرائەیە کە کەلامی الله ـیە.

الله ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ الْمُشْرِكِينَ اسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّى يَسْمَعَ كَلَامَ اللهِ ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُ ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْلَمُونَ ﴾ التوبة: ٦ ئەم ئایەتە دەلیلە لەسەرئەوەی کەلامی الله ﷻ پێکهاتووە لە حەرف و صەوت وە دەبیسترێ، کەلامێک نییە لە نەفسی الله دابێ، وەک دەزانن کافر ناتوانێ کەلامی الله ﷻ لە زاتی الله ببیستێ، وە ناشزانێ

چی لە نەفسی اللە ـدایە نەک کافر بگرە هەموو ئیماندارارن بە پێغەمبەران و مەلائیکەتەکانیشەوە توانای ئەوەیان نییە بزانن چی لە نەفسی اللە ـدایە هەتا کەشفی ئەو غەیبە بکەن و بوترێ کەلامی اللە کلام قائم بالنفس، کەواتە ئەمە دەلیلێکی وازحە ئەوەی کە قاریئـ دەیخوێنێ کەلامی اللە ـیە بە حەقیقی.

کاتێک دەڵێن کەلامی اللە کلام قائم بالنفس واتە ئەو کەلامەی لە نەفسی خۆیدایە دانەبەزیوە، بەڵکو جبریل و ڕەسول اللە ﷺ لێی تێگەییون توانیویانە درک بەوە بکەن لە نەفسیدایە! ئەم قسەیەشیان باتڵە، چونکە اللە ﷻ دەفەرموێ: ﴿ أَفَتَطْمَعُونَ أَن يُؤْمِنُوا لَكُمْ وَقَدْ كَانَ فَرِيقٌ مِّنْهُمْ يَسْمَعُونَ كَلَامَ اللهِ ثُمَّ يُحَرِّفُونَهُ مِن بَعْدِ مَا عَقَلُوهُ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴾ البقرة : ٧٥ مەعلومە کەلامی اللە ـیان ڕاستەوخۆ لە زاتی اللە نەبیستووە، بەڵکو قیرائەکەیان بیستووە لە قاریئەکەوە، نەک ئەوەی لە زاتی اللە ـدایە هەتا بیگۆڕن، ئەگەر کەلام لە نەفسی اللە ـدابێ،ئەوە چۆن پێی دەگەیشتن هەتا تەحریفی بکەن، ئەمەش دەلیلە لەسەر ئەوەی ئەو کەلامەی لە موصحەفدایە کەلامی اللە ـیە بە حەقیقی.

وه الله ﷻ دەربارەی جن هەواڵمان دەداتێ: ﴿ قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ الْجِنِّ فَقَالُوا إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا ﴾ الجن : ١ ڕوون و ئاشکرایه جن کەلامی الله ـیان له زاتی الله نەبیستووه، بەڵکو کەلامی الله ـیان له قاریئـ بیستووه، دووباره دەربارەی جن دەفەرموێ: ﴿ قَالُوا يَا قَوْمَنَا إِنَّا سَمِعْنَا كِتَابًا أُنزِلَ مِن بَعْدِ مُوسَى مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ يَهْدِي إِلَى الْحَقِّ وَإِلَى طَرِيقٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴾ الأحقاف : ٣٠ خۆ جنەکان گوێیان له کتابی الله نەبووه، چونکه کیتاب نابیسترێ، بەڵکو قیرائەی قورئانیان بیستووه.

تەنانەت کافرانی قورەیش دانیان بەوەدا ناوه که ئەو کتێبه قورئانه، وه به قورئان ناویان هێناوه، الله ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا تُتْلَى عَلَيْهِمْ آيَاتُنَا بَيِّنَاتٍ قَالَ الَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَاءَنَا ائْتِ بِقُرْآنٍ غَيْرِ هَذَا أَوْ بَدِّلْهُ ﴾ يونس : ١٥ وه وتوویانه: ﴿ وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لَن نُّؤْمِنَ بِهَذَا الْقُرْآنِ وَلَا بِالَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ ﴾ سبأ : ٣١ هەروەها دەڵێن: ﴿وَقَالُوا لَوْلَا نُزِّلَ هَذَا الْقُرْآنُ عَلَى رَجُلٍ مِّنَ الْقَرْيَتَيْنِ عَظِيمٍ ﴾ الزخرف : ٣١ دووباره دەڵێن: ﴿ وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لَا تَسْمَعُوا لِهَذَا الْقُرْآنِ وَالْغَوْا فِيهِ لَعَلَّكُمْ

تَغْلِبُونَ ﴾ فصلت : ٢٦ وه دهڵێن: ﴿ وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ الْقُرْآنُ جُمْلَةً وَاحِدَةً كَذَلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِ فُؤَادَكَ وَرَتَّلْنَاهُ تَرْتِيلًا﴾ الفرقان : ٣٢ هەتا جنەکان کاتێک قورئان دەبیستن گوێی بۆ دەگرن و ئیمانی پێدەهێنن و بە کتێب و قورئان ناویان هێناوە: ﴿ قَالُوا يَا قَوْمَنَا إِنَّا سَمِعْنَا كِتَابًا أُنزِلَ مِن بَعْدِ مُوسَى مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ يَهْدِي إِلَى الْحَقِّ وَإِلَى طَرِيقٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴾ الأحقاف : ٣ ﴿ قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ الْجِنِّ فَقَالُوا إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا ﴾ الجن : ١

کافرانی قورەیش و جنۆکەش دان بەوەدا دەنێن ئەوەی ڕەسول الله ﷺ خوێندوویەتیەوە بۆیان قورئانە، وە بە کتێب ناویان هێناوە، ئاشکرایە هەرشتێک بنوسرێ لە دوو توێی کاغەزدا پێی دەوترێ کەلام، وە هەموو کەلامێکیش لە حەرف و صەوت پێکدێ، چونکە ئەگەر حەرف و صەوت نەبێ چۆن کەلام دروست دەبێ، کەچی ئەشاعیرە دەڵێن قورئان لە حەرف و صەوت پێکنەهاتووە، لە کاتێکدا ڕەسول الله ﷺ ئاماژەی بەوەداوە هەموو کەلیماتێکی ئەو قورئانە لە حەرف پێکهاتووە، وە لەسەر حەوت شێواز خوێندنەوە دابەزیوە.

پێغەمبەر ﷺ فەموویەتی: هەرکەسێک حەرفێک لە کتابی الله بخوێنێ ئەوە چاکەیەکی بۆ دەنوسرێ، وە چاکەش یەک بە دە دەنوسرێ، من ناڵێم: الم یەک حەرفە، بەڵکو "أ" حەرفێکە، "ل" حەرفێکە، "م" حەرفێکە.

قَالَ مُحَمَّدَ بْنَ كَعْبٍ الْقُرَظِيَّ: سَمِعْتُ عَبْدَاللَّه بْنَ مَسْعُودٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: « **مَنْ قَرَأَ حَرْفًا مِنْ كِتَابِ اللهِ فَلَهُ بِهِ حَسَنَةٌ، وَالْحَسَنَةُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا، لَا أَقُولُ: الم حَرْفٌ، وَلَكِنْ أَلِفٌ حَرْفٌ، وَلَامٌ حَرْفٌ، وَمِيمٌ حَرْفٌ** ».

رواه الترمذي | ٣١٣٥

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: جبریل قورئانی بۆ خوێندمەوە لەسەر یەک حەرف واتە یەک شێواز خوێندنەوە، دووبارە موڕاجەعەم کردەوە، بەردەوام داوای زیاترم لێدەکرد، ئەویش زیاتری پێدەوتم هەتا گەیشتە حەوت حەرف واتە حەوت شێوازی خوێندنەوە.

عَنِ ابْنَ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: « **أَقْرَأَنِي جِبْرِيلُ عَلَى حَرْفٍ، فَرَاجَعْتُهُ، فَلَمْ أَزَلْ أَسْتَزِيدُهُ، وَيَزِيدُنِي حَتَّى انْتَهَى إِلَى سَبْعَةِ أَحْرُفٍ** ».

رواه البخاري | ٤٩٩١ ومسلم | ١٩٠٢ وأحمد | ٢٣٧٥

**عمر کوڕی خطاب** دەڵێ: گوێم لە هشام کوڕی حکیم بوو سورەتی الفرقانی دەخوێند لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ گوێم لە قیرائەکەی گرت سەیرم کرد بە شێوازێک دەیخوێنێتەوە جیاواز لەوەی ڕەسول الله ﷺ بۆ منی خوێندبوویەوە، وەخت بوو لە نوێژەکەدا پەلاماری بدەم و سەری بگرم، بەڵام ئارامم گرت هەتا سەلامی دایەوە، ئەنجا توند یەخەی کراسەکەیم گرت و ڕامکێشا ووتم: کێ بەم شێوازە ئەو سورەتەی بۆت خوێندووەتەوە؟ ووتی: ڕەسول الله ﷺ. ووتم: درۆ دەکەی، ڕەسول الله ﷺ بۆ منی خوێندەوە بەو شێوازەی تۆ نەبوو. گرتم و بردمە خزمەت ڕەسول الله ﷺ ووتم: ئەمە بە شێوازێک قورئانی دەخوێند جیاواز بوو لەوەی بۆ منت خوێندبوویەوە. فەرمووی: « ئەی هشام ئادەی بخوێنە ». ئەویش دەستیکرد بە خوێندنەوەی بەو شێوازەی من لێوەیم بیست، ڕەسول الله ﷺ فەرمووی: « بەو شێوازە دابەزیوە ». پاشان ووتی: « ئەی عمر بخوێنە ». منیش دەستم کرد بە خوێندنەوە بەو شێوازەی بۆی خوێندبووم، ڕەسول الله ﷺ فەرمووی: « بەو شێوازە دابەزیوە، ئەم

قورئانه لەسەر حەوت حەرف و شێواز دابەزیوە، بیخوێنن لەسەر هەر شێوازێک کە دەیزان ».

عَنْ عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ، أَنَّ الْمِسْوَرَ بْنَ مَخْرَمَةَ، وَعَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَبْدٍالْقَارِيَّ حَدَّثَاهُ، أَنَّهُمَا سَمِعَا عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ يَقُولُ: سَمِعْتُ هِشَامَ بْنَ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ يَقْرَأُ سُورَةَ الْفُرْقَانِ فِي حَيَاةِ رَسُولِ اللهِ ﷺ فَاسْتَمَعْتُ لِقِرَاءَتِهِ فَإِذَا هُوَ يَقْرَأُ عَلَى حُرُوفٍ كَثِيرَةٍ لَمْ يُقْرِئْنِيهَا رَسُولُ اللهِ ﷺ، فَكِدْتُ أُسَاوِرُهُ فِي الصَّلَاةِ، فَتَصَبَّرْتُ حَتَّى سَلَّمَ، فَلَبَّبْتُهُ بِرِدَائِهِ، فَقُلْتُ: مَنْ أَقْرَأَكَ هَذِهِ السُّورَةَ الَّتِي سَمِعْتُكَ تَقْرَأُ؟ قَالَ: أَقْرَأَنِيهَا رَسُولُ اللهِ ﷺ. فَقُلْتُ: كَذَبْتَ، فَإِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَدْ أَقْرَأَنِيهَا عَلَى غَيْرِ مَا قَرَأْتَ. فَانْطَلَقْتُ بِهِ أَقُودُهُ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَقُلْتُ: إِنِّي سَمِعْتُ هَذَا يَقْرَأُ بِسُورَةِ الْفُرْقَانِ عَلَى حُرُوفٍ لَمْ تُقْرِئْنِيهَا. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: « أَرْسِلْهُ اقْرَأْ يَا هِشَامُ ». فَقَرَأَ عَلَيْهِ الْقِرَاءَةَ الَّتِي سَمِعْتُهُ يَقْرَأُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: « كَذَلِكَ أُنْزِلَتْ ». ثُمَّ قَالَ: « اقْرَأْ يَا عُمَرُ ». فَقَرَأْتُ الْقِرَاءَةَ الَّتِي أَقْرَأَنِي، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: « كَذَلِكَ أُنْزِلَتْ، إِنَّ هَذَا الْقُرْآنَ أُنْزِلَ عَلَى سَبْعَةِ أَحْرُفٍ، فَاقْرَءُوا مَا تَيَسَّرَ مِنْهُ ».

رواه البخاري | ٤٩٩٢ ومسلم | ١٨٩٩ والترمذي | ٣١٧٣ ومالك | ٤٨٤ وأَحمد | ٢٩٦ وأَبو داود الطيالسي في المسند | ٣٩ وابن أَبي شيبة في المصنف | ٣٠٧٣٣

هەروەها صەحابەش بە هەمان شێوە وتوویانە قورئان لە حەرف پێکهاتووە.

**عبدالله کوڕی مسعود** دەڵێ: خۆتان فێری ئەو قورئانە بکەن، چونکە بە ڕاستی بە خوێندنەوە هەر حەرفێکی دە چاکەتان بۆ دەنوسرێ، من ناڵێم ﴿ الم ﴾ حەرفێکە، بەڵکو « أ، ل، م » بۆ هەر حەرفێکیان دە چاکەتان بۆ دەنوسرێ.

عَنْ أَبِي الْأَحْوَصِ، عَنْ عَبْدِاللَّه رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: تَعَلَّمُوا هَذَا الْقُرْآنَ فَإِنَّكُمْ تُؤْجَرُونَ بِتِلَاوَتِهِ بِكُلِّ حَرْفٍ عَشْرَ حَسَنَاتٍ، أَمَا إِنِّي لَا أَقُولُ بِـ ﴿الم﴾، وَلَكِنْ بِأَلِفٍ وَلَامٍ وَمِيمٍ، بِكُلِّ حَرْفٍ عَشْرَ حَسَنَاتٍ.

رواه عبدالله بن مبارك في كتاب الزهد | ٨٠٨ وأَبي عبيد في فضائل القرآن | ٢٣ وابن أَبي شيبة في المصنف | ٣٠٥٣٤ والدارمي في السنن | ٣٣٣٥

پرسیار کرا له **علی کوڕی أبی طالب**: ئایا ئینسان لەش گران بێ دەتوانێ قورئان بخوێنێ؟ ووتی: نەخێر، تەنانەت نابێ یەک حەرفیش بخوێنێ.

عن عامر بن السِّمْط، عن أَبي الغريف قال: سُئِلَ علي رضي الله عنه عن الجُنُب أَيقرَأُ القرآن؟ قال: لا، ولا حرفًا.

رواه أَبي عبيد في فضائل القرآن ا ٣٢٦ وابن أَبي شيبة في المصنف ا ١٠٩٥

ووتم: ئەگەر قورئان بە حەقیقی کەلامی الله نەبوایە، بەڵکو کەلامێکی نەفسی بووایە، ئەوە چۆن خەلیفەی ڕاشد دەیوت نەخێر کەسی لەش گران نابێ تاکە حەرفێکیشی لێ بخوێنێ؟!

هیچ خیلافێک نییە لای عاممەی موسڵمانان هەرکەسێک جەحدی ئایەتێک یاخود کەلیمەیەکی کەلامی الله بکات ئەوە کافرە، کەچی ئەشاعیرە بەو هەموو فێڵ و چەواشەکارییەیان باوەڕیان نییە کە ئەو قورئانە لە حەرف و صەوت پێکهاتبێ، وە پێیان وایە کەلامی الله نییە، بەڵکو کەلامێکی نەفسییە جبریل وەک ئیلهامێک فێری بووە دواتر بە پێغەمبەری گەیاندووە! یاخود ئەو قورئانە عیبارەتە لە کەلامی الله،

کەچی هێشتا موسڵمان بن و ڕەئسەکانیان کە لێوان لێون لە تەعطیلی موعتەزیلە و جەهمییەکان ئیمام بن!

**عبدالله کوڕی مسعود** دەڵێ: هەرکەسێک کافر بێ و باوەڕی نەبێ بە حەرفێک لە قورئان، ئەوە کافرە بە هەموو قورئان.

قال عبدالله بن مسعود رَضيَ اللهُ عنه: مَن كَفَرَ بحرف منه فقد كَفَرَ به أَجمع.

شرح أُصول اعتقاد أَهل السنة للالكائي ا ٣٧٩

**شعیب** دەڵێ: أَبو العالیە قورئانی بۆ خەڵکی دەخوێند و فێری دەکردن، هەرکات کەسێک غەڵەتی بکردایە، ئەم بۆی ڕاست بکردایەتەوە نەیدەوت: بەو شێوەیە نییە، بەڵکو دەیوت: بەم شێوەیە بیخوێنەوە. ئەمەم بۆ إبراهیم النخعی گێڕایەوە، ووتی: پێم وایە هاوڕێکەتان ئەو قەولەی بیستووە: هەرکەسێک کافر بێ و باوەڕی نەبێ بە حەرفێک، ئەوە کافر بووە بە هەمووی.

عن شُعَيبٍ قال: كَان أَبو العالية يُقرئ الناس القرآن، فإِذا أَراد أَن يُغَيِّرَ الرَجُلَ لم يقل: ليس كذا وكذا، ولكنه يقول: إقرأ آية كذا .

فذكرته لإِبراهيم، فقال: أَظُنُ صاحبكم قد سمع: أَنَّ مَن كفر بحرفٍ مِنه فقد كفر به كُله.

المصنف لابن أَبي شيبة | ٣٠٧١٥

ووتم: سەرنج بدەن سەلەف چەندە سەلامەت بوون لە ڕووی عەقیدەوە هەتا ئەو ئاستەی خۆیان پاراستووە تووشی غەڵەت بین هەموو دەرگایەکیان بە ڕووی باتڵدا داخستووە، أبو العاليه الرياحي تابعی بووە خەمی بووە ئەگەر بەو کەسانەی غەڵەت دەکەن لە قیرائەدا بڵێ: ئەو ئایەتە وانییە بچێتە ژێر هەڕەشەی ڕەتکردنەوەی حەرفێک لە قورئان، کەچی ئەشاعیرە کولییەن باوەڕیان نییە بەوەی قورئان لە حەرف پێکهاتبێ!

**إبن الحنبلی** دەڵێ: ئەگەر بە یەکێکیان بڵێی ئەوەی دەیخوێننەوە چییە؟ دەڵێ: کەلامی خوێنەرەکە حەرف و صەوت و لوغەیە، وە الله بەو جۆرە وەصف ناکرێ وە بە حەرف و صەوت قسە ناکات، نە بەزمانی عەرەبی نە بەهیچ زمانێکی تر، هەرکەسێک باوەڕی وابێ کە کەلامێکی لە الله ﷻ بیستووە بە ئەندامی گوێی ئەوە کافرە، جا ئەو کەسە مەلائیکە بێ یاخود بەنی ئادەم.

پاشان ئەگەر پرسیاری لێبکەی دەربارەی موصحەف دەڵێ: ڕەنگێکە بە مورەکەب لە پێستەی حەیوان نوسراوە پێکهاتووە لە هەندێک حەرفی پێکەوە کۆکراوە، دروست کراوی دەستی نوسەرە، داهێنراوێکی دروست کراوە، هەرکەس بڵێ ئەوە قورئانە الله ﷻ فەرموویەتی، ئەوە کافرە.

وە لازمی موعتەقەد و قسەیان ئەوە واجب دەکات لایان ئیهانەی موصحەف بکرێ، وە فەرق و جیاوازی نییە بە لایانەوە ئەگەر کەسێک شتێک دروست بکات لەسەر وەرەقەیەکی سپی، یاخود خۆی پێ پاک بکاتەوە، لەگەڵ ئەو کەسەی هەمان شت ئەنجام دەدات لەسەر ئەو وەرەقانە کاتێک قورئانیان لەسەر دەنوسرێ، چونکە بە لایانەوە ڕەشییە لەسەر سپی، بەمەش واجبێتی ئیهانەی دەشەرعێنن.

إِن قيل للمسؤل منهم هذا الذي يقرؤه القارئُ ما هُوَ؟ قال: كلام القارئ حرف وصوت ولغة، والله لا يوصف بذالک ولا يتكلم بحرفٍ ولا صوتٍ، ولا لغةٍ ولا عربيةٍ ولا غير ذالک مِنْ اللغات، ومَن يعتقد عندهم أَنَّ أَحدًا مِنَ الخلق سَمِعَ مِنَ اللهِ كلامًا بِجَارحةِ أُذُنِه فهو كافر، مِن مَلَكٍ أَو آدميٍ.

ثُمَّ تسألُهُ عَنِ المُصحَف فيقول: أَصباغُ وأَلوانٌ وإِهاب وأَوراقٌ وأَشكالٌ مُلفَّقَةٌ وحروفٌ مُجمَعةٌ، صُنعَةُ الكاتبِ، مخلوقٌ مُحدثٌ، ومَن قال فيه قرآن تُكلمَّ به، فهُوَ عندهم كافر.

ويجب عندهم من مقتضى مُعتقدِهم إِهانة هذا المصحف، ولا يُفرقُ بينَ مَنْ أَحدثَ على ورَقٍ بَياضٍ، أَوِ امتَسحَ به نَجوَةً، وبينَ مَن فَعَلَ ذالك الورق بعد كتَبِهِ القرآن فيه، إِذ هُوَ سَواد في بياضٍ، فيوجبونه إِهانَتَه.

الرسالة الواضحة لابن الحنبلي ا صـ: ٤٦١

وه ڕەسول الله ﷺ شکاتی خۆی گەیاندووەتە الله ﷻ کە قەومەکەی قورئانیان هەجر کردووە: ﴿ وَقَالَ الرَّسُولُ يَا رَبِّ إِنَّ قَوْمِي اتَّخَذُوا هَٰذَا الْقُرْآنَ مَهْجُورًا ﴾ الفرقان : ٣٠ ﴿ هَذَا ﴾ ئیشارەتە بۆ حازر و ئامادە کە بە گوێیەکانیان بیستوویانە، وە لە دڵەکانیشیاندا حفظیان کردووە، وە لە موصحەفەکانیان نوسیویانەتەوە، وە الله ﷻ لە پەنجا و ئەوەندە ئایەتتدا دەفەرموێ: ﴿ هَذَا الْقُرآنِ ﴾ ئیشارەت دەکات بۆ حازری کافرانی قوڕەیش کە ئیثباتی وجوودی قورئانیان کردووە، بە موخالەفە کردنی هەجریان کردووە، بەڵام ئەمانە ئینکاری دەکەن و نەفی وجوودی

دەکەن و شاهێد و گەیێنەران و هەڵگرانی بەدرۆ دەخەنەوە، فإنا لله وإنا إليه راجعون لەو فیتنەیەی لە ئوممەتی ئیسلام دەرکەوتووە، وە ئەم بەڵا و موصیبەتەی کە هەموو ئیسلام هەڵدەوەشێنێتەوە!

الرسول ﷺ أَخبر الله تعالى عن نِيَاحَته بقوله: ﴿ وَقَالَ الرَّسُولُ يَا رَبِّ إِنَّ قَوْمِي اتَخَذُوا هَذَا الْقُرآنَ مَهْجُورًا ﴾ الفرقان : ٣٠

وهذا إِشارة إِلى حاضرٍ سمعوه بآذانهم، وحفظوه في قلوبهم، وكتبوه في مصاحفهم، والله يقول في القرآن في نيِّف وخمسين آية ﴿ هَذَا الْقُرآنِ ﴾ إِشَارَة إِلَى حَضَارَةِ كُفار قريش، أَثبتوا وجوده، وهجروه بالمخالفة، وهؤُلاء جحدوه ونَفوا وجوده وكذَّبوا شهوده، فإِنا لله وإِنا إِليه راجعون على ما ظهر في هذه المِلَّةِ الإِسلامية من هذه الفتنةِ، والبَلِيَّة المُبطلة لدين الإسلام بالكلية!

الرسالة الواضحة لابن الحنبلي ١ صـ : ٤٨٥

هەروەها دەڵێ: بزانە برام الله ئێمە و ئێوەش مۆفەق بکات أبو الحسن الأشعری کە موبتەلا بوو بەو مەزهەبە مەبەستی حەقیقی لە نەفی کردنی کەلام کە حەرف و صەوت بێ تەنها قورئان نەبوو، بەڵکو مەبەستی پووچەڵ کردنەوەی هەموو ئەو کەلامەیە کە هەموو پێغەمبەران صلوات

الله عليهم هێناویانه له هەواڵدان دەربارەی قیامەت و وەستانی عەبدەکان له بەردەم الله ﷻ له قیامەتدا، وه به قەولی الله بۆ هەریەکمان که پێمان دەڵێ: ئەی عەبدەکەم عەبدەکەش دەڵێ: بەڵێ ئەی گەورەم. ئەو زاتەی لەم دونیا تەنیا لەگەڵ پێغەمبەر موسى ﷺ قسەی کردووه، وه سبەینێ له قیامەتدا هەموویان وەک موسى صەوتی کەلامەکەی دەبیستن و قسەیان لەگەڵ دەکات له بەهەشتدا به چاویش دەیبینن.

واعلم يا أَخي وفقنا الله وإِياك أَنَ الأَشعري الذي أُبتُلي بهذا المذهب لم يكن قصده بنفي الكلام الحقيقي الذي هو حرف والصوت إِبطال القرآن فقط، وإِنما كان قصده ومدارهُ إِبطال جميع ما جاءت به الأَنبياء صلوات الله عليهم مِن أَخبار القيامة، ووقوف العباد بين يدي الله للحساب، وبقول الواحد مِنا: يا عبدي فيقول العبد: يا مولايَ. المُكلَّم في الدنيا موسى وحده، وغدًا يوم القيامة يصير المؤمنون كُلهم موسى في سماع كلام الله، في عرصاتِ يوم القيامة، في الجنة مع رؤيته بالأَبصار.

الرسالة الواضحة لابن الحنبلي ا صـ: ٥٢١

**إبن قدامه** دەڵێ: یەکێک له وازحترین دەلیلەکان لەسەر ئەوەی که قورئان کەلامی الله ـیه ﷻ له حەرف پێکهاتووه ئەوەیه کاتێک

کافرەکانی قورەیش دەیانوت: ئەم قورئانە شیعرە، الله ﷻ ڕەدی دانەوە کە من شیعرم فێری ڕەسول نەکردووە و ناکرێ فێری شیعر ببێ، بەڵکو ئەوەی بۆم دابەزاندووە قورئانێکی وازح و ڕوونە: ﴿ وَمَا عَلَّمْنَاهُ الشِّعْرَ وَمَا يَنبَغِي لَهُ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ وَقُرْآنٌ مُّبِينٌ ﴾ هەر شتێک حەرف نەبێ ناکرێ شیعر بێ لای هیچ کەسێک، کاتێک بە شیعر ناویان هێناوە بە دڵنیاییەوە دیارە مەبەستیان لێی ئەو قورئانە عەرەبییەیە، وە کاتێک الله ﷻ نەفی کرد لەوەی شیعر بێ، وە قورئان بوونی چەسپاند، هیچ شوبهەیەک بۆ خاوەن عەقڵێک نەماوە لەوەی کە ئەو قورئانە پێکهاتووە لەو سورەت و ئایەتانەی لە ناو موصحەفدایە.

هەروەها هەندێکی تریان وتوویانە: ﴿ إِنْ هَذَا إِلَّا قَوْلُ الْبَشَرِ ﴾ المدثر : ٢٥ الله سبحانە ڕەدی دانەوە: ﴿ سَأُصْلِيهِ سَقَرَ ﴾ المدثر : ٢٦ مەبەست لەم قسانەیان ئیشارەتە بۆ ئەو قورئانە.

هەروەها الله ﷻ داوای لە کافرانی قورەیش کرد کە بتوانن شتێک بێنن بەدیلی ئەو قورئانە بێ: ﴿ وَإِذَا تُتْلَى عَلَيْهِمْ آيَاتُنَا بَيِّنَاتٍ قَالَ الَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَاءَنَا ائْتِ بِقُرْآنٍ غَيْرِ هَذَا أَوْ بَدِّلْهُ ﴾ ئایا وای دەبینن کە

داوای لێیان کردووە ئەوە بگۆڕن لە ناو نەفسی الله ـدایە کە نازانن چییە؟! پاشان چۆن چۆنی دەزانن ئەوەی لە نەفسی الله ـدایە قورئانە؟! بە چ ڕێگایەک بەوە گەیشتن؟! خاوەنی ئەم مەقالەیە هێشتا خەلق نەکراوە ئەو شتانە بزانێ.

ومن أَوضح الدلائل على ذالک: أَنَّ الكفار قالوا: هذا شِعرٌ، فَرَدَ الله سبحانه عليهم بقوله: ﴿ وَمَا عَلَّمْنَاهُ الشِّعْرَ وَمَا يَنبَغِي لَهُ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ وَقُرْآنٌ مُّبِينٌ ﴾ يس : ٦٩ وما ليس بحروفٍ لا يجوز أَن يكونَ شِعرًا عند أَحَدٍ، فلما سمَّوه شِعرًا عُلِم يقينًا أَنَّهم إِنما أَرادوا بذالک النظم العربي، فلما نفى الله عنه كونه شِعرًا، وأَثبته قرآنًا، لم تبقَ شُبهة لذي عقل أَنَّ القرآن هو هذه السُّور والآيات.

وقال بعضهم: ﴿ إِنْ هَذا إِلَّا قَوْلُ الْبَشَرِ ﴾ المدثر : ٢٥ فقال سبحانه: ﴿ سَأُصْلِيهِ صَقَرَ ﴾ المدثر : ٢٦ وما كانوا يشيرون بهذا القول إِلا إِلى هذا الكتاب العزيز.

وأَيضًا فإِنهم طَلَبوا بالإِتيان بِبَدلِه، قال الله تبارک وتعالى: ﴿ وَإِذَا تُتْلَى عَلَيْهِمْ آيَاتُنَا بَيِّنَاتٍ قَالَ الَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَاءَنَا ائْتِ بِقُرْآنٍ غَيْرِ هَذَا أَوْ بَدِّلْهُ﴾ يونس : ١٥ أَفتراهم طلبوا تبديل ما في نَفْسِ البارئ مما لا يعلمونه

ولا يدرونه ما هوَ؟! ثم كيف علموا أَنَّ في نَفْسِ الله تعالى قرآنًا؟! وبأَي طريق وَصَلَ إِليهم؟! هذا وما كان قائل هذا المقالة خُلِق بَعْدُ.

رسالة في القرآن كلام الله لابن قدامة | صـ : ٣٩-٣٨

**إبن قدامه** دەڵێ: ئەشاعیرە کاتێک ئیحتجاج دەکەن بەوەی قورئان مەخلوقە، دەڵێن دووبارە و چەند جارەیە و جیاکاری تێدایە، هەر شتێک بەم جۆرەبێ ئەوە مەخلوقە.

بە قسەی ئەوان بێ ئەوە دەبێ تەورات هەمان قورئان بێ، وە ئینجیل هەمان زەبور بێ! وە موسی کاتێک تەوراتی بۆ دابەزی، ئەوە هەرچی کتێبەکانی الله ﷻ هەیە بۆی دابەزیوە، وە پێغەمبەرمان ﷺ کاتێک قورئانی بۆ دابەزی ئەوە تەورات و ئینجیل و زەبوری بۆ دابەزیوە، وە هەرکەسێک یەک ئایەت لە قورئان بخوێنێ، ئەوە هەموو قورئانی خوێندووەتەوە، وە هەرکەسێک هەندێکی لێ حفظ بکات ئەوە هەمووی حفظ کردووە، ئیتر پێویست ناکات کەس خۆی ماندوو بکات لە حفظ کردنی قورئاندا، چونکە بە حفظ کردنی ئایەتێک لە قورئان هەموو قورئانی لەبەرکردووە.

بەم پێیە پێغەمبەر ﷺ کاتێک ئایەتێک لە قورئانی بۆ دابەزی، ئەوە هەمووو قورئانی بۆ دابەزیوە، وە هەمووو تەورات و ئینجیل و زەبوری بۆ دابەزیوە! ئەمە سەرشۆڕی و زەلیلی خاوەن قەول نیشان دەدات.

واحتجوا على كون هذه السور مخلوقة، بأَنَّها تَتَعدد، ولا يتعدد إِلا المخلوق...

ويجب على هذا أَنَّ تكون التوراة هي القرآن والإنجيل والزبور، وأَنَّ موسى لما أُنزلت عليه التوراة، فقد أُنزل عليه كُل كتاب الله تعالى، وأَنَّ نبينا عليه السلام لما أُنزل عليه القرآن، فقد أُنزلت عليه التوراة والإِنجيل والزبور، وأَنَّ من قرأَ آية من القرآن فقد قرأَ كُل كتاب الله تعالى، ومَن حَفِظَ شيئًا منه فقد حفظ كُلَّه.

ويجب على هذا أَن لا تتعب أَحَد في حفظ القرآن، لأَنَّه يحصل له حفظ كل كتاب الله تعالى بحفظ آية منه.

ويجب أَن يكون النبي ﷺ لما أُنزل آية مَنَ القرآن، قد أُنزل عليه جميعه وجميع التوراة والإِنجيل والزبور. وهذا خزي على قائله، ومكابرة لنفسه.

المناظرة في القرآن لابن قدامة | صـ : ١٩

ووتم: ئەگەر ئەو قەولەیان دروست بێ کە گوایە قورئان حەرف و صەوت نەبێ، وە کەلامی الله ﷻ هەمووی یەک دانەبێ بەو جۆرە نازانرێ تەفسیری ئایەتەکان چییە، ئەگەر هەموو ئایەت و سورەتەکان یەک دانە بن کەواتە هەموویان یەک مانا و تەفسیریان هەیە، کەسی عاقڵ ئەمە ناڵێ، ڕوونە پێش دەلیل بە ڕێگەی عەقڵ قسەکانتان پووچەڵ دەبێتەوە.

پاشان کە دەڵێن کەلامی الله ﷻ لە حەرف پێکنەهاتووە، ئەی چیدەکەن لەو حدیثانەی کە ڕەسول الله ﷺ فەرموویەتی بیخوێنن؟ ئەگەر هەموویان یەک مانایان هەبووایە سوود چییە لەوەی هەر یەکەیان لە حاڵەت و کاتێکی جیاوازدا بخوێنرێ؟! ئەگەر بەو جۆرەیە چیدەکەن لە حدیثی: « قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ لە سێ بەش ئەجری بەشێکی قورئانی هەیە »؟ یاخود حدیثی: « هەرکەسێک دوو ئایەتی کۆتایی سورەتی البقرة بخوێنێ بەسیەتی و پارێزراوە »؟ هەروەها حدیثی: « سورەتی البقرة، آل عمران بخوێنن، چونکە لە قیامەتندا دێن دەبنە سێبەر بۆتان »؟

أبو سعید الخدری دەڵێ: پیاوێک گوێی لێبوو پیاوێکی تر سورەتی ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ﴾ دەخوێند و دووبارەی دەکردەوە، کاتێک ڕۆژ

بوویەوە هات بۆ لای ڕەسول الله ﷺ ئەوەی بۆ باس کرد، ئەو پیاوە بابەتەکەی بە کەم تەماشا دەکرد، ڕەسول الله ﷺ فەرمووی: « سوێند بەو زاتەی گیانمی بە دەستە، ئەو سورەتە یەک بەشە لە سێ بەشی قورئان ».

عَنْ أَبِي سَعِيدٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، أَنَّ رَجُلًا سَمِعَ رَجُلًا يَقْرَأُ: ﴿ قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ﴾ يُرَدِّدُهَا، فَلَمَّا أَصْبَحَ، جَاءَ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ، وَكَأَنَّ الرَّجُلَ يَتَقَالُّهَا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، إِنَّهَا لَتَعْدِلُ ثُلُثَ الْقُرْآنِ ».

رواه البخاري | ٦٦٤٢ وأحمد | ١١٣٠٦

أبی الدرداء دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: « کەستان هەیە نەتوانێ لە شەوێکدا لە سێ بەشی قورئان بەشێکی بخوێنێ؟ ». ووتیان: جا چۆن دەکرێ؟ « فەرمووی: ﴿ قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ﴾ یەکسانە بە پاداشتی یەک لەسەر سێی قورئان ».

عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: « أَيَعْجِزُ أَحَدُكُمْ أَنْ يَقْرَأَ فِي لَيْلَةٍ ثُلُثَ الْقُرْآنِ؟ ». قَالُوا: وَكَيْفَ يَقْرَأُ ثُلُثَ الْقُرْآنِ؟ قَالَ:

«﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ﴾ تَعْدِلُ ثُلُثَ الْقُرْآنِ». رواه مسلم | ١٨٨٦ وأحمد | ٢١٧٠٥

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: دوو ئایەتی کۆتایی سورەتی البقرة هەرکەسێک لە شەودا بیانخوێنێ بەسیەتی و پارێزراوە لە شەڕ و خراپە.

عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الْبَدْرِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «الْآيَتَانِ مِنْ آخِرِ سُورَةِ الْبَقَرَةِ مَنْ قَرَأَهُمَا فِي لَيْلَةٍ كَفَتَاهُ».

رواه البخاري | ٥٠٤٠ ومسلم | ١٨٧٨ وأحمد | ١٧٠٩١ والدارمي | ٣٤١٥

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: قورئان بخوێنن، چونکە لە ڕۆژی قیامەتدا دێ دەبێتە شەفیع بۆ خاوەنەکەی، دوو سورەتە ڕووناکەکە بخوێنن: البقرة و آل عمران، لەبەرئەوەی لە قیامەتتدا دێن دەبنە سێبەر بۆ خاوەنەکەیان، یاخود وەک چۆن کۆمەڵە تەیرێک لە تەنیشت یەکەوە باڵ ڕابخەن سێبەر دروست بکەن ئەوانیش بەو جۆر سێبەر بۆ خاوەنەکەیان دروست دەکەن، سورەتی البقرة بخوێنن، بەردەوام خوێندنەوەی بەرەکەتە، وازهێنان لێی خەسارەتە، وە ساحیرەکان ناتوانن بیخوێنن.

عَنْ أَبُو أُمَامَةَ الْبَاهِلِيُّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: « اقْرَءُوا الْقُرْآنَ، فَإِنَّهُ يَأْتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ شَفِيعًا لِأَصْحَابِهِ، اقْرَءُوا الزَّهْرَاوَيْنِ: الْبَقَرَةَ وَسُورَةَ آلِ عِمْرَانَ، فَإِنَّهُمَا تَأْتِيَانِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كَأَنَّهُمَا غَمَامَتَانِ، أَوْ كَأَنَّهُمَا غَيَايَتَانِ، أَوْ كَأَنَّهُمَا فِرْقَانِ مِنْ طَيْرٍ صَوَافَّ، تُحَاجَّانِ عَنْ أَصْحَابِهِمَا. اقْرَءُوا سُورَةَ الْبَقَرَةِ، فَإِنَّ أَخْذَهَا بَرَكَةٌ، وَتَرْكَهَا حَسْرَةٌ، وَلَا تَسْتَطِيعُهَا الْبَطَلَةُ ». قَالَ مُعَاوِيَةُ: بَلَغَنِي أَنَّ الْبَطَلَةَ: السَّحَرَةُ.

رواه مسلم ا ١٨٧٤ وأحمد ا ٢٢١٤٧

**عبدالله کوڕی عباس** دەڵێ: جبریل لای پێغەمبەر ﷺ دانیشت بوو، لە ڕاسەریەوە دەنگێکی بیست سەری بەرزکردەوە و ووتی: « ئەوە دەرگایەکی ئاسمان بوو کرایەوە یەکەم جارە بکرێتەوە، مەلائیکەیەک لێیەوە دابەزی بۆ سەر زەوی، یەکەم جاریەتی دابەزێ، سەلامی کرد، ووتی: موژدەی دوو نوورت پێ دەدەم کە بە هیچ پێغەمبەرێکی پێش تۆم نەداوە: سورەتی الفاتحة، لەگەڵ ئایەتەکانی کۆتایی سورەتی البقرة، هەر حەرفێک لێیان بخوێنی و داواکاریت هەبێ پێتی دەبەخشرێ ».

عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: بَيْنَمَا جِبْرِيلُ قَاعِدٌ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ سَمِعَ نَقِيضًا مِنْ فَوْقِهِ، فَرَفَعَ رَأْسَهُ، فَقَالَ: « **هَذَا بَابٌ مِنَ السَّمَاءِ فُتِحَ الْيَوْمَ لَمْ يُفْتَحْ قَطُّ إِلَّا الْيَوْمَ، فَنَزَلَ مِنْهُ مَلَكٌ، فَقَالَ: هَذَا مَلَكٌ نَزَلَ إِلَى الْأَرْضِ لَمْ يَنْزِلْ قَطُّ إِلَّا الْيَوْمَ، فَسَلَّمَ، وَقَالَ: أَبْشِرْ بِنُورَيْنِ أُوتِيتَهُمَا لَمْ يُؤْتَهُمَا نَبِيٌّ قَبْلَكَ: فَاتِحَةُ الْكِتَابِ، وَخَوَاتِيمُ سُورَةِ الْبَقَرَةِ، لَنْ تَقْرَأَ بِحَرْفٍ مِنْهُمَا إِلَّا أُعْطِيتَهُ** ».

رواه مسلم | ١٨٧٧

بەمەش ڕوون دەبێتەوە کە قورئان هەمووی یەک دانە نییە، بەڵکو پێکهاتووە لە سورەت و ئایەت و حەرف، ئەگەر هەمووی یەک دانە بووایە، ئەوە چ واتایەکی هەبوو **(١١٤)** سورەتەکەی قورئان، ئەگەر سورەتی الفاتحة هەمان مانای سورەتی البقرەی هەبێ ئەوە نوێژکەر دەتوانێ لە نوێژدا سورەتی الفاتحة نەخوێنێ لە جیاتی ئەو سورەتی البقرة بخوێنێ! وە ئایەتەکانی کاتی نوستن لەگەڵ دوای نوێژ هیچ فەرقی نییە هەرکامیان بخوێنی هەر مەبەست دەپێکێ! وە ئەوکاتیش پێویستی نەبوو صەحابە و تابعین و ئەتباعی تابعین دانیشن تەفسیری قورئان بکەن کە قورئان هەمووی یەک مانای هەبێ ئیتر تەفسیر هەڵناگرێ !

الله ﷻ وەصفی کەلامی خۆی دەکات کە نەبڕاوەیە هەموو ئاوی دەریاکان ببنە مورەکەب هێشتا کەمە لەبەرامبەر کەلامی الله ـدا: ﴿ قُل لَّوْ كَانَ الْبَحْرُ مِدَادًا لِّكَلِمَاتِ رَبِّي لَنَفِدَ الْبَحْرُ قَبْلَ أَن تَنفَدَ كَلِمَاتُ رَبِّي وَلَوْ جِئْنَا بِمِثْلِهِ مَدَدًا ﴾ الكهف : ١٠٩ کەچی ئەشاعیرە پێیان وایە کەلامی الله ﷻ یەک دانەیە تەعەدودی تێدا نییە!

دەبارەی بیستن ئەوە بابەتێکە لای هەموو بەنی آدم ڕوون و وازحە کە بیستن بە حەقیقی ڕوونادات ئەگەر صەوت نەبێ واتە ئەم دووانە گرێ دراون بە یەکەوە، کاتێک بیستن ڕوویدا کەواتە دەنگ مەوجوودە، جا لەبەرئەوەی قورئان بە حەقیقی کەلامی الله ـیە بە هەموو جۆرێک ئەوەی لە ناو دڵ و سنگی ئینسانەکاندایە، ئەوەی لە ناو موصحەفەکاندایە، ئەوەشی دەخوێندرێ هەمووی کەلامی الله ـیە، وە پێکهاتووە لە حەرف و صەوت، کاتێک کەسێک دەیخوێنێ و خەڵکیش گوێ بیستی دەبێ ئەمە دەلالەتێکی وازحە لەسەر ئەوەی ئەو کەلامەی الله ﷻ حەرف و صەوتە.

الله ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ الْمُشْرِكِينَ اسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّى يَسْمَعَ كَلَامَ اللهِ ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُ ﴾ التوبة : ٦ ئەگەر هاتوو موشریکێک خۆی پەنادا بۆ ئەوەی کەلامی الله ببیستێ ئەوە ڕێگەی پێبدەن هەتا گوێ بیست بێت و پاشان بە سەلامەتی بگاتەوە جێی خۆی. ئەگەر کەلام صەوت نەبووایە بیستن چ واتایەکی دەبەخشی؟!

هەروەها بە پێغەمبەر موسی ﷺ دەفەرموێ: ﴿ وَأَنَا اخْتَرْتُكَ فَاسْتَمِعْ لِمَا يُوحَى ﴾ طه : ١٣ تۆم هەڵبژاردووە بە پێغەمبەری خۆم کەواتە گوێ بگرە بۆ ئەو وەحییەی بۆت دەکرێ.

ئەگەر کەلامی الله ﷻ صەوت نەبێ ئیتر چۆن موشریک گوێ دەگرێ بۆی؟ وە پێغەمبەر موسی ﷺ بۆ ئەمری پێ دەکرا گوێ بگرێ بۆ ئەو وەحیەی بۆی دادەبەزێ؟!

الله ﷻ ئەو قورئانەی بە عەرەبی ناو هێناوە کە کەلامەکەیەتی، بەو جۆرە دەردەکەوێ پێکهاتووە لە حەرف، بۆچی نا لە کاتێکدا سەرەتای چەند سورەتێک بە حەرف دەستیان پێکردووە، وەک:﴿ الٓمٓ ﴾ و ﴿الٓر﴾ و ﴿ الٓمٓصٓ ﴾ و ﴿ الٓمٓر ﴾ و ﴿ كٓهيعٓصٓ ﴾ و ﴿ طه ﴾ و ﴿ طسٓمٓ﴾

و ﴿ طسٓ ﴾ و ﴿ يسٓ ﴾ و ﴿ صٓ ﴾ و ﴿ حمٓ ﴾ و ﴿ عسٓقٓ ﴾ و ﴿قٓ ﴾ و ﴿ نٓ ﴾ ئەمانە سەرەتای ئەو سورەتانەن ئایەتێکن لە ئایەتەکانی ئەو سورەتانە، ئەگەر قورئان لە حەرف پێکنەهاتبایە ئەوە چۆن الله ﷻ سەرەتای سورەتەکانی بە حەرف دەست پێدەکرد؟ کەواتە ڕوون و وازحە قورئان پێکهاتووە لە حەرف.

قَالَ اللهُ ﷻ: ﴿ وَمَا عَلَّمْنَاهُ الشِّعْرَ وَمَا يَنبَغِي لَهُ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ وَقُرْآنٌ مُّبِينٌ ﴾ يس : ٦٩

الله ﷻ هەواڵی پێداوین کە ئەوەی کافرانی قوڕەیش پێی دەڵێن شیعر قورئانە، هەر شتێک حەرف نەبێ ئەوە لای هیچ کەسێک نابێتە شیعر و بە شیعر ناو ناهێنرێ، کاتێک کە موشریکینی قوڕەیش بە شیعر ناویان هێناوە کەواتە وازحە لە حەرف پێکهاتووە.



## الله ﷻ هەرکات بیەوێ قسە دەکات

الله ﷻ قسە دەکات هەرکات ویستی لێبێ، بە بێ ئەوەی بڵێین دەم و زمان و لێو، وە دەسەڵاتی ئەوەی هەیە چەندان ماددە و بارستەی مردوو بێ زمان بهێنێتە قسە.

ئەشاعیرە دەڵێن صەوت ئیللا دەبێ لە نێوان دوو شەویلگە و لێوەوە دەربچێ "هواء مُنخَرِقٌ بين جرمَين" ئەمە ووتەیەکی باتڵە، نابێ بدرێتە پاڵ زاتی الله ﷻ، چونکە نەقصە بۆی .

لە چەندین حدیثدا هاتووە « بەردێک سەلامی لە ڕەسول الله ﷺ کردووە ». وە « خواردن لە ناو دەستەکانیدا تەسبیحاتی کردووە ». وە «بنکی داری خورما گریاوە دەنگی لێوە هاتووە کاتێک ڕەسول الله ﷺ جێی دەهێڵێت و دەچێتە سەر میمبەر ووتار بدات ». ئەمانە هیچیشیان ئەندامی قسە کردنیان نییە و هاتووشنەتە قسەکردن، کەواتە دەڵێین الله ﷻ قسە دەکات، بەڵام بەو جۆرەی ئەشاعیرە وەصفی چۆنیەتی قسە کردنەکەی ناکەین.

**جابر کوڕی سمره** دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرمووی: من بەردێک دەناسم لە مەککە پێش ئەوەی ببمە پێغەمبەر سەلامی لێدەکردم، ئێستاش ئەو بەردە دەناسم و دەزانم لە کوێیە.

عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: { **إِنِّي لَأَعْرِفُ حَجَرًا بِمَكَّةَ كَانَ يُسَلِّمُ عَلَيَّ قَبْلَ أَنْ أُبْعَثَ، إِنِّي لَأَعْرِفُهُ الْآنَ** }.

رواه مسلم | ٥٩٣٩ والترمذي | ٣٩٥٢ وأحمد | ٢٠٨٢٨

**عبدالله کوڕی مسعود** دەڵێ: ئێمە ڕووداو موعجیزاتەکانمان وەک بەرەکەت سەیر دەکرد لە کاتێکدا ئێوە وەک ترس و تۆقاندن سەیری دەکەن، ئێمە لەگەڵ ڕەسول الله بووین ﷺ لە سەفەرێکدا ئاو کەم بوو، فەرمووی: « هەندێک ئاوم بۆ بهێنن ». قاپێکیان بۆ هێنا تۆزێک ئاوی تێدا بوو، دەستی خستە ناو قاپەکە ئەنجا فەرمووی: « **حَيَّ عَلَى الطَّهُورِ الْمُبَارَكِ، وَالْبَرَكَةُ مِنَ اللَّه** ». من دەمبینی ئاو لە نێوان پەنجەکانی ڕەسول الله ﷺ هەڵدەقوڵا. وە ئێمە دەمان بیست خواردن لە ناو دەستیدا تەسبیحاتی دەکرد لە کاتی خواردنیدا.

عَنْ عَبْدِاللَّه رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: كُنَّا نَعُدُّ الآيَاتِ بَرَكَةً، وَأَنْتُمْ تَعُدُّونَهَا تَخْوِيفًا، كُنَّا مَعَ رَسُولِ الله ﷺ فِي سَفَرٍ فَقَلَّ الْمَاءُ، فَقَالَ: «**اطْلُبُوا فَضْلَةً مِنْ مَاءٍ**». فَجَاءُوا بِإِنَاءٍ فِيهِ مَاءٌ قَلِيلٌ، فَأَدْخَلَ يَدَهُ فِي الإِنَاءِ ثُمَّ قَالَ: «**حَيَّ عَلَى الطَّهُورِ الْمُبَارَكِ، وَالْبَرَكَةُ مِنَ اللَّه**». فَلَقَدْ رَأَيْتُ الْمَاءَ يَنْبُعُ مِنْ بَيْنِ أَصَابِعِ رَسُولِ الله ﷺ. وَلَقَدْ كُنَّا نَسْمَعُ تَسْبِيحَ الطَّعَامِ وَهُوَ يُؤْكَلُ.

رواه البخاري ا ٣٥٧٩ والترمذي ا ٣٦٩١ وأحمد ا ٤٣٩٣

**عبدالله كوڕى عمر** دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لەسەر بنكى دارخورما ووتارى دەدا، كاتێک میمبەرى بۆ دروست كرا ئیتر بنكى خورماكەى جێهێشت، ئەو بنكى خورمایە دەستى كردە گریان، هەتا ڕەسول الله ﷺ لەسەر میمبەرەكە هاتە خوارەوە دەستى پێدا هێنا ژیرى كردەوە.

**عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَخْطُبُ إِلَى جِذْعٍ، فَلَمَّا اتَّخَذَ الْمِنْبَرَ تَحَوَّلَ إِلَيْهِ، فَحَنَّ الْجِذْعُ، فَأَتَاهُ فَمَسَحَ يَدَهُ عَلَيْهِ.**

رواه البخاري ا ٣٥٨٣ وأحمد ا ٥٨٨٦

**جابر كوڕى عبدالله** دەڵێ: ئافرەتێكى جوولەكە لە دانیشتوانى خەیبەر ژەهرى كردبوویە ناو شاتێكى برژاو، پاشان وەک هەدیە هێناى بۆ ڕەسول

الله ﷺ ئەویش نەوی لە باڵێکی لێی خوارد، وە کۆمەڵێک لە صەحابەش خواردیان، پاشان ڕەسول ﷺ فەرمووی: « دەست هەڵگرن ». ئەنجا ناردی بە دوای ئافرەتەکە لێی پرسی: « ئەو شاتەت ژەهراوی کردبوو؟ ». ئافرەتەکە ووتی: بەڵێ کێ خەبەری پێ دای؟ فەرمووی: « ئەو پارچە گۆشتەی باڵەکە کە لە دەستمدایە خەبەری پێدام ». فەرمووی: « چی وای لێکردی ئەم کارە بکەی؟ ». ووتی: ووتم ئەگەر پێغەمبەر بێ ئەوە ئەم ژەهرە زەرەری پێ ناگەیێنێ، وە ئەگەریش پێغەمبەر نەبێ ئەوە نەجاتمان دەبێ لێی و ئیسراحەت دەکەین. ڕەسول الله ﷺ ئافرەتەکەی بەخشی هیچ سزایەکی نەدا. وە هەندێک لەوانەی لە گۆشتەکەیان خوارد مردن، وە ڕەسول الله ﷺ کەڵەشاخی کرد لە نێو شانیدا، أبو هند کە پیاوێک بوو لە هۆزی بیاضة بۆیکرد .

عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: كَانَ جَابِرُ بْنُ عَبْدِاللَّه رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، يُحَدِّثُ أَنَّ يَهُودِيَّةً مِنْ أَهْلِ خَيْبَرَ سَمَّتْ شَاةً مَصْلِيَّةً، ثُمَّ أَهْدَتْهَا لِرَسُولِ الله ﷺ فَأَخَذَ رَسُولُ الله ﷺ الذِّرَاعَ فَأَكَلَ مِنْهَا، وَأَكَلَ رَهْطٌ مِنْ أَصْحَابِهِ مَعَهُ، ثُمَّ قَالَ لَهُمْ رَسُولُ الله ﷺ: « ارْفَعُوا أَيْدِيَكُمْ ». وَأَرْسَلَ رَسُولُ الله ﷺ إِلَى الْيَهُودِيَّةِ فَدَعَاهَا فَقَالَ لَهَا: « أَسَمَمْتِ هَذِهِ الشَّاةَ؟ ». قَالَتِ الْيَهُودِيَّةُ: مَنْ

أَخْبَرَكَ؟ قَالَ: « أَخبَرَتْنِي هَذِهِ فِي يَدِي ». لِلذِّرَاعِ. قَالَتْ: نَعَمْ. قَالَ: « فَمَا أَرَدْتِ إِلَى ذَلِكِ؟». قَالَتْ: قُلْتُ: إِنْ كَانَ نَبِيًّا فَلَنْ يَضُرَّهُ، وَإِنْ لَمْ يَكُنْ نَبِيًّا اسْتَرَحْنَا مِنْهُ. فَعَفَا عَنْهَا رَسُولُ اللهِ ﷺ وَلَمْ يُعَاقِبْهَا، وَتُوُفِّيَ بَعْضُ أَصْحَابِهِ الَّذِينَ أَكَلُوا مِنَ الشَّاةِ، وَاحْتَجَمَ رَسُولُ اللهِ ﷺ عَلَى كَاهِلِهِ مِنْ أَجْلِ الَّذِي أَكَلَ مِنَ الشَّاةِ، حَجَمَهُ أَبُو هِنْدٍ بِالْقَرْنِ وَالشَّفْرَةِ. وَهُوَ مَوْلًى لِبَنِي بَيَاضَةَ مِنَ الْأَنْصَارِ.

رواه أبو داود | ٤٥١٠ والدارمي | ٦٩

ووتم: ئەمانە هاتوونەتە قسە كردن « بەرد، خواردن ، بنكى دارخورما، گۆشت ». لە كاتێكدا هەموويان بێ گيان و مردوون خاوەنى هيچ ئەندام و هەستێک نين هيچكاميشيان خاوەنى زمان و شەويلگە و دەم نين، كاتێک الله ﷻ توانيويەتى بەرد و دار بهێنێتە قسە كردن، كەواتە قەولى جەهمييە و ئەشاعيرە باتڵە كە دەڵێن وجوودى صەوت ئيللا دەبێ هواء مُنخَرِقُ بين جِرمَين بێ.

پێش حديث لە قورئاندا چەندين ئايەت هەن دەربارەى ئەوەى كە جەمادات قسەيان كردووە، وەک: « قسە كردنى دەستەكان و پێيەكان، قسە كردنى ئاسمان و زەمين، گوێ و چاوو پێستى ئينسان، جەهەنەم ».

الله ﷻ دەفەرموێ: ڕۆژی قیامەت مۆر لە دەمی کافران دەدەین ناتوانن بە زمان هیچ قسەیەک بکەن دەستەکانیشیان قسەمان لەگەڵ ئەکەن پێیەکانیشیان شایەتی دەدەن بەوەی کە کردوویانە. ﴿ الْيَوْمَ نَخْتِمُ عَلَى أَفْوَاهِهِمْ وَتُكَلِّمُنَا أَيْدِيهِمْ وَتَشْهَدُ أَرْجُلُهُم بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ﴾ يس : ٦٥

الله ﷻ دەفەرموێ: ئینجا بەرز بوویەوە "واتە الله" بۆ ئاسمان لە کاتێکدا دوکەڵ بوو، ئینجا بە ئاسمان و زەوی فەرموو: فەرمانبەردار و ملکەچ بن، بەخۆشی خۆتان یان بە زۆر بتانخەمە ژێر دەسەڵاتی خۆمەوە هەردوولا خێرا وتیان: ملکەچی تۆین. ﴿ ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاءِ وَهِيَ دُخَانٌ فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ ائْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا قَالَتَا أَتَيْنَا طَائِعِينَ ﴾ فصلت : ١١

الله ﷻ دەفەرموێ: هەتا کاتێک کافرەکان دەگەنە ئاستی ئاگری جهنم گوێیان و چاوەکانیان و پێستەکانیان شایەتیان لەسەر دەدات کە چ کارو کردەوەیەکی نادروست و خراپیان ئەنجام داوە، ئەوکات بەپێستی خۆیان دەڵێن: بۆچی شایەتیتان لەسەردایـن؟ ئەوانیش دەڵێن ئەو الله ـیەی ئێمەی هێناوەتە گوفتار دەتوانێ هەموو شتێک بهێنێتە قسە و

گفتوگۆ، هەر ئەو زاتەشە کە یەکەمجار بەدیهێناوین و هەر بۆلای ئەویش دەگەڕێینەوە. ﴿ حَتَّى إِذَا مَا جَاءُوهَا شَهِدَ عَلَيْهِمْ سَمْعُهُمْ وَأَبْصَارُهُمْ وَجُلُودُهُم بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ * وَقَالُوا لِجُلُودِهِمْ لِمَ شَهِدتُّمْ عَلَيْنَا قَالُوا أَنطَقَنَا اللَّهُ الَّذِى أَنطَقَ كُلَّ شَىْءٍ وَهُوَ خَلَقَكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ فصلت : ٢١-٢٠

الله ﷻ دەفەرموێ: ڕۆژێک دێ بە دۆزەخ دەڵێین: ئایا پڕ بووی؟ ئەویش لە وەڵامدا دەڵێ: ئایا کەسی تر ماوە خەڵکی زیاتر نیە؟! ﴿ يَوْمَ نَقُولُ لِجَهَنَّمَ هَلِ امْتَلَأْتِ وَتَقُولُ هَلْ مِن مَّزِيدٍ ﴾ ق : ٣٠

ئەمەی ئەشاعیرە دەیڵێن هەمان جەهمییەتەکەی قەدیمە لە ژێر ناوی ئەشعەرییەتدا، ئەوەتا ئیمامی أحمد لە کتابی «الرد على الزنادقة والجهمية» هەمان قەولی ئەشاعیرە دێنێ کە جەهمییەکان پێش ئەوان وتوویانە.

کاتێک باس لە قسە کردنی الله ﷻ دەکات لەگەڵ پێغەمبەر موسى ﷺ کە جەهمییەکان ئینکاری دەکەن و ڕەتیدەکەنەوە دەڵێ: پێیان دەڵێین: بۆچی ئینکاری کەلام دەکەن؟ لە وەڵامدا وتیان: الله قسەی نەکردووە و

قسەش ناكات، بەڵكو شتێكی دروست كردووە ئەو شتە تەعبیری لە كەلامی الله كردووە، وە صەوتێكی خەلق كردووە كە دەبیسترێ.

وە پێیان وایە كەلام نایەتەجێ ئیلا بە دەم و زمان و لێوەوە نەبێ! ئەگەر بەو جۆرە بوایە كە جەهمی دەیڵێ كە الله شتێكی دروست كردووە، ئەوە دەبوو ئەو دروست كراوە بڵێ: ئەی موسی من الله و پەروەردگاری جیهانیان نیم، نەدەبوو بڵێ: ﴿ يَا مُوسَىٰ إِنِّي أَنَا اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ ﴾. ئەمما ئەوەی دەڵێن: الله قسەی نەكردووە، وە نایكات. ئێ چی دەكەن لە حدیثی الأعمش، عن خیثمة، عن **عدی بن حاتم** دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: «هیچ كەسێک نییە ئیللا الله ﷻ قسەی لەگەڵ دەكات هیچ واسطەیەک نابێ لە نێوانیاندا». ئەمما ئەو قسەیەشیان كە دەڵێن: كەلام وجوودی نابێ ئیللا بە هۆی دەم و زمان و لێوەوە نەبێ. دەڵێین: مەگەر الله ﷻ بە ئاسمان و زەوی نافەرموێ: بە زۆر یان بە خۆشی ملكەچی فەرمانم بن ئەوانیش وتیان ملكەچانە دێین: ﴿ ائْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا قَالَتَا أَتَيْنَا طَائِعِينَ ﴾. ئایا وای دەبینن ئاسمان و زەوی بە دەم و زمان و لێوو ئەندامەكان وایان وتووە؟

وە الله ﷻ دەفەرموێ: شاخەکانمان موسەخەر کرد بۆ داود لەگەڵیدا تەسبیحاتیان دەکرد: ﴿ وَسَخَّرْنَا مَعَ دَاوُدَ الْجِبَالَ يُسَبِّحْنَ ﴾. ئایا وای دەبینن شاخەکان بە دەم و زمان و لێوو ئەندامەکان وایان وتووە؟

وە ئەندامەکانی جەستە وەک دەست و قاچ و پێست کاتێک لە قیامەتدا شایەتی دەدەن لەسەر کافر: ﴿ لِمَ شَهِدتُّمْ عَلَيْنَا قَالُوا أَنطَقَنَا اللَّهُ الَّذِى أَنطَقَ كُلَّ شَىْءٍ ﴾ ئایا وای دەبینن ئەو ئەندامانە بە دەم و زمان و لێو هاتوونەتە قسە کردن؟ نەخێر بەڵکو الله بە ویستی خۆی ئەوانەی هێناوەتە قسە .

الله ﷻ قسە دەکات هەرکات بیبەوێ، بە بێ ئەوەی بڵێین دەم و زمان و لێو.

فقلنا لهم: لِمَ أنكرتم ذالک؟ فقالوا: إِنَّ الله لم يَتَكَلَّم ولا يَتكَلَّم، إِنما كَوَّن شيئًا فَعَبَّرَ عن اللهِ، وخلق صوتًا فأَسْمَعَ.

وزَعموا أَنَّ الكلام لا يكون إِلَّا مِن جَوفٍ وفَمٍ ولسانٍ وشَفَتَينِ!

ولو كان كما زعم الجهمي أَنَّ الله كَوَّنَ شيئًا، كان يقول ذالک المُكَوَّن: يا موسى إِني لست أنا الله رب العالمين، ولا يجوز أَن يقول: ﴿ يَا مُوسَى

إِنِّي أَنَا اللهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ ﴾. فأَما ما قالوا: إِنَّ الله لم يَتكَلَّم ولا يَتكَلَّم، فكيف يصنعون بحديث الأَعمش، عن خيثمة، عن عَدِي بن حاتم الطائي قال: قال النبي ﷺ: « مَا مِنكُمْ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا سَيُكَلِّمُهُ اللهُ لَيْسَ بَيْنَهُ وَبَيْنَه تُرْجُمَانُ ». وأَما قولهم: إِنَّ الكلام لا يكون إِلَّا مِن جَوفٍ وفَمٍ وشَفَتَين ولِسانٍ. أَليس قال الله للسماوات والأَرض: ﴿ ائْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا قَالَتَا أَتَيْنَا طَائِعِينَ ﴾. أَتراها أَنها قالتْ بجوفٍ، وفَمٍ، وشَفَتَينٍ ،ولِسانٍ، وأَدَواتٍ؟

وقال الله تعالى: ﴿ وَسَخَّرْنَا مَعَ دَاوُدَ الْجِبَالَ يُسَبِّحْنَ ﴾. أَتراها أَنها يُسَبِّحْنَ بجوفٍ، وفَمٍ، ولِسانٍ، وشَفَتَينٍ؟

والجوارح إِذا شَهدت على الكُفار، فقالوا: ﴿ لِمَ شَهِدتُّمْ عَلَيْنَا قَالُوا أَنطَقَنَا اللَّهُ الَّذِي أَنطَقَ كُلَّ شَيْءٍ ﴾. أَتراها أَنها نَطَقَت بجوفٍ، وفَمٍ، وشَفَتَينٍ، ولِسانٍ؟ ولكن الله أَنطقها كيف شاء.

وكذالك الله تَكَلَّمَ الله كيف شاء مِن غير أَن يقول بجوفٍ، ولا فَمٍ، ولا شَفَتَين، ولا لِسانٍ.

كتاب الرد على الزنادقة والجهمية لأَحمد بن حنبل | صـ : ٢٦٦-٢٦٧

ووتم: ئەوە ئیمامی ئەهلی سوننەیە أحمد کوڕی حنبل کاتێک ڕەدی جەهمییە زەندیقەکان دەداتەوە ئەو قەولەیان دێنێ « أَنَّ الكلام لا يكون إِلَّا مِن جَوفٍ وفَمٍ ولسانٍ وشَفَتَينِ » لە کاتێکدا لەو سەردەمەدا ئەشعەری هەر وجوودی نەبووە و لە پشتی باوکیدا بووە، چونکە ئەشعەری ساڵی **(٢٦٠)** هیجری لە دایک بووە نۆزدە ساڵ دوای وەفاتی ئیمامی أحمد رحمة الله عليه، بەڵام ئەو قەولەی ئەشاعیرە دەیڵێن لە سەردەمی ئیمامی أحمد وجوودی هەبووە کە ئەصڵی قەولی جەهمییە و موعتەزیلەکانە.



## قسەکردنی الله ﷻ لەگەڵ پێغەمبەران و عەبدەکانی

وەک پێشتر ڕوونمان کردەوە قورئان کەلامی اللە ـیە ﷻ پێکهاتووە لە حەرف و صەوت ئایەتەکانی قورئانمان لەسەر ئەو بابەتە هێنا لەگەڵ ئەحادیثی ڕەسول اللە ﷺ، وە ئەو کەلامە مەخلوق نییە بە حەقیقی کەلامی اللە ـیە ﷻ، وە دابەزیوە بۆ ڕەسول اللە ﷺ، ئێستا هەندێک بەڵگەی تر دادەنێین لەسەر ئەوەی کەلامی اللە ﷻ صەوتە، لە چەندین ئایەتدا هاتووە کە اللە ﷻ بانگی هەندێک لە پێغەمبەرەکانی کردووە و هەروەها بانگی خەڵکیشی کردووە.

کاتێک پێغەمبەر ئادەم ﷺ لەگەڵ دایە حواء لە بەری دارەکەی بەهەشت دەخۆن پۆشاک لە بەریان نامێنێ ڕادەکەن، اللە ﷻ بانگیان دەکات مەگەر نەهیم لێنەکردن نەیخۆن: ﴿ وَنَادَاهُمَا رَبُّهُمَا أَلَمْ أَنْهَكُمَا عَن تِلْكُمَا الشَّجَرَةِ وَأَقُل لَّكُمَا إِنَّ الشَّيْطَانَ لَكُمَا عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴾ الأَعراف : ٢٢

وه كاتێک پێغەمبەر إبراهیم ﷺ هەڵدەستێ بە ئەنجامدانی ئەو ئەمرەی الله ﷻ كە لە خەودا پێی سپێردرا بوو لەسەر بڕینی إسماعیل، الله ﷻ بانگ دەكاتە إبراهیم كە ئەنجامی مەدە تۆ فەرمانەكەت ئەنجامدا: ﴿وَنَادَيْنَاهُ أَن يَا إِبْرَاهِيمُ﴾ الصافات : ١٠٤

كاتێكیش موسی ﷺ لای كێوی طورە الله ﷻ لای ڕاستی شاخەكەوە بانگی لێدەكات و نزیكی دەخاتەوە بۆ قسە كردن لەگەڵی: ﴿وَنَادَيْنَاهُ مِن جَانِبِ الطُّورِ الْأَيْمَنِ وَقَرَّبْنَاهُ نَجِيًّا﴾ مريم : ٥٢

وه كاتێک پێغەمبەر موسی ﷺ لە كاتی گەڕانەوەیدا لە مەدیەنەوە بۆ میصر شەو بووە ئاگرێک دەبینێ دەچێ بۆی، الله ﷻ بانگی لێدەكات من پەروەردگارتم ناعلەكانت دابكەنە تۆ لە دۆڵێكی پیرۆزدای: ﴿فَلَمَّا أَتَاهَا نُودِيَ يَا مُوسَىٰ * إِنِّي أَنَا رَبُّكَ فَاخْلَعْ نَعْلَيْكَ ۖ إِنَّكَ بِالْوَادِ الْمُقَدَّسِ طُوًى﴾ طه : ١١-١٢

بە هەمان شێوە لە سورەتی النمل ئەم باسە هاتووە: ﴿فَلَمَّا جَاءَهَا نُودِيَ أَن بُورِكَ مَن فِي النَّارِ وَمَنْ حَوْلَهَا وَسُبْحَانَ اللهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ * يَا مُوسَىٰ إِنَّهُ أَنَا اللَّهُ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ النمل : ٨-٩

هەروەها الله ﷻ لە قیامەتدا بانگ دەكاتە موشریكان ئادەی كوان ئەو بتانەی لە دونیا كردبوونتانە شەریكی من: ﴿ وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ أَيْنَ شُرَكَايِيَ الَّذِينَ كُنتُمْ تَزْعُمُونَ ﴾ القصص : ٦٢

دووبارە بانگیان دەكاتەوە پێیان دەڵێ چۆن چۆنی وەڵامی بانگەوازی پێغەمبەرەكانتان دایەوە: ﴿وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ مَاذَا أَجَبْتُمُ الْمُرْسَلِينَ﴾ القصص : ٦٥

هەروەها بە شێوەی موخاطەبە و دوواندن الله ﷻ لەگەڵ پێغەمبەر آدم و نوح علیهما السلام گفتوگۆی كردووە.

كاتێک پێغەمبەر آدم ﷺ لەگەڵ دایە حواء لە بەری دارەكە دەخۆن الله ﷻ پێیان دەفەرموێ: وتمان ئەی آدم خۆت و خێزانت لە بەهەشت نیشتەجێ بن هەرچیتان ویست بیخۆن بەس نزیكی بەری ئەو دارە مەكەونەوە. ﴿ وَقُلْنَا يَا آدَمُ اسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ الْجَنَّةَ وَكُلَا مِنْهَا رَغَدًا حَيْثُ شِئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا هَذِهِ الشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ الظَّالِمِينَ ﴾ البقرة : ٣٥

هەروەها کاتی تۆفانەکەی سەردەمی پێغەمبەر نوح ﷺ کاتێک کوڕەکەی بە کافری دەخنکێ، نوح ﷺ دەفەرموێ ئەی پەروەدگار وەعدی تۆ حەقە کوڕەکەم لە خانەوادەی من بوو بۆ هێشتت تیاچێ؟ الله ﷻ پێی دەفەرموێ: ئەی نوح ئەوە لە خانەوادەی تۆ نەبوو ئەو کافر بوو پرسیاری شتێکم لێمەکە کە عیلمت پێی نییە. ﴿ قَالَ يَا نُوحُ إِنَّهُ لَيْسَ مِنْ أَهْلِكَ إِنَّهُ عَمَلٌ غَيْرُ صَالِحٍ فَلَا تَسْأَلْنِ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ إِنِّي أَعِظُكَ أَن تَكُونَ مِنَ الْجَاهِلِينَ ﴾ هود : ٤٦

ئاشکرایە ووتە مانای نابێ ئیللا دەبێ ببیسترێ یاخود نقڵ بکرێ لە لایەن ئەو کەسەی دەیبیستێ، کاتێک قورئان بەو جۆرەیە کەواتە کەلامی الله ﷻ پێکهاتووە لە حەرف و صەوت، وە دەبیسترێ.

قَالَ الله ﷻ: ﴿ وَإِذَا قُرِئَ الْقُرْآنُ فَاسْتَمِعُوا لَهُ وَأَنصِتُوا لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴾ الأَعراف : ٢٠٤ وَقَالَ: ﴿ وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ الْمُشْرِكِينَ اسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَامَ اللهِ ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْلَمُونَ ﴾ التوبة : ٦

سەیرکەن و ورد ببنەوە لەو ئایەتەی سەرەوە بزانن چۆن الله ﷻ کەلامی خۆی سابت دەکات کە کەلامێکی بیستراوە، موشریک ئەگەر بیبەوێ گوێی لێبگرێ گەرچی موحارییبیش بێ، وە کەسێک پەنای بدا ئەوە دەتوانێ گوێ بیستی بێت و دواتر بگەیەنرێتەوە مەکانی خۆی.

هەتا جنەکان دان بەوەدا دەنێن کە ئەوەی ڕەسول الله ﷺ خوێندوویەتیەوە ناوی قورئانە و لە ئاسمانەوە دابەزیوە، وە بیستوویانە و بە بیستراو ناویان هێناوە.

قَالَ اللهُ ﷻ: ﴿وَإِذْ صَرَفْنَا إِلَيْكَ نَفَرًا مِّنَ الْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ الْقُرْآنَ فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوا أَنصِتُوا فَلَمَّا قُضِيَ وَلَّوْا إِلَى قَوْمِهِم مُّنذِرِينَ * قَالُوا يَا قَوْمَنَا إِنَّا سَمِعْنَا كِتَابًا أُنزِلَ مِن بَعْدِ مُوسَى مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ يَهْدِي إِلَى الْحَقِّ وَإِلَى طَرِيقٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ الأحقاف: ٣٠-٢٩ وَقَالَ: ﴿قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ الْجِنِّ فَقَالُوا إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا﴾ الجن: ١

ئەو ئایەتانە بەڵگەن لەسەر سابت بوونی کەلام کە صەوتە و بە شێوەی صەوت بیستراوە، وە ئایەت لەسەر ئەو مەسئەلەیە زۆرن. بێجگە لە قورئان لە حدیثیشدا بەڵگە هەیە دەلالەت لە سابت بوونی صەوت دەکات.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: الله ﷻ فەرموویەتی: ئەی آدم. آدم ﷺ دەڵێ: لبیك وسعدیك. صەوتێک بانگی لێدەکات: الله فەرمانت پێدەکات لە زورِیەتەکانت ئەهلی ئاگر بهێنە دەرەوە بۆ ئاگر.

عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: « **يَقُولُ اللَّهُ: يَا آدَمُ. فَيَقُولُ: لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ. فَيُنَادَى بِصَوْتٍ: إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكَ أَنْ تُخْرِجَ مِنْ ذُرِّيَّتِكَ بَعْثًا إِلَى النَّارِ** ».

رواه البخاري | ٧٤٨٣ ومسلم | ٥٣٢ وأحمد | ١١٢٨٤

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: الله ﷻ ئەگەر عەبدێکی خۆشبوێ ئەوە بانگ لە جبریل دەکات: الله فلانە کەسی خۆشدەوێ تۆش خۆشتبوێ، ئیتر جبریل خۆشیدەوێ، پاشان جبریل لە ئاسمان بانگ دەکات و دەڵێ: الله ﷻ فلانە کەسی خۆشدەوێ ئێوەش خۆشتانبوێ، ئیتر ئەهلی

ئاسمانەکان خۆشیاندەوێ، وە خۆشەویستیشی دەکەوێتە ناو ئەهلی زەوییەوە.

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى إِذَا أَحَبَّ عَبْدًا نَادَى جِبْرِيلَ: إِنَّ اللَّهَ قَدْ أَحَبَّ فُلَانًا فَأَحِبَّهُ. فَيُحِبُّهُ جِبْرِيلُ، ثُمَّ يُنَادِي جِبْرِيلُ فِي السَّمَاءِ: إِنَّ اللَّهَ قَدْ أَحَبَّ فُلَانًا فَأَحِبُّوهُ. فَيُحِبُّهُ أَهْلُ السَّمَاءِ، وَيُوضَعُ لَهُ الْقَبُولُ فِي أَهْلِ الْأَرْضِ».

رواه البخاري ا ٧٤٨٥ ومسلم ا ٦٧٠٥ وأحمد ا ٧٦٢٥

وە هەروەها الله ﷻ لە ئاخیرەتدا لە کاتی حەشر و حیساب قسە لەگەڵ عەبدەکانی دەکات.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: هیچ کەسێک لە ئێوە نییە ئیللا لە قیامەتتدا الله قسەی لەگەڵ دەکات هیچ کەسێک نییە لە نێوانیان تەرجومانیان بێ، تەماشای لای ڕاستی دەکات هیچ نابینێ ئەوە نەبێ پێشی خستووە، تەماشای لای چەپی دەکات هیچ نابینێ ئەوە نەبێ پێشی خستووە، دەبینێ ئاگری جەهەنەم لە ڕووی دایە، کەواتە خۆتان بپارێزن لە ئاگری جەهەنەم تەنانەت بە بەخشینی لەتە خورمایەک بێ.

عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: « **مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا سَيُكَلِّمُهُ اللَّهُ لَيسَ بَيْنَهُ وَبَيْنَهُ تَرْجُمَانٌ، فَيَنْظُرُ أَيمَنَ مِنْهُ، فَلَا يَرَى إِلَّا مَا قَدَّمَ، وَيَنْظُرُ أَشْأَمَ مِنْهُ، فَلَا يَرَى إِلَّا مَا قَدَّمَ، وَيَنْظُرُ بَينَ يَدَيْهِ، فَلَا يَرَى إِلَّا النَّارَ تِلْقَاءَ وَجْهِهِ، فَاتَّقُوا النَّارَ وَلَوْ بِشِقِّ تَمْرَةٍ** ».

رواه البخاري ا ٦٥٣٩ ومسلم ا ٢٣٤٨ وأحمد ا ١٨٢٤٦

**صفوان کوڕی محرز** دەڵێ: لەگەڵ عبدالله کوڕی عمر دەڕۆیشتم دەستی گرتبووم، پیاوێک ڕێی لێگرت ووتی: چیت بیستووە لە ڕەسول الله ﷺ دەربارەی قسە کردنی الله ﷻ بە نهێنی لەگەڵ عەبدەکانی؟ إبن عمر ووتی: بیستم ڕەسول الله ﷺ فەرمووی: « الله ﷻ لە قیامەتتدا عەبدەکەی لە خۆی نزیک دەکاتەوە هەتا ستری دەکات لەبەرچاوی ئەهلی مەحشەر دیار نەبێ، پێی دەفەرموێ: بیرتە و دەزانی فڵانە تاوان و فڵانە تاوانت کرد؟ ئەویش دەڵێ: بەڵێ یا ڕەب دەزانم. هەتا ئەوەی ئیعتراف دەکات لەسەر تاوانەکانی، وای دەبینێ کە تیاچووە و مەصیری بۆ ئاگرە، دەفەرموێ: من لە دونیا سترم کردی و کەشفم نەکردی، وە ئێستا لێت خۆشدەبم، ئیتر نامەی حەسەناتەکەی دەدرێتە دەست، ئەمما کافر و مونافیقەکان ئەوە شاهێدەکان لە پێغەمبەران و مەلائیکە و ئیماداران

شاهێدی دەدەن کە ئەمانە درۆ دەکەن و دەڵێن: ﴿ هَٰؤُلَاءِ الَّذِينَ كَذَبُوا عَلَىٰ رَبِّهِمْ أَلَا لَعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الظَّالِمِينَ ﴾».

عَنْ صَفْوَانَ بْنِ مُحْرِزٍ الْمَازِنِيِّ، قَالَ: بَيْنَمَا أَنَا أَمْشِي مَعَ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا آخِذٌ بِيَدِهِ، إِذْ عَرَضَ رَجُلٌ فَقَالَ: كَيْفَ سَمِعْتَ رَسُولَ اللهِ ﷺ فِي النَّجْوَى؟ فَقَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ اللَّهَ يُدْنِي الْمُؤْمِنَ فَيَضَعُ عَلَيْهِ كَنَفَهُ وَيَسْتُرُهُ، فَيَقُولُ: أَتَعْرِفُ ذَنْبَ كَذَا؟ أَتَعْرِفُ ذَنْبَ كَذَا؟ فَيَقُولُ: نَعَمْ أَيْ رَبِّ. حَتَّى إِذَا قَرَّرَهُ بِذُنُوبِهِ، وَرَأَى فِي نَفْسِهِ أَنَّهُ هَلَكَ، قَالَ: سَتَرْتُهَا عَلَيْكَ فِي الدُّنْيَا وَأَنَا أَغْفِرُهَا لَكَ الْيَوْمَ. فَيُعْطَى كِتَابَ حَسَنَاتِهِ، وَأَمَّا الْكَافِرُ وَالْمُنَافِقُونَ فَيَقُولُ الْأَشْهَادُ: ﴿ هَٰؤُلَاءِ الَّذِينَ كَذَبُوا عَلَىٰ رَبِّهِمْ أَلَا لَعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الظَّالِمِينَ ﴾».

رواه البخاري ا ٢٤٤١ ومسلم ا ٧٠١٥ وأحمد ا ٥٤٣٦

قورئان بە حەقیقی کەلامی الله ـیە ﷻ مەخلوق نییە وەک چۆن جەهمییە و موعتەزیلە و ئەشاعیرە دەعوای بۆ دەکەن، ئەو کەلامە جبریل دایبەزاندووە بۆ ڕەسول الله ﷺ کەلامی الله ـیە ﷻ بە حەقیقی قسەی

پێکردووه جبریل لێوەی بیستووه، پاشان به فەرمانی الله ﷻ دایبەزاندووه بۆ ڕەسول الله ﷺ، لێرەدا به سێ خاڵ ئەمه دەسەلمێنین :

١- کاتێک الله ﷻ کەلامی هەیه و قسه بکات کەواته صیفەتی کەلامەکەی مەخلوق نییه و له قسەی بەنی آدم ناچێ و نابێ بشوبهێنرێ به صیفاتی مەخلوقات و چۆنیەتی شێوازی قسه کردنەکەی.

قَالَ اللهُ ﷻ: ﴿ إِنَّ الَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَا أَنزَلَ اللَّهُ مِنَ الْكِتَابِ وَيَشْتَرُونَ بِهِ ثَمَنًا قَلِيلًا أُولَٰئِكَ مَا يَأْكُلُونَ فِي بُطُونِهِمْ إِلَّا النَّارَ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾ البقرة : ١٧٤ وَقَالَ: ﴿ إِنَّ الَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ اللهِ وَأَيْمَانِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلًا أُولَٰئِكَ لَا خَلَاقَ لَهُمْ فِي الْآخِرَةِ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ اللَّهُ وَلَا يَنظُرُ إِلَيْهِمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾ آل عمران : ٧٧ وَقَالَ: ﴿ وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ اللَّهُ إِلَّا وَحْيًا أَوْ مِن وَرَاءِ حِجَابٍ أَوْ يُرْسِلَ رَسُولًا فَيُوحِيَ بِإِذْنِهِ مَا يَشَاءُ إِنَّهُ عَلِيٌّ حَكِيمٌ ﴾ الشورى : ٥١ وَقَالَ: ﴿ تِلْكَ الرُّسُلُ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ مِّنْهُم مَّن كَلَّمَ اللَّهُ وَرَفَعَ بَعْضَهُمْ دَرَجَاتٍ ﴾

البقرة : ٢٥٣ وَقَالَ: ﴿ وَرُسُلًا قَدْ قَصَصْنَاهُمْ عَلَيْكَ مِن قَبْلُ وَرُسُلًا لَّمْ نَقْصُصْهُمْ عَلَيْكَ وَكَلَّمَ اللَّهُ مُوسَى تَكْلِيمًا ﴾ النساء : ١٦٤

٢- الله ﷻ له قورئاندا قەول بۆ خۆی سابت دەكات، دەی ڕوونە قەول كەلامە، وە لای هەموو عاقڵێك زانراوە كەلام پێكدێ لە حەرف و صەوت كاتێك قەول وجوودی هەبوو ناكرێ بوترێ ئەو كەلامە مەخلوقە و دروست كراوە، بەڵكو دەوترێ فڵانە قەول هی فڵانە كەسە، كە الله ﷻ كەلامی هەیە كەواتە ئەو كەلامەی حەقیقیە موستەحیلە ناكرێ بوترێ مەخلوقە.

قَالَ اللهُ ﷻ :﴿ وَلَوْ شِئْنَا لَآتَيْنَا كُلَّ نَفْسٍ هُدَاهَا وَلَٰكِنْ حَقَّ الْقَوْلُ مِنِّي لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ الْجِنَّةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴾ السجدة : ١٣ وَقَالَ: ﴿ سَلَامٌ قَوْلًا مِّن رَّبٍّ رَّحِيمٍ ﴾ يس : ٥٨

٣- الله ﷻ له چەندین ئایەتدا باسی دابەزینی "تنزیل" ئەو قورئانە دەكات، ئەگەر قورئان كلام قائم بالنفس بووایە واتە لە نەفسی الله بووایە ئیتر چۆن باسی دابەزینی دەكرد؟!

قَالَ اللهُ ﷻ: ﴿ تَنزِيلُ الْكِتَابِ مِنَ اللهِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ ﴾ الزمر :١

قَالَ اللهُ ﷻ: ﴿ كِتَابٌ فُصِّلَتْ آيَاتُهُ قُرْآنًا عَرَبِيًّا لِّقَوْمٍ يَعْلَمُونَ﴾ فصلت : ٢ قَالَ اللهُ ﷻ: ﴿ اللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ الْحَدِيثِ كِتَابًا مُّتَشَابِهًا مَّثَانِيَ تَقْشَعِرُّ مِنْهُ جُلُودُ الَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ إِلَىٰ ذِكْرِ اللَّهِ ﴾ الزمر : ٢٣

سەیری ئەم ئایەتەی کۆتایی بکەن الله ﷻ فەرموویەتی: ﴿ اللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ الْحَدِيثِ ﴾ باسی دابەزینی قورئان دەکات کە کەلامەکەیەتی، ئەگەر مەخلوق بووایە دەبوو لەجیاتی کەلیمەی نَزَّلَ کەلیمەی خَلَقَ بەکاربهێنرایە بەم جۆرە: ﴿ اللَّهُ خَلَقَ أَحْسَنَ الْحَدِيث ﴾.

**إبن قدامه** دەڵێ: ئەمە حاڵی ئەو قەومەیە گومانی تێدا نییە زەندیقن، گومان لەوەدا نییە وای نیشان دەدەن موصحەف بەرز ڕادەگرن کە قورئانی تێدایە، بەڵام لە ناخیاندا باوەڕیان وایە ئەوەی لە ناو موصحەفدایە تەنها پێکهاتووە لە وەرەقە و مورەکەب، وە گەورە تەماشاکردنی قورئان و بەرز ڕاگرتنی نیشان دەدەن، بە کۆمەڵ دادەنیشن دەیخوێننەوە، لەگەڵ ئەمەشدا پێیان وایە نوسراوی جبریلە عیبارەت لەو فەهمە دەکات کە جبریل

تێگەیشتووە لەوەی لە ناو لوح المحفوظ و نەفسی الله ـدایە، وای نیشان دەدەن موسی ﷺ کەلامی الله ﷻ لە الله بیستووە، دواتر دەڵێن کەلامی الله صەوت نییە، وە لە بانگەکان و نوێژەکانیاندا دەڵێن شاهێدی دەدەین کە محمد ڕەسولی الله ـیە، لەگەڵ ئەوەشدا پێیان وایە دوای وەفات کردنی ڕیسالەکەی بچڕاوە و کۆتایی پێهاتووە، ئیتر بە ڕەسول الله نەماوەتەوە، بەڵکو ئەو کاتە ڕەسول الله بووە کە لەژیاندا بووە.

حەقیقەتی مەزهەبیان ئەوەیە کە ئیلاهـ لە ئاسمان نییە، وە قورئان وجوودی نییە لەسەر زەوی، وە محمد ڕەسولی الله نییە.

لە ناو ئەهلی بیدەعدا طائفەیەک نابینی کە لە دڵەوە باوەڕیان بە چییە ئیللا ئەوە دەردەخەن بێجگە لە ئەشاعیرە، ئەمان ئەوەی لە دڵەوە ئیعتقادیان پێی هەیە دەری نابڕن، بەڵکو پێچەوانەکەی نیشان دەدەن، جگە لەوان کێ هەیە لە زەنادقە بچێ!

قال إِبن قدامة: وهذا حال هؤلاء القوم لا محالة، فهم زنادقة بغير شَك، فإِنه لا شَكَّ في أَنَّهم يُظهرون تعظيم المصاحف إِيهامًا أَنَّ فيها القرآن، ويعتقدون في الباطن أَنه ليس فيها إِلا الوَرَق والمداد، ويُظهرون تعظيم القرآن، ويجتمعون لقراءته في المحافلِ والأَعرِية، ويعتقدون أَنَّه من تآليف

جبريل وعبارته، ويُظهرون أَنَّ موسى سمِع كلام الله مِنَ الله، ثم يقولون ليس بصوت، ويقولون في آذانهم وصلواتهم أَشهد أَنَّ محمدًا رسول الله، ويعتقدون أَنه انقطعت رسالته بعد ونبوته بموته، وأَنه لم يبق رسول الله، وإِنما كان رسول الله في حياته.

وحقيقة مذهبهم أَنه ليس في السماء إِله، ولا في الأَرض قرآن، ولا أَنَّ محمدًا رسول الله.

وليس في أَهل البدع كلهم من يتظاهر بخلاف ما يعتقده غيرهم، وغير من أَشبههم مِنَ الزنادقة.

المناظرة في القرآن لابن قدامة | صـ: ٥٠



## بەیانی حاڵی ئەشعەری و موعتەزیلە بوونی

أبو الحسن الأشعری **(٤٠)** ساڵ موعتەزیلە بووە، دواتر بە حساب تەوبەی کردووە، بەڵام تەوبەکەی مەقالی ڕەئیسی و حەقیقی لەسەرە دواتر ئاماژەی پێدەدەین.

لە ڕەد دانەوەی ئەشاعیرە و باسکردنی حاڵی ئەشعەری قەولی ئەهلی سوننە گرنگە ئەوانەی کە لە سەردەمی ئەودا ژیاون و بینیویانە، لەگەڵ ئەوانەشی دوای سەردەمی ئەو هاتوون، نەک قەولی ئەشاعیرە خۆیان و ئەوانەی دوو سەد ساڵ و پێنج سەد ساڵ دوای ئەشعەری هاتوون دیفاعی لێدەکەن! ئێستا هەندێک قەول دەهێنین هەیانە ڕاستەوخۆ ئەشعەری بینیوە بزانن چۆن وەصفی دەکات، هەشیانە نەی بینیوە، بەڵام بە سەنەد لە شێخەکانیەوە نقلی دەکات کە ئەشعەرییان بینیوە، هەندێکی تریان لەو دوو پێڕە نین، بەڵکو سەردەمانێکی دوای ئەوانە هاتوون، بەڵام لە عەقیدە ثابت بوون یاخود شوێن تەجەهومەکەی ئەشعەری نەکەوتوون، بەڵکو عەقیدە باتڵەکەیان ڕەد داوەتەوە و قسەیان لەسەر کردووە.

**أبو علي الأهوازي** كە ساڵی **(٤٤٦)** هیجری وەفاتی کردووە دەڵێ: بیستم أبو حسن محمد کوڕی محمد الوراق، ووتی: بیستم أبو بكر الوراق دەیوت: أبو الحسن الأشعری ساڵی **(٢٦٠)** لە دایك بووە، ساڵی **(٣٣٦)** وەفاتی کردووە، بۆ ماوەی **(٤٠)** ساڵ موعتەزیلە بوو مونازەڕەی لەگەڵ دەکردم لەسەر ئیعتزال، پاشان دوای ئەمە ووتی: وازم لە ئیعتزال هێناوە، ئیتر نازانم لەسەر قەولی یەکەم باوەڕی پێبکەم یاخود قەولی دووەمی.

وە بیستم أبو محمد الحسن کوڕی محمد العسکری دەیوت: ئەشعەری تەلەبەی أبو علي الجبائی بوو لە لای ئەو تەدریسی دەکرد و فێر دەبوو، بۆ ماوەی **(٤٠)** ساڵ بەردەوام لەگەڵی بوو لێی دانەبڕا، خاوەن و ئەهلی مونازەڕە بوو ڕووبەڕووی خەصمەکان دەبوویەوە، بەڵام خاوەنی قەڵەم و نوسین نەبوو، هەرکات قەڵەمی بگرتایەتە دەست بینوسیبا لەوانەیە لە نیوەیدا بچڕان و خەلەلی تێبکەوتایە و قسانێکی دەکرد نەگونجاو بوون، بەڵام جبائی خاوەنی قەڵەم و نوسین بوو ..... هەتا ئەوەی ڕۆژێک جبائی ئامادە نەبوو ئەشعەری وەک شوێنگرەوەی مەجلیسەکەی دانیشتبوو، لەگەڵ کەسێک مونازەڕەی کرد، ئەشعەری کەوت و هیچی پێ نەما، کەسێک لە عاممەی خەڵکی بادام و شەکری پژاند بەسەر ئەشعەریدا،

ئەشعەری پێی ووت: هیچم نەکردووە، کەسەکەی ڕکابەرم سەرکەوت بەسەرمدا دەلیلەکانمی پووچەڵ کردەوە، ئەو لە پێشترە بەوەی پاداشتی بکەیت و بادام و شەکر بپڕژێنی بەسەریدا، پاشان دوای ئەوە تەوبەی کرد و وازی لە مەزهەبی موعتەزیلە هێنا .

قال أَبو علي الأَهوازي: سمعت أَبا الحسن محمد بن محمد الوراق بالبصرة يقول: سمعت أَبا بكر الوراق يقول: وُلد ابن أَبي البشر سنة ستين ومائتين، ومات سنة ستٍّ وثلاثين وثلاثمائة، قال: ولم يَزَل معتزليًا أَربعين سنة يُناظرني على الإِعتزال، ثم إِنَّه قال بعد ذالک قال: قد رجعت عن الإِعتزال، فلا أَدري أُصَدِّقُه في القول الأَول أَو في الثاني.

وسمعت أَبا محمد الحسن بن محمد العسكري بالأَهواز يقول :

كان الأَشعري تلميذًا للجُبَّائي يدرس ويتعلم منه ويأْخذ منه، لا يفارقه أَربعين سنة، وكان صاحب نظر في المجالس، وذا إِقدام على الخُصوم، ولم يكن من أَهل التصنيف، وكان إِذا أَخذ القلم يكتب ربما ينقطع، وربما يأْتي بكلام غير مرضي، وكان أَبو علي الجُبَّائي صاحب تصانيف وقلم ..... فلما كان يومًا حضر الأَشعري نائبًا عن الجبائي في بعض المجالس، وناظره إِنسان فانطع وسُقِط في يده، وكان معه رجل من العامة، فنثر عليه لَوزًا

وسُكَّرًا، فقال له الأَشعري: ما صنعتُ شيئًا، خصمي استظهر عليَّ وأَفلج الحجة، كان أَحقَّ بالنَّثار مني، ثم بعد ذالک أَظهر التوبة والانتقال عن مذهبه.

مثالب ابن أَبي البشر للأَهوازي ا صـ : ٥

ووتم: کەسێک (٤٠) ساڵ هەڵگری عەقیدەی ئیعتزال بووبێ ژیانی تێدا صەرف کردبێ گەر تەوبەش بکات ئەستەمە واز لە ئصوڵیاتی موعتەزیلە بهێنێ، هەر بۆیە دەبینی أبا بکر الوراق گومانی هەبووە نەی زانیوە بڕوای بە تەوبەی بکات یان ئیعتزالەکەی.

وە أبو علی الأهوازی دەڵێ: ساڵی (٣٧٥) لە ئەهواز بیستم أبا عبدالله الحمرانی ووتی: ڕۆژی جمعە بوو ئاگامان لە هیچ نەبوو دوای نوێژی جمعە ئەشعەری لە ناکاو چوویە سەر میمبەری مزگەوتی گەورەی بەصرە، پەتێکی پانی بەست لە کەمەری پاشان قرتاندی، ووتی: شاهێد بن بەسەرمەوە چەندێکە من لەسەر دینی ئیسلام نەبووم، ئەوە لەم ساتەوە موسڵمان بووم، وە من تەوبەم کردووە لەوەی لەسەر عەقیدەی ئیعتزال بووم، پاشان دابەزی.

أبا عبدالله الحمراني ووتی: پاشان خەڵکی دەربارەی تەوبە کردنی دابەش بوون بەسەر **(٣)** قەولدا:

١- هاوەڵەکانی و ئەوانەی شوێنی کەوتوون و هاوهەوای بوون دەڵێن: حەقی بۆ ڕوون بووەتەوە و شوێنی کەوت.

٢- طائفەیەکی تریان دەڵێن: کەسێک لە خزمە نزیکەکانی مرد لە دوای خۆی ماڵێکی زۆری جێهێشت، ئەوکات لە بەصرە قاضییەک هەبوو زۆر توند بوو لەسەر عەقیدەی ئەهلی سوننە، قاضییەکە بە ئەشعەی ووت: ئەهلی کوفر میرات لە ئەهلی ئیسلام ناگرێ. ڕێگری لێکرد میرات بگرێ لەو خزمەی، ئیتر ئەویش تەوبەی خۆی ڕاگەیاند هەتا میراتەکەی بدرێتێ.

٣- طائفەی ئاخیریان دەڵێن: ئەو هەموو تەمەنی لە عەقیدەی ئەهلی کەلام سەرف کرد، هەتا گەیشتە بەرزترین پلە تیایدا، هیچ پلەیەکی بۆ خۆی نە بینی نە لای عاممەی خەڵکی، نە لای ئەهلی عیلم، ئیتر تەوبەی خۆی ڕاگەیاند هەتا قسەی لێ وەربگیرێ و خەڵکی ڕووی لێ بنێن، بەمەش ئەوەی دەیویست هەندێکی بە دەست هێنا.

أبو عبدالله الحمراني رحمه الله شاخێک بوو له لوغه، شارەزا بوو به نەحو لەگەڵ غەریبی حدیث، وە لە بابەتە ئەخبارییەکان و شیعر لە پێش هەمووانەوە بوو، هیچ تەعەصوبێکی نەبوو لە دیانەتتدا، وە هیچ مەیلێکی نەبوو بۆ غلو زێدەڕۆیی، لەم مەسئەلەیەدا هیچ ناڵێ ئیللا حەق نەبێ.

وسمعت أَبا عبدالله الحُمْراني بالأَهواز سنة خمس وسبعين وثلاثمائة يقول: لم نشعر يوم الجمعة وإِذا بالأَشعري قد طلع على منبر الجامع بالبصرة بعد صلاة الجمعة، ومعه شريط فشدَّه على وسطه ثم قطعه، وقال: اشهدوا عليَّ أَني كنت على غير دين الإِسلام، وأَني قد أَسلمت الساعة، وأَني تائب مما كنت فيه من القول بالإِعتزال. ثم نزل.

قال أَبو عبدالله الحُمْراني: ثم إِنَّ الناس اختلفوا فيه على ثلاثة أَقوال:

فقال أَصحابه ومتابعوه ومن يهواه: بانَ له الحقُّ فتبعه.

وقال طائفة: كان قد مات له قَرَابة وله مال كثير، وكان إِذ ذاك بالبصرة قاضٍ يغلوا في السُّنة، فقال له القاضي: أَهل ملَّتين لا يتوارثان. ومنعه مِن الميراث بتأويلٍ تأَوَّله عليه، فأَظهر التوبة حتى أَخذ الميراث.

وقال طائفة: كان قد اشتغل بالكلام وأفنى فيه عمره، وبلغ منه أَقصى مبلغ، ولم يرَ لنفسه رُتبة عند العامَّة، ولا منزلة عند الخاصة، فأَظهر التوبة ليُؤخذ عنه ويُقبَل عليه وتحصُل له منزلة ، فبلغ بذالک بعضَ ما أَراد.

وكان أَبو عبدالله الحمراني رحمه الله عَلَمًا في اللغة، قَيِّمًا بالنحو والعَروض والغريب والأَخبار والأَشعار، مُقَدَّمًا في ذالک، لم يكن فيه عصبيَّة في الدِّيانات، ولا مَيْلَ إلى الغُلوِّ في ذالک، ولا يقول في ذالک إلا بالحقِّ.

مثالب ابن أَبي البشر للأَهوازي ا صـ : ٦

وەک بينيتان أبو عبدالله الحمرانی لەسەردەمی ئەشعەری ژياوە بينيويەتی لەسەر چ عەقيدەيەک بووە، لەسەر مەحضی زەندەقەی موعتەزيلە بووە، پاشان کە تەوبەشی کردووە ئەمين نەبوون لە تەوبەکەی، بەڵکو بەس ئەشاعيرە دان دەنێن بە صدقی تەوبەکەيدا، ئەگينا ئەهلی سوننە تەوبەکەيان وەک فێڵ بينيوە.

وە دەڵێ: ئەشعەری لعنه الله وأخزاه کتێبێکی هەيە لە سوننەدا هاوەڵەکانی کردوويانەتە قەڵغان خۆيانی پێدەپارێزن لە ئەهلی سوننە، بەوە عەوامی هاوەڵانی ئێمەی پێدەخەڵەتێنن، ناوی ناوە الإبانە لە

بەغداد نوسی کاتێک هاتووەتە ئەوێ، بەڵام حەنابلە لێیان وەرنەگرت و هەجریان کرد.

وللأَشعري لعنه الله وأَخزاه كتاب في السنة قد جعلوه أَصحابه وقايةً لهم من أَهل السُّنة، يَلقَونَ به العَوامَّ من أَصحابنا، سَمَّاه كتاب الإِبانة، صنعه ببغداد لَمَّا دَخَلَها، فلم يَقبل ذالک منه الحنابلة وهَجَروه.

مثالب ابن أَبي البشر للأَهوازي ا صـ : ١٠

**أبا عبدالله الحمرانی** دەڵێ: کاتێک ئەشعەری هاتە بەغداد هات بۆ لای البربهاری، پێی ووت: ڕەدی أبو علی الجبائی ـم داوەتەوە، ڕەدی أبو هاشم ـم داوەتەوە، قسەکانیانم پووچەڵ کردووەتەوە، ڕەدی جوولەکە و نەصارا و مەجوسم داوەتەوە، کاتێک بێدەنگ بوو البربهاری ووتی: لەوەی ووتت نە زۆر نە کەم هیچم نەدیوە و نازانم، هیچ نازانین ئیللا ئەوە نەبێ کە أبو عبدالله أحمد کوڕی محمد کوڕی حنبل رضی الله عنه وتوویەتی. ئیتر لای البربهاری جێهێشت چوو کتێبی الإِبانەی نوسی، بەڵام ئەهلی سوننە ئەو کتێبەیان لێوەرنەگرت، دواتر لە بەغداد نەبینرایەوە هەتا جێیهێشت.

وە مەسئەلەیەکی هەیە دەربارەی ئیمان مەخلوق نییە، پێم وابوو وای نەوتووە و بە دەمیەوە هەڵیان بەستووە، هەتا ئەوەی أبو الحسن بن المعتمر ووتی: ئەو قسەیەم پێگەیشت کاتێک من لە ڕەقە بووم، بە تایبەتی لەبەر ئەو قسەیە هاتم بۆ بەغداد، هاتمە لای أبو بكر الباقلانی قسەکەم نیشاندا، پێم ووت: ئەمە چییە ڕاستە؟ ووتی: بەڵێ ڕاستە وای وتووە، ئەوە نوسیویەتی بەمە خۆی لە حەنابلەی بەغداد دەپارێزێ.

سمعت أَبا عبدالله الحُمْراني يقول: لَّما دخل الأَشعري إِلى بغداد جاء إِلى البربهاري فجعل يقول: رَدَدْتُ على الجُبَّائي وعلى أَبي هاشم، ونقضت عليهم، وعلى اليهود والنصارى، وعلى المجوس، وقلتُ وقالوا. وأَكثر الكلام في ذالک، فلما سَكَتَ قال البَرْبَهاري: ما أَدري ما قُلتَ قليلاً ولا كثيرًا، ما نعرف غير ما قاله أَبو عبدالله أَحمد بن محمد بن حنبل رضي الله عنه. قال: فخرج من عنده وصنف كتاب الإِبانة فلم يقبلوه، ولم يظهر ببغداد إِلى أَن خرج منها.

وله مسأَلة في أَن الإِيمان غير مخلوق، كنت أَحسب أَنَّها منحولة إِليه، إِلى أَن قال لي أَبو الحسين ابن المعتمر: وقعتْ إِليَّ وأَنَّا بالرَّقَّة، فتعجبت منها، وأَخذتها وانحدرت إِلى بغداد من أَجلها لا غير، وجئت إِلى ابن

الباقلاني فأَريته إِياها، وقلت له: ما هذا؟ فقال لي: هذا صحيح عنه، هو صنفها يتقي بها الحنابلة ببغداد.

مثالب ابن أَبي البشر للأَهوازي ا صـ : ١١-١٠

ووتم: البربهاری الحسن کوڕی علی کوڕی خلف أَبو محمد، ساڵی(٣٢٩)هیجری وەفاتی کردووە ئیمامی ئەهلی سوننە بووە لە بەغداد، وەک دەبینن هیچ قەولێکی لە ئەشعەری قبوڵ نەکردووە، بەڵکو دەڵێ ئەوە دەزانین و قبوڵە لامان کە أَبو عبدالله ئیمامی أَحمد لەسەری بووە، بێجگە لە البربهاری بەڵکو هیچ کەسێک لە ئەهلی سوننە ئامادە نەبوون پێشوازی لە ئەشعەری بکەن، هەربۆیە بەغداد جێدەهێڵێ.

وە دەڵێ: ئەشعەری لە بەصرە مایەوە هیچ کەسێک لە ئەهلی عیلم سەردانی نە دەکرد، چونکە الحمدلله لە ئەهلی عیلم نەبوو، لە ناو بەصرە نە باسی دەکرا نە هاوەڵی زۆری هەبوو، بەڵکو چوار هاوەڵی هەبوون، ئەم چوارە دەرچوون و بڵاوبوونەوە بە شارەکاندا، یەکێک لەوانە إِبن عینون ضراب بوو، إِبن عینون چوو بۆ بەغداد لەوێ مایەوە هەتا مرد ڕەحمەتی الله ـی لێ نەبێ، لە ترسی حەنابلە نەیتوانی مەزهەبەکەی خۆی ئاشکرا بکات و هیچ شتێک لە کوفرەکانی دەربخات.

وأَقام الأَشعري بالبصرة لا يختلف إِليه أَحد مِن أَهل العلم، لأَنَّه ليس هو من أَهل العلم بحمدلله، ولم يكن له بها إِذ ذاک كبير ذِكر ولا كثير أَصحاب، وإِنَّما كان له بها أَربعة من أَصحابه، خرج الأَربعة دُعاة له في الآفاق، أَحدهم ابن عينون الضرَّاب، وخرج إِلى بغداد وأَقام بها إِلى أَن مات لا رحمه الله، ولا قَدَرَ أَن يُظهر من مذهبه شيئًا من الكُفريات خِيفَةً مِنَ الحنابلة.

مثالب ابن أَبي البشر للأَهوازي ا صـ : ١٣

ووتم: سیٚ كەسەكەی تر ئەمانەن: أَبو العباس أَحمد بن عبدالرحمن القلانسي دەرچووە بۆ الريِّ لەویٚ ماوەتەوە هەتا مردووە، أَبو الحسن الطبري عبدالعزيز بن محمد دُمَّل دەرچوو بۆ شام و ميصر لەویٚ ماوەتەوە هەتا مردووە، أَبو عبدالله بن مجاهد محمد بن أَحمد لە ناو بەصرە ماوەتەوە هەتا مردووە.



# تەوبە كردنی ئەشعەری و ڕوونكردنەوەی حاڵی تەوبەكەی

دەربارەی تەوبە كردنی ئەشعەری دوو قەول هەیە، قەولی سێهەم وجوودی نییە كە خەڵكانێكی جاهل بانگەشەی بۆ دەكەن و بە زۆر خۆیان بە مونتەسیبی ئەهلی سوننە دەزانن، لە كاتێكدا جاهلن بە عەقیدە و كتوبەكانی ئەشعەری دێن دەڵێن لە كۆتا مەرحەلەدا مەرحەلەی سێهەم گەڕاوەتەوە سەر مەنهەجی ئەهلی سوننە!

١- وازی لە عەقیدەی موعتەزیلە نەهێناوە تەنها لە ظاهردا وای نیشانداوە، بەڵكو لە ئاشكراوە گواستوویەتیەوە بۆ نهێنی "التمويه" واتە ئەصڵی عەقیدەكەی شاردووەتەوە لە خەڵكی پێچەوانەكەی نیشان داون و تەدلیسی كردووە، تەنانەت هەبووە ئیتیهامیان كردووە بە زەندەقە!

لەو كەسانەی لەسەر ئەم ڕەئیەن: "البربهاری و حەنابلە بەتایبەت حەنابلەی بغداد، الفقيه خلف المعلم المالكی، أَبو عمر محمد بن حسين بن محمد البسطامي، أَبو زكريا يحيى بن عمار بن يحيى السجستاني، أَبو علي الحسن بن علي بن إِبراهيم الأَهوازي، أَبو إِسماعيل عبدالله بن محمد الأَنصاري الهروي، أَبو القاسم عبدالوهاب بن عبدالواحد إِبن الحنبلي،

الفقيه موفق الدين عبدالله إِبن قدامة المقدسي، جمال الدين يوسف بن حسن بن عبدالهادي إِبن المبرد.❝

پێشتر مەوقیفی ئیمامی البربهاری و حەنابلەی بەغدادمان باسکرد دەربارەی ئەشعەری و کتێبەکەی، بۆیە لێرەدا دووبارەی ناکەینەوە، بەڵکو قەولی شەخصەکانی تر دەهێنین.

**أبو سعيد خلف کوڕی عمر المعلم البرقی** کە ساڵی **(٣٧١)** هیجری وەفاتی کردووە دەڵێ: ئەشعەری **(٤٠)** ساڵ لەسەر عەقیدەی موعتەزیلە بوو، پاشان تەوبەی خۆی ڕاگەیاند، لە بابەتە فەرعییەکانی ئەهلی ئیعتزال گەڕایەوە، بەڵام لە بابەتە ئوصولییەکانیان مایەوە و نەگەڕایەوە.

قال السجزي: ولقد حَكى محمد بن عبدالله المالكي المغربي، وكان فقيهًا صالحًا، عن الشيخ أَبي سعيد البَرقيِّ، وهو من شيوخ فقهاء المالكيين ببرقة، عن أُستاذه خلف المعلم وكان من فقهاء المالكيين: أَقام الأَشعري أَربعين سنة على الإِعتزال، ثم أَظهر التوبة، فرجع عن الفروع، وثبت على الأَصول.

الرد على من أَنكر الحرف والصوت للسجزي | صـ: ٥٥

**أبو عمر البسطامی** که ساڵی **(٤٠٨)** هیجری وەفاتی کردووە دەڵێ:

أبو الحسن الأشعری سەرەتا لەسەر عەقیدەی موعتەزیلە بوو، پاشان وازی لێهێنان و دژیان وەستایەوە، لە ڕاستیدا مەزهەب و عەقیدەکەی پەکخستنی صیفات بوو، بەڵام لە حاڵەتی ئاشکراوە گواستیەوە بۆ نهێنی.

قال الهروي: سمعت عدنان بن عبدة النميري، يقول: سمعت أبا عمر البسطامي، يقول: كان أبو الحسن الأَشعري أولًا ينتحل الإِعتزال، ثم رجع فتكلم عليهم، وإِنما مذهبه التعطيل، إِلا أَنَّه رجع من التصريح إِلى التمويه.

ذم الكلام وأهله للهروي | ١٢٩٤

**أبو نصر السجزی** که ساڵی **(٤٤٤)** هیجری وەفاتی کردووە دەڵێ:

بزانن الله ئێمە و ئێوەش ڕێنمونی بکات هیچ خیلافێک نەبووە لە نێوان خەڵکیدا لە سەرەتای ئیسلامەوە سەرەڕای هەبوونی جیاوازی شێواز و ڕەفتاریان، لەگەڵ هەبوونی خیلاف، بەڵام لەسەر ئەوەبوون قورئان کەلامی الله ـیە ﷻ، وە هەموویان هاوڕا بوون لەسەر ئەوەی کەلامی الله پێکهاتووە لە حەرف و صەوت، هەتا ئەوکاتەی عبدالله کوڕی سعید إبن کلاب و القلانسی و الصالحی و أبو حسن الأشعری و هاوتەمەن و هاوعەقیدەکانیان پەیدا بوون، لە ڕووکەشدا وایان نیشان دەدا ڕەدی

موعتەزیله دەدەنەوە، له کاتێکدا لەگەڵیان بوون، بەڵکو حاڵیان له موعتەزیله خراپتر و ڕسواتر بوو، ئەگینا ئەصڵ ئەوەیە قورئان پێکهاتووە له حەرف و صەوت، هەرچەندە زمانەکانیش جیاوازییان تێدابێ.

قال السجزي: اعلموا أرشدنا الله وإياكم أنه لم يكن خلاف بين الخلق على اختلاف نِحَلهم من أول الزمان إلى الوقت الذي ظهر ابن كُلَّاب والقلانسي والصالحي والأَشعري وأقرانهم، الذين يتظاهرون بالرد على المعتزلة وهم معهم، بل أَخَس حالاً منهم في الباطن، في أَنَّ الكلام لا يكونُ إِلا حرفًا وصوتا، ذا تأليفٍ واتساقٍ، وإِن اختلفت بِهِ اللغات.

الرد على من أنكر الحرف والصوت للسجزي ا صـ : ١٧

دواتر کاتێک باسی ئەئیمەی ئەهلی سوننە دەکات و ناویان دەهێنێ، ئەنجا دێتە سەر ئەئمەی ئەهلی ضلال و دەڵێ: پاشان ئەهلی سوننە دوای ئەم ئیمامانە دووچاری کەسانێک بوون ئیدعایان دەکرد شوێن ئەهلی سوننە و ئەثەر کەوتوون، له کاتێکدا زەرەریان له زەرەری موعتەزیله و غیری موعتەزیله زیاتر بوو، ئەوانیش: أبو محمد عبدالله کوڕی سعید إبن کلاب، أبو العباس القلانسی، أبو الحسن الأشعری بوون.

قال السجزي: ثم بُلي أَهل السنة بعد هؤُلاء بقوم يدَّعون أَنَّهم من أَهل الأَتباع، وضررهم أَكثر من ضرر المعتزلة وغيرهم وهم: أَبو محمد بن كُلَّاب، وأَبو العباس القلانسي، وأَبو الحسن الأَشعري.

الرد على من أَنكر الحرف والصوت للسجزي ا صـ: ١٠٨

إِبن الحنبلى عبدالوهاب كوڕى عبدالواحد كه ساڵى **(٥٣٦)** هيجرى وه‌فاتى كردووه ده‌ڵێ: له سه‌رده‌مى مأمون ئه‌وه‌ى ڕوويدا له فيتنه‌ى جه‌همييه‌كان ڕوويدا، كۆتا بيدعه ده‌ركه‌وت مه‌زهه‌بى ئه‌شعه‌رى بوو، دونيا ويسته‌كان و زاڵم و ئه‌وانه‌ى مودمين بوون له‌سه‌ر زوڵم و ئه‌هلى فه‌لسه‌فه و فيسق و مونه‌جيمه‌كان خاوه‌نى ئه‌قوالى موخالفى شه‌رع سه‌رخستنى ئه‌م مه‌زهه‌به‌يان گرته ئه‌ستۆ، هه‌تا بزانى ئه‌م بيدعه‌يه خراپتره له‌و بيدعانه‌ى له ئاخير زه‌ماندا سه‌رهه‌ڵده‌ده‌ن، وه بڵاوبوونه‌وه‌ى له شاره خراپه‌كان و ده‌عوه‌كارانى به شێوازى نهێنى مه‌زهه‌به‌كه‌ى ده‌شارنه‌وه به فێڵ و گومڕايى و ووته‌ى ڕازاوه خه‌ڵكى بۆ بانگ ده‌كه‌ن، له كاتێكدا ناوه‌ڕۆكه‌كه‌ى كوفر و گومڕاييه، سه‌رده‌مى ئه‌و بيدعه‌يه خراپترين سه‌رده‌مه، وه شوێنكه‌وته‌كانى خراپترينى ئوممه‌تن، ده‌عوه‌كارانيشى كه‌م دينترينى ئه‌م ئوممه‌تن.

قال إِبن الحنبلي: في زمن المأمون وجرى منهم ما جرى، فكان آخر البدع ظهورًا مذهب الأَشعري، وتَوَلَّى نُصرَتَهُ الظَّلمة وأَرباب الدنيا، وأَصحاب المظالم، والقائلين بما يُخالف الشرع من النَّجَامة، والفلسفة، والإِدمان على المظالم، والفسقِ، لِتَعلَم أَنَّ هذه البدعة شَرٌّ مِنَ البدع بظهورها آخر الزمان، وانتشارها في فاسد البلدان، وركوب دعاتها التَمويِهَ والمَحَال، والكلام المزخرف، في باطنه الكُفرُ والضَلال، فزمان هذه البدعة أَخبث الأَزمِنَة واتباعها أَخبَث الأُمَة، ودعاتها أَقَلُ أَديان هذه الملة.

الرسالة الواضحة لابن الحنبلي ١ صـ : ٤٥٣

**إبن قدامه المقدسى** كه ساڵی **(٦٢٠)** هیجری وەفاتی كردووە دەڵێ:

ئایا ئەم گومڕاییە و قەولە قەبیحانە لای هیچ كەسێك لە موتەقەدمین دیوتانە، جگە لە لای سەرۆكە داخڵ بووەكەی جەهەنەمتان نەبێ، كە ئێوەی لەسەر ڕێگای ڕاست لادا، هیچ فەزڵێكی نەبوو لە عیلمی شەرعی و دینێكی چاكی نەبوو تەنها خاوەنی عیلمی كەلامی شووم و زەم كراو بوو، كە خێر و چاكە تیایدا بوونی نییە، لەسەر عەقیدەی موعتەزیلە گەورە بوو هەتا **(٤٠)** ساڵ خەڵكی بۆ بانگ دەكرد و مونازەڕەی لەسەر دەكرد، پاشان ئەم قەولانەی بەربومیان هەبوو لەوەی ڕەدی الله ﷻ،

ڕەسولەکەی ﷺ پێدەدایەوە، وە موخالەفەی موسڵمانان و جنەکان و هەموو خەڵکی پێدەکرد، چۆن ڕازین پێی کە ئیمامتان بێ لە کاتێکدا پێچەوانەی ڕەسول الله ـیە ﷺ لە جیاتی ڕەسول الله ﷺ بکەنە ئیمامتان ئەوتان هەڵبژاردووە بە ئیمام؟! وە چۆن قەولی ئەو پێش دەخەن بەسەر قەولی الله ﷻ؟! وە چۆن دەتوانن موخالەفەی ئیجماعی موسڵمانان بکەن تەنها لەبەر قەول و تەقلیدی ئەو بە بێ ئەوەی حوجە بێ شوێن قەولەکەی دەکەون؟!

## ومَا عَوضُ لنا مِنهَاج جَهمٍ .. بمنهاج ابنِ آمِنة الأَمين

زمانی حاڵتان دەڵێ: حەق و ڕاستی وون و شاراوە و لە دەست دەرچوو بووە لای ڕەب العالمین و ڕەسولەکەی الصادق الأمین وە صەحابە و تابعینەکان و جنەکان و هەموو خەڵکی، هەتا سەرۆکە داخڵ بووەکەی جەهەنەمتان ئەو حەقەی دۆزییەوە، ئێوەی بانگهێشت کرد بۆی و ئاگاداری کردنەوە، ئێوەش وەڵامی بانگهێشتەکەیتان دایەوە، وە ڕازی بوون بە حاڵەکەی، وە ئەو باتڵ و مەحاڵیەی هێنابووی قبوڵتان کرد، وە ئەو خەڵکەی موافیقی ئێوە نەبوون بە گومڕاتان دادەنان.

قال إبن قدامة: هل وجدتم هذه الضلالة وقبيح المقالة عند أحد من المتقدمين، سوى قائدكم إِلى الجحيم، الناكب بكم عن الصراط المستقيم، الذي لم يعرف له فضيلة في علم الشرعي ولا دين مرضي سوى علم الكلام المذموم المشؤوم، الذي الخير فيه معدوم، نشأ في الإِعتزال إِلى أَربعين عامًا يناظر عليه ويدعو الناس إِليه، ثم أَثمر ذالك مقالته هذه التي يرد بها على الله سبحانه وعلى نبيه ﷺ، وخالف بها المسلمين والجِنَّة والناس أَجمعين، فكيف رضيتم به إِمامًا عوضًا عن رسول الله ﷺ؟! وكيف قَدَّمتم قوله على قول الله سبحانه؟! وكيف خالفتم إِجماع المسلمين بمجرد قوله بلا حجة سوى مجرد تقليده والمصير إِلى قوله؟!

ومَا عَوضُ لنا مِنهَاج جَهمٍ .. بمنهاج ابنِ آمِنة الأَمين

فلسان حالكم يقول: إِنَّ الحق ضاعَ عن رب العالمين ورسوله الصادق الأَمين والصحابة والتابعين والجِنَّة والناس أَجمعين، حتى وَجَده قائدكم إِلى الجحيم، فدعاكم إِليه ونبَّهَكم، فأَجبتم مقَاله، ورضيتم حاله، وقبلتم مُحَاله، ونسبتم مَن لم يوافقكم على الضلالةِ، ورَمَيتموه إِلى الضَّلالة.

رسالة في القرآن وكلام الله لابن قدامة | صـ : ٥٤-٥٧

**إِبن قدامه** دەڵێ: پێ نازانین له ئەهلی بیدەع طائفەیەک هەبێ عەقیدە و قەولەکانیان بشارنەوە، وە نەوێرن دەریبخەن ئیللا جەهمییە و ئەشاعیرە نەبێ.

قال إِبن قدامة: ولا نعلم من أَهل البدع طائفة يكتمون مقالتهم، ولا يتجاسرون على إِظهارها إِلا الجهمية والأَشعرية.

المناظرة في القرآن لابن قدامة | صـ : ٣٥

**إِبن قدامه** دەڵێ: ئەهلی سوننە موتەفیقن لەسەر ئەوەی قورئان کەلامی اللە ـیە ﷻ مەخلوق نییە. ئەو قورئانەی کە ئەوان دەعوای بۆ دەکەن کە مەخلوقە ئەو سورەتانەیە کە اللە ﷻ بە قورئانێکی عەرەبی ناوی هێناوە، وە دایبەزاندووەتە سەر ڕەسولەکەی، وە هیچ خیلافێک لەوەدا نەبووە، بەڵام لای ئەشعەری قورئان مەخلوقە، گومانی تێدا نییە قەولی ئەشعەری هەمان قەولی موعتەزیلەکانە، بەڵام تەلبیس دەکات و حەق دەشارێتەوە و دادەپۆشێ، لە ڕووکەشدا موافەقەی قەولی ئەهلی حەق دەکات، پاشان تەفسیری دەکات بە قەولی موعتەزیلە.

قال إِبن قدامة: واتفق أَهل السنة على أَنَّ القرآن كلام الله غير مخلوق. ولم يكن القرآن الذي دَعَوا إِلى القول بخلقه سوى هذه السوَر التي سماها الله قرآنًا عربيًا، وأَنزلها على رسوله عليه السلام، ولم يقع الخِلافُ في غيرها البَتّة، وعند الأَشعري أَنَّها مخلوقة، فقوله قول المعتزلة لا محالة، إِلا أَنه يريد التلبيس، فيقول في الظاهر قولًا يوافق أَهل الحق، ثم يُفَسِّره بقول المعتزلة.

المناظرة في القرآن لابن قدامة | صـ: ٤٧

**إبن قدامه** دەڵێ: وە سەیر لەوەدایە ئیمامەکەیان کە ئەم بیدعەیەی داهێنا پیاوێکە خاوەنی دینداری و وەرەع نەبووە، قەت خاوەنی هیچ عیلمێکی شەرعی نەبووە، هیچ عیلمێک نادرێتە پاڵی تەنها عیلمی کەلامی زەم کراو نەبێ، وە خۆیان دان بەوەدا دەنێن کە **(٤٠)** ساڵ لەسەر عەقیدەی موعتەزیلە بووە پاشان وازهێنانی خۆی ڕاگەیاندووە، وە دوای تەوبە کردنیشی هیچی لێ نەبینرا ئەم بیدعەیە نەبێ، سەیرە چۆن بەو عەقڵەیان ئەو تەصەورەیان بۆ دروست بووە کە الله ﷻ کەس مۆفەق ناکات بۆ زانینی حەق ئیللا دوژمنەکەی نەبێ؟! وە ڕێنمونی نادات بە کەس ئیللا بەو کەسە نەبێ کە لە ئیسلام و دیندا هیچ نەصیبێکی نەبێ؟!

قال إِبن قدامة: ومن العجب أَنَّ إِمامهم الذي أَنشَأَ هذه البدعة رجل لم يُعرف بدين ولا ورع ولا شيء من علوم الشريعة البتة، ولا يُنسب إِليه من العلم إِلا علم الكلام المذموم، وهم يعترفون بأَنَّه على الإِعتزال أَربعين عامًا ثم أَظهر الرجوع عنه، فلم يظهر منه بعد التوبة سوى هذه البدعة، فكيف تصور في عقولهم أَنَّ الله لا يوفِّق لمعرفة الحق إِلا عدوَّه؟! ولا يجعل الهدى إِلا مع من ليس في علم الإِسلام نصيب ولا في الدين حَظٌّ؟!

المناظرة في القرآن لابن قدامة | صـ: ٥١

إِبن عساكر كه كەسێكی ئەشعەری مەزهەبە دیفاع لە أَبو الحسن الأَشعری دەكات بە شێخی ئەهلی سوننەی داناوە دەڵێ: أَبو الحسن الأَشعری توندترین بوو بەرامبەر ئەوانەی هەوڵی ئیلحادیان دەدا، یان ئەوانەی دوژمنایەتی سوننەتیان دەكرد، ئەو زێدەڕۆیی نەدەكرد لە پەكخستنی صیفاتدا، وە زێدەڕۆیی نە دەكرد لە شوبهاندنی صیفاتدا، بەڵكو لە نێوان ئەو دوو حاڵەتەدا ڕێگای وەصەتی هەڵبژارد بوو.

قال إِبن عساكر: فكان أَبو الحسن الأَشعري أَشدَّهم بذالک اهتمامًا لمن

حاول الإِلحاد، أَو عاند السنة، وإِنَّه لم يُسرف في التعطيل، ولم يَغْلُ في التشبيه، وأَنَّه ابتغى بين ذالک قواما.

تبيين كذب المفتري لابن عساكر ا صـ: ١٦

**إبن المبرد المقدسي** که ساڵی **(٩٠٩)** هیجری وەفاتی کردووە لە کتێبەکەیدا ڕەدی ئەم قسەیەی إبن عساکر دەداتەوە دەڵێ: والله درۆ دەکات، چونکە ئەو هەتا ئاخیری تەمەنی لەسەر عەقیدەی موعتەزیلە بوو بە نقڵی کەسانی ثقە، هەتا کاتێک زانی ئەم عەقیدەیەی نابێتە هۆکاری بەرزبوونەوەی، شاردییەوە لە خەڵکی مەزهەبێکی وەصەتی گرتە بەر.

بۆیە مەنهەج و ڕێڕەوی شاردنەوەی هەڵبژارد هەتا بتوانێ نەفی هەموو صیفاتەکان بکات، لەبەرئەوەی نەیدەتوانی نەفی کوللی بە ئاشکرا ڕابگەیێنێ، ئیتر تەئویلی هەڵبژارد هەتا بگاتە نەفی کردن.

قال إِبن المبْرد: كذب والله، فإِنه لم يزل على الإِعتزال بنقل الثقات إِلى آخر عمره، حتى علم أَنَّ ذالک لا يصعد معه فَمَوَّه بمذهب وسط.

وإِنما أَتى بالتَمويه لأَجل النفي الكُلِّي، لأَنَّه لا يصعد معه النفي الكُلِّي فَمَوَّه، وأَتى بالتأْويل توصَّل به إِلى النفي.

جمع الجيوش والدساكر لابن المبرد | صـ: ٦٨

**إبن المبرد** دەڵێ: هەرکەسێک پەروەردە و گەورە بوو لەسەر شتێک، هەموو تەمەنی لەوەدا سەرف کردبێ، بەو ئاسانییە لە دڵی دەرناچێ تەنانەت ئەگەر تەوبەش بکات لێی، ئەگەر واز بهێنێ لە هەندێکی، ئەوە ناکرێ و ناتوانێ لە هەمووی بگەڕێتەوە، لە کاتێکدا خۆی دانی بەوەدا ناوە ئەم تەمویهەی لەبەر دوژمنەکانی کردووە.

قال إِبن المبْرد: من نَشَأَ على أَمرٍ، وأَفنى عُمره فيه، قَلَّ أَن يخرج من قلبه ولو تاب منه، ولو رجع عن بعضه، لا يمكن أَن يرجع عن كُلِّه، لا سِيَما وقد أَخبر هو أَنه يموِّه بذالک على أَعدائه.

جمع الجيوش والدساكر لابن المبْرد | صـ: ١١١

**إبن المبرد** دەڵێ: خۆزگە دەمزانی ئەشعەری کامە تەنزیهی صیفاتی کردووە و چ تەوحیدێکی جێگیر کردووە؟! مەزهەبی ئەو تەئویل و شاردنەوەیە تەمویهە بۆ نەفی کردنی صیفات.

قال إِبن المبْرد: يا ليت شعري! أَيُّ تنزيه وتوحيد أَثبتَ الأَشعري؟! فإِنَّ مذهبه التأويل والتمويهُ على النفي.

جمع الجيوش والدساكر لابن المبرد ا صـ : ٢٣٤

**إبن المبرد** دەڵێ: ئەشعەری وازی لە عەقیدەی موعتەزیلە هێنا، چوویە سەر عەقیدەیەک لە ئیعتزال مەترسیدارتر ئەویش تەمویهە شێواندن و شاردنەوەی حەقیقەت و ئەصڵی عەقیدەکەیەتی کە پەکخستنی صیفاتە.

قال إِبن المبْرد: فإِنَّ الأشعري رَجَعَ عن الإِعتزال، وأَقامَ على أَمرٍ أَشدَّ منه، وهو التمويه على التعطيل.

جمع الجيوش والدساكر لابن المبرد ا صـ : ٢٥٧

٢- وازی لە عەقیدەی موعتەزیلە هێناوە، بەڵام شوێن عبدالله کوڕی سعید إبن کُلاب کەوتووە، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێک ئاسەواری موعتەزیلەی لەسەر ماوە نەیتوانیوە وازی لێبهێنێ.

لەو کەسانەی لەسەر ئەم ڕەئیەن: "أَبي القاسم علي بن الحسن إِبن عساكر، أَحمد بن عبدالحليم بن عبدالسلام إِبن تيمية"

إِبن عساكر كه ساڵی **(٥٧١)** هیجری وەفاتی کردووە هەرچەندە سەرسەخترین دیفاعکەری ئەشعەرییە، بەڵام لە کتێبەکەیدا قەولی شێخێکی عەقیدە هاوشێوە وەک خۆی دێنێ لەسەر ئەوەی ئەشعەری پاشماوەی ئیعتزالی تێدا مابووە، وە هەر بە ئەهلی کلام و ئیمامی ئەهلی کلام ناوی دەهێنێ، دەڵێ: حجاج کوڕی محمد الطرابلسی ووتی: پرسیارم کرد لە إسماعیل کوڕی أبی محمد الأزدی دەربارەی أبو الحسن الأشعری، ووتم: پێیان وتووم کە موعتەزیلی بووە، وە کاتێک وازی هێنا لە عەقیدەی ئیعتزال هەندێک خاڵ و مەسائیل و عەقیدەی ئیعتزالی تێدا مایەوە و هەڵینەوەشاندەوە.

پێی ووتم: ئەشعەری شێخ و ئیمامانە ئەو کەسەیە پێویستمان پێیەتی و دەگەڕێینەوە بۆی، ماوەی **(٤٠)** ساڵ لەسەر عەقیدەی ئیعتزال بوو وە ئیمام بوو تیایدا...

قال إِبن عساكر: وذكر أَبو القاسم حجاج بن محمد الطرابلسي من أَهل طرابلس المغرب قال: سأَلت أَبا بكر إِسماعيل بن أَبي محمد بن إسحاق الأَزدي القيرواني المعروف بابن عزرة، عن أَبي الحسن الأَشعري، فقلت

له: قيل لي عنه أَنَّه كان معتزليًا، وإنه لما رجع عن ذالک أبقى للمعتزلة نُكتًا لم ينقضها.

فقال لي: الأَشعري شيخنا وإِمامنا ومَن عليه معولنا، قام على مذاهب المعتزلة أَربعين سنة وكان لهم إمامًا...

تبيين كذب المفتري لابن عساكر ا صـ: ٢٦

ووتم: ئەوەی دەڵێم إبن عساكر لەسەر ئەو ڕەئیەیە لە بەشەکانی تردا قەولەکانی دەهێنم چۆن ئەشعەری و شوێنکەوتووانی جیا دەکاتەوە لە ئەهلی سوننە، وە ئەهلی سوننە بە موجەسەمە و موشەبەهە ناو دەهێنێ!

**إبن تيميه** کە ساڵی **(٧٢٨)** هیجری وەفاتی کردووە دەڵێ: أَبو الحسن الأشعری کاتێک وازی هێنا لە عەقیدەی موعتەزیلە شوێن عەقیدەی عبدالله کوڕی سعید إبن كُلاب کەوت، مەیلی هەبوو بۆ ئەهلی سوننە و حدیث، خۆی دایە پاڵ ئیمامی أحمد...

قال إِبن تيمية: وأَبو الحسن الأَشعري لما رجع عن مذهب المعتزلة سلَكَ طريقة إِبن كُلَّاب، ومَالَ إِلى أَهل السنة والحديث، وانتسب إِلى الإِمام أَحمد...

درء تعارض العقل والنقل لابن تيمية | **(١٦/٢)**

**إِبن تيميه** دەڵێ: کولابییەکان شێخی ئەشاعیرەن، أَبو الحسن الأشعری شوێن عەقیدەی أَبی محمد إبن کُلاب کەوت، إبن کُلاب لە ڕووی زەمەن و طەریقەتەوە نزیک بوو لە سەلەفەوە، أَبو بکر إبن فورک شێخی قُشَیری هەستا بە کۆکردنەوەی قەولی إبن کُلاب و الأشعری لە کتێبێکدا نیشانیدا چۆن لە ئوصوڵدا موتەفیقن وەک یەکن.

قال إِبن تيمية: والكُلابية هم مشايخ الأَشعرية، فإِنَّ أَبا الحسن الأَشعري إِنَّما اقتدى بطريقة أَبي محمد إِبن كُلَّاب، وابن كُلَّاب كان أَقرب إِلى السلف زمنًا وطريقةً، وقد جمع أَبو بكر بن فورك شيخ القشيري كلام إِبن كُلَّاب والأَشعري وبَيَّنَ إِتفاقهما في الأُصول.

الإِستقامة لابن تيمية | **(١٥٣/١)**

ووتم: نزیکی تەمەن و زەمەن لە سەلەفەوە هیچ سوودێکی نییە ئەگەر هاتوو کەسەکە عەقیدەی باتڵ بێ، هەروەک چۆن کەس و کاری پێغەمبەر ﷺ لەگەڵی دەژیان، بەڵام پێی کافر بوون، وەک: أَبو لهب و أَبو طالب.

**إِبن تيميه** دەڵێ: هیچ خیلافێک نییه له نێوان خەڵکیدا یەکەمین کەسێک له ئیسلامدا ئەم قەولەی داهێنا بڵێ قورئان کەلامێکی نەفسییه أبو محمد عبدالله بن سعید کُلاب البصری بوو، وه أبو الحسن الأشعری شوێنی کەوت، ئەمه قەولی ئەوانەشه هەڵگر و سەرخەری عەقیدەی ئەو دووانەن، إبن کُلاب و الأشعری موخالەفەی موعتەزیلەیان دەکرد، وه موافەقەی ئەهلی سوننەیان دەکرد، بەڵام لەبەرئەوەی موقەصیر بوون له عیلمی سوننەدا شارەزا نەبوون وه تەسلیمی موعتەزیله ببوون له هەندێک ئوصوڵی فاسد و پووچەڵدا دەبینی له هەندێک ووتەیاندا قەولی موعتەزیله دەهێنن و هەڵگری هەمان قەولی ئەوانن و پێچەوانەی قەولی سوننه دەڵێن، ئەگەرچی له هەموو شتێکدا موافیقی موعتەزیله نین.

قال إِبن تيمية: فلا خلاف بين الناس أَنَّ أَوَل من أَحدث هذا القول في الإِسلام أَبو محمد عبدالله بن سعيد كُلَّاب البصري، واتبعه على ذالک أَبو الحسن الأَشعري ومن نصر طريقتهما، وكانا يُخالفان المعتزلة، ويوافقان أَهل السنة في جُمَل أُصول السنة، ولكن لتقصيرهما في علم السنة وتسليمهما للمعتزلة أُصولاً فاسدة، صار في مواضع من قوليهما مواضع فيها من قول المعتزلة ما خالفا به السنة، وإِن كانا لم يوافقا المعتزلة مطلقًا.

الإِستقامة لابن تيمية | (٢٦٤/١)

إبن كُلاب و أبو حسن الأشعري لەسەر ئەو عەقیدەیەن کە الله ﷻ قسە ناکات بە صەوت! بەڵکو کەلامەکەی خەلق کردووە، ئەمەش عەقیدەی جەهمییەکانە کە پێیان وایە کەلامی الله مەخلوقە.

**إبن تيميه** دەڵێ: إبن كُلاب، پاشان أبو الحسن الأشعرى و هاوشێوەکانیان کاتێک مونازەرەیان لەگەڵ موعتەزیلە دەکرد دەربارەی جێگیرکردنی صیفات، وە دەیانوت قورئان مەخلوق نییە وایان دەبینی ئەمە نایەتەجێ هەتا نەڵێن قورئان قەدیمە "واتە الله ﷻ یەک جار قسەی کردووە، دوای ئەوە قسەی نەکردووە و نایکات"، وە ناکرێ قەدیم بێ، ئیللا بەوە نەبێ کە بوترێ کەلامێکە قائم بە نەفسی الله ـیە وەکو عیلم، وە ئەوەشیان بۆ زیاد کرد: کە الله بە صەوت قسە ناکات، موخالەفەی جمهوری هەموو موسڵمانانیان کرد لە ئەهلی حدیث، فقه، کەلام، تەصەوف هەرچەندە قەول و عەقیدەشیان جیاوازە، لە کاتێکدا هەموو ئاثارەکان شاهێدی ئەوەن کە الله ﷻ قسە دەکات بە صەوت، هەربۆیە ئیمامی أحمد رحمه الله غیری ئەویش ئەو کەسانەیان بە جەهمی دادەنا کە دەیانوت الله قسە ناکات بە صەوت.

قال إِبن تيمية: فإِنَّ أَبا سعيد ابن كُلاب، ثم أَبا الحسن الأَشعري ونحوهما لما ناظروا المعتزلة في إِثبات الصفات، وأَنَّ القرآن ليس بمخلوق ورَأَوا أَنَّ ذالک لا يَتِم، إِلا إِذا كان القرآن قديمًا، وأَنَّه لا يمكن أَن يكون قديمًا، إِلا أَن يكون معنى قائم بنفس الله كعلمه وزادوا: أَنَّ الله لا يتكلم بصوت، وخالفوا جمهور المسلمين من أَهل الحديث والفقه والكلام والتصوف، وإِن تنوعت مآخذهم، فإِنَّ الآثار شاهدة بأَنَّ الله يتكلم بصوت، ولهذا جَهَمَ الإِمام الأَحمد رحمه الله وغيره من أَنكر ذالک.

مجموع الفتاوى لابن تيمية | **(٥٧٩/١٢)**

لای إبن كُلاب كەلامی الله ﷻ هەر یەک دانەیە و گۆڕانكاری بەسەردا نەهاتووە، واتە هەر ئەو قورئانە عەرەبییەی کە دایبەزاندووە بۆ ڕەسول الله ﷺ هەمان تەوراتەکەی موسى پێغەمبەرە ﷺ، تەنها زمانەکەی گۆڕاوە، ئەمیان بە عیبری و ئەویان بە عەرەبی، واتە الله ﷻ یەک جار قسەی کردووە دووبارە ناتوانێ بیکاتەوە.

ئەشعەرێ دەڵێ: ئەوەش قەول و عەقیدەی عبدالله بن سعید ابن كُلاب: الله سبحانە زوو قسەی کردووە، وە کەلامەکەی صیفەتێکە قائم بە، وە قەدیمە بە کەلامەکەی، وە ئەم کەلامەی قائمە بە خۆیەوە هەروەک

چۆن عیلمەکەشی وایە، قەدیمە بە عیلم و قودرەتیشیەوە، وە کەلامی الله نەحەرفە نەصەوت، وە کەلامی الله دابەش نابێ هەمووی یەک بەش و یەک شتە و گۆڕانکاری و جیاوازی تێدا نییە و بەسەردا ناهێ، وە کەلامی الله ﷻ یەکێکە ڕەسمەکەی ئەو حەرفە جیاواز و گۆڕاوانەیە کە قورئانی پێ دەخوێنرێتەوە، وە شتێکی غەڵەتە ئەگەر بوترێ: کەلامی خودی الله ـیە یاخود هەندێکیەتی یاخود غیری ئەوە، وە بوترێ عیبارەتەکانی کەلامی الله سبحانە جیاوازە و دەگۆڕێ، بەڵکو کەلامی الله سبحانە نەجیاوازە و نەدەگۆڕێ وەک ئەوەی چۆن زیکرەکانمان بۆ الله ﷻ دەگۆڕێ و جیاوازە.

هەربۆیە کەلامی الله سبحانە ناونراوە عەرەبی، لەبەرئەوەی شێواز و وێنەکەی عەرەبییە و ئەم وێنەیە عیبارەتە لە کەلامی الله، وە خوێندنەوەکەی عەرەبییە، لەبەر ئەو هۆکارە ناونراوە عەرەبی، هەروەها ناونراوە عیبرانی لەبەر ئەو هۆکارەی شێواز و ڕەسمی نوسینی عیبارەتە لە عیبرانی بوونی.

وهذا قول عبدالله بن كُلاب: إِنَّ الله سبحانه لم يزل مُتكلمًا، وإِنَّ كلام الله سبحانه صفة له قائمة به، وإِنَّه قديم بكلامه، وإِنَّ كَلامه قائم به كما أَنَّ

العلم قائم به، وهو قديم بعلمه وقدرته، وأَنَّ الكلام ليس بحُروفٍ ولا صَوْتٍ، ولا يَنْقَسِم، ولا يَتَجزَّأٌ ولا يَتبَعَّضُ ولا يَتغَايَرُ، وأَنَّه واحد بالله ﷻ، وأَنَّ الرَّسم هو الحُروف المُتَغَايِرَة، وهو قِراءَةُ القُرآن، وأَنَّه خَطأٌ أَن يُقال: كلام الله هُوَ هُوَ الله أَو بَعْضُهُ أَو غيره، وأَنَّ العبارات عن كلامِ الله سبحانه تَختَلِفُ وَتَتَغايَرُ، وكلام الله سبحانه ليس بمختلف ولا مُتَغَايِرٍ كما أَنَّ ذِكْرَنا للهِ ﷻ يَختَلِفُ ويَتَغَايَرُ، والمذكور لا يَختَلِفُ ولا يَتَغَايَرُ.

وإِنَّما سميَ كلام الله سبحانه عربيًا، لِأَنَّ الرسم الذي هو عبارة عنه وهو قراءته عربي، فسمي عربيًا لعلة، وكذالک سميَ عبرانيًا لعلة، وهي أَنَّ الرسم الذي هو عبارة عنه عبراني.

مقالات الإِسلاميين للأَشعري ا صـ : ٧٧٣

ووتم: پوختەی قسەکانی ئەوەیە الله قسە ناکات، وە هەموو قورئان یەک مانای هەیە، ئایەتەکان هەرچەندە جیاوازن، بەڵام یەک مانا دەبەخشن! إبن کُلَّاب پێش ساڵی **(٢٤٠)** لە ژیاندا بووە لە کتوبەکانی تەراجم ساڵی وەفاتی بە ڕاستی دیاری نەکراوە، تەنها لەسەر ئەوە هاوڕان لە ٢٤٠ ـکاندا وەفاتی کردووە.

**أبى نصر السجزي** ڕەدی ئەم قەولەی إبن كُلاب دەداتەوە کە ئەشعەریش شوێنی کەوتووە دەڵێ: ئەگەر بڵێن قورئان ناوێکە بۆ کەلامی الله، ئەوە پێویستە بشڵێن هەریەک لە تەوارت و ئینجیل و زەبور و صوحوفی إبراهیم و موسی هەموویان قورئانن! وە پێویستە پێیان وابێ ئەو کەسانەی لە جوولەکە باوەڕیان بە تەورات هەیە ئەوە باوەڕیشیان هێناوە بە قورئان و باوەڕیان پێیەتی، وە بەوەشی تیایدا هاتووە، وە جائز نییە جزیەیان لێ وەبگیرێ دوای ئەوەی دانت ناوە بەوەدا کە ئیماندارن.

قال السجزي: وإِن قالوا: إِنَّ القرآن اسم لكلام الله جُملَةً، وَجَبَ أَن تَسمى التوراة، والإِنجيل، والزَّبور، وصُحفُ إِبراهيم وموسى أَجمعُ قرآنًا، وَوَجَبَ أَن يكون المؤمن بالتوراة مِنَ اليهود مؤمنًا بالقرآن وبما فيه، وغير جائز أَن تُؤخذ منه الجزية بعدَ وجوب الحُكم بإِيمانه.

الرد على من أَنكر الحرف والصوت للسجزي ا صـ : ٣٧

دووبارە دەڵێ: ئیجماع دامەزراوە لە نێوان هەموو عاقڵاندا لەسەر ئەوەی کەلام پێکهاتووە لە حەرف و صەوت، بەڵام کاتێک إبن كُلاب و هاوشێوەکانی پەیدابوون هەوڵیاندا ڕەدی موعتەزیلە بدەنەوە تەنها لە ڕێگەی عەقڵەوە، وە ئەوان هیچ شارەزاییەکیان نەبوو بە سوننە و ئەوەی

سەلەف لەسەری بوون، وە ئیحتجاجیان بەو ئاثار و خەبەرانە نە دەکرد کە لەم بوارەدا هەبوون، چونکە پێیان وابوو خەبەری آحاد ــن تەنها یەک ڕاوی ڕیوایەتی کردووە، خەبەری لەم جۆرە عیلم ناگەیێنێ و دەلالەتی پێناکرێ، موعتەزیلە ئیلزامیان کردن بەوەی خەڵکی موتەفیقن لەوەی کەلام پێکهاتووە لە حەرف و صەوت، بەم جۆرە هەموو کەلامێکی پێشتر و دواتر داخڵی دەبێ، لەم کاتەدا ئەو کەلامە وجوودی نابێ ئیللا بە جووڵە دەبێ وە هەندێک جاریش بێدەنگی، وە لابود دەبێ بەش بەش و جیاواز بێ، هەر شتێک بەم شێوازە بێ ناکرێ صیفاتێک بێ لە زاتی الله، چونکە زاتی الله سبحانە وەصف ناکرێ بە وەی کەلامەکەی کۆ دەبێتەوە و دادەبڕرێ، وە بە هەموو یاخود هەندێک، جووڵە یاخود بێ دەنگی، حوکمی صیفەتی زات حوکمی خودی زاتە.

ووتیان: بەم ڕستەیە دەزانرێ و دەردەکەوێ ئەو کەلامەی زیاد کراوە بۆ الله ﷻ مەخلوقی خۆیەتی، دروستی کردووە پاشان زیادی کردووە بۆ نەفسی خۆی و داویەتیە پاڵ خۆی، هەروەک چۆن دەوترێ: عبدالله، خلق الله، فِعلُ الله.

بەم ئیلزامەی موعتەزیلە إبن كُلاب و هاوشێوەكانی بەسترانەوە و ئیحراج كران، بە هۆی ناشارەزایی و كەمی عیلمیان بە سوننە، تەسلیمی عەقڵ بوون و ئەوەی موعتەزیلە ئیلزامیان پێكردبوون قبوڵیان كرد، وازیان لە شتێک هێنا کە گومانی تێدا نییە تەنها بۆ قسەی موعتەزیلە، خیلافی ئەو ئیجماعەیان كرد كە موتەفیق بوو لە نێوان موسڵمان و كافردا، بە موعتەزیلەكانیان ووت: ئەوەی باستان كرد بۆمان لە حەقیقەتدا كەلام نییە، بەڵكو بە مەجاز ناونراوە كەلام، لەبەرئەوەی حیكایەت یاخود عیبارەت دەكات لێی، حەقیقەتی كەلام مانایەكە پەیوەستە بە زاتی قسەكەرەكەوە.

ئەصڵی چەواشەكارییەكەیان لەسەر خەڵكی عەوام، وە شاردنەوە و داپۆشینی حەق لە موبتەدئین ئەوەیە دەڵێن: حەرف و صەوت ناكرێ وجوودی هەبێ ئیللا لە ئالەت و ئەندامانێک نەبێ، وەک: بەشی سەرەوە و خوارەوەی ناو دەم و لێو، ئاشكرایە هەموو حەرفێک شوێنی دەرچوونی خۆی هەیە، وە الله ﷻ خاوەن ئەدەوات و ئەندام نییە، هەركەسێک حەرف و صەوت سابت بكات، ئەوە جسمی بۆ الله سابت كردووە ئەمەش

کوفره، الله ﷻ فەرموویەتی: ﴿ لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٌ ﴾ الشورى : ١١ بۆیه نابێ هیچ کەلامێک وەک کەلامەکەی بێ.

ئەمە تەمویهە دڵ نەخۆشەکان زوو قبوڵی دەکەن و بە پیریەوە دەچن، پێیان وایە ئەمە تەنزیهی الله ـیە ﷻ، بەڵام بابەتەکە وانییە و پێچەوانەی قسەی ئەوانە.

قال السجزي: فالإِجماع مُنعَقِد بين العُقلاء على كَونِ الكلام حَرفًا وصَوتًا. فلما نَبَغَ ابن كُلَّاب وأَضرابُه، وحاولوا الرَّدَّ على المُعتزِلة مِن طريق مُجَرَّد العَقل، وهم لا يخبُرون أُصول السُنَّة، ولا ما كانَ السَّلَف عليه، ولا يحتَجَّون بالأَخبار الواردة في ذالک، زعمًا مِنهم أَنَّهَا أَخبار آحاد، وَهِيَ لا توجب عِلمًا، وَأَلزَمَتهُمُ المُعتزلة أَنَّ الاتفاقَ حاصِلُ على أَنَّ الكلام حرفُ وصَوت، وَيَدخُلُهُ التَّعاقُبُ والتَّأْليف، وذالک لا يوجَدُ في الشَّاهِدِ إِلَّا بِحَرَكَةٍ وسُكونٍ، ولَابُدَّ لَه مِن أَن يكون ذا أَجزاءٍ وأَبعاضٍ، وما كانَ بهذه المَثابة لا يجوز أَن يكونَ مِن صِفَات ذاتِ الله، لِأَنَّ ذاتَ الله سُبحانه لا توصَف بالاجتماع والافتراق، والكُلِّ والبَعضِ، والحَرَكَةِ والسُّكُونِ، وحُكْمُ الصِّفَة الذَّاتِيَّة حُكمُ الذَّات.

قالوا: فَعُلِمَ بهذه الجُملة أَنَّ الكلام المُضاف إِلى اللهِ سُبحانه خلقُ له، أَحدَثَه وأَضَافه إِلى نفسه، كما تقول: عبدالله، وخلق الله، وفِعلُ الله.

فَضَاقَ بابن كُلَّاب وأَضرابه النَّفسُ عند هذا الإِلزام، لِقِلَّةِ معرفتهم بالسُنَنْ، وتركهم قبولها، وتسليمهم العِنَان إِلى مجرد العقلِ، فالتزموا ما قالته المعتزلة، وركبوا مُكابَرة العِيَان، وخَرَقوا الإِجماع المُنعقِد بين الكَافة، المسلم والكافر، وقالوا للمعتزلة: الذي ذكرتموه ليس بحقيقة الكلام، وإِنَّما يُسمى ذالك كلامًا على المَجاز، لِكَونه حِكايةً أَو عِبارَةً عنه، وحقيقة الكلام: معنى قائم بذات المتكلم.

وأَصلُ تلبيسهم على العوام، وتَمَوَّهِهِم على المبتدئين هوَ أَنَّ الحَرف والصَّوت لا يجوز أَن يُوجَدا إِلَّا عن آلَةٍ وانخِراقٍ، مثل: الشَّفَتين، والحَنَكِ، وأَنَّ لِكُلِّ حَرفٍ مخرجًا معلومًا، وأَنَّ الله سُبحانه ليس بذي أَدواتٍ بالاتفاق، فمن أَثبتَ الحرف والصَّوتَ في كلامه، فقد جَعَله جِسمًا ذا أَدَواتٍ، وهوَ كُفر، قال الله سُبحانه: ﴿ لَيْسَ كَمِثلِهِ شَيْءٌ ﴾ الشورى: ١١ فَيَجب أَلَّا يكون كَكَلامِه كلام.

ونفوس ذوي النقص مُسرعة إِلى قبول هذا التَّمويهِ، يظنون أَنَّ في ذالك تنزيهًا لله سُبحانه، والأَمر بخلاف ذالك.

الرد على من أنكر الحرف والصوت للسجزي ا صـ : ٢١-١٨

هەروەها دەڵێ: أبو محمد إبن كُلاب و ئەوانەشی موافیقی ئەو بوون، هەروەها ئەشعەری و غیری ئەویش دەڵێن: قورئان مەخلوق نییە، هەرکەسێک بڵێ مەخلوقە کافرە، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا الله قسە ناکات نە بەعەرەبی، نە بەهیچ زمانێکی تر، وە کەلامەکەی پێکنەهاتوو لە ڕستە، وە نەحەرفە و نەصەوت.

وقال أَبو محمد بن كُلَّابٍ ومَن وافقه، والأَشعري وغيرهم: القرآن غير مخلوق، ومَن قال بخلقه كافر، إِلَّا أَنَّ اللهَ لا يَتَكَلَّمُ بالعربية، ولا بغيرها من اللُّغات، ولا يَدخُل كلامه النَّظمُ، والتَّأليفُ، والتَّعاقُب، ولا يَكونُ حَرفًا، ولا صَوتًا.

الرد على من أنكر الحرف والصوت للسجزي ا صـ : ٣٥



# ئەشعەری و مەجلیسی موعتەزیلە و تەئویل و بیدعە

عادەتەن لە ڕەد دانەوەی خصومدا دەبێ بەڵگەت پێبێ بۆ قسەکانت، کاتێکیش ڕەدی مەنهەجی ئەهلی بیدەع و ئەهلی کەلام دەدەیتەوە و باتڵ بوونی عەقیدەکەیان بۆ خەڵکی ڕوون دەکەیتەوە، یەکێک لەو بەڵگە بەهێزانە قەولی خۆیانە لەسەر خۆیان کە شاهێدی دەدەن لەسەر خۆیان و عەقیدەکەیان.

ئینسان ئەگەر لەسەر باتڵ بێ کاتێک تەوبە دەکات دەبێ کولییەن واز لە فیکرە باتڵەکەی بهێنێ، وە نابێ لەگەڵ ئەو کەسانە بگەڕێ کە پێشتر لەگەڵیان بووە، بەڵکو دەبێ هەجریان بکات و صاغرانە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکات، أبو الحسن الأشعری بە حساب تەوبەی کردووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر تەئویلی صیفاتی کردووە، بەردەوام لە مەجلیسی موعتەزیلەکاندا بووە پێکەوە کۆبوونەتەوە، ئەمە چ تەوبە کردنێکە لە کاتێکدا لەسەر هەمان تەعطیل و بیدعەکەی پێشوو بێ؟!

إبن عساكر لە قەولێکی تریدا دان بەوەدا دەنێ کە أبو الحسن الأشعری لەسەر عەقیدەی ئەهلی کەلام و تەئویل بەردەوام بووە، کاتێک ڕەدی أبو

على الأهوازى دەداتەوە کە لە کتێبی مثالب إبن أبي البشر وتوویەتی:

ومُنذ قَوِيَ ذالک واشتهر أَقَلُّ من نحو ثلاثين سنة .

مثالب ابن أَبي البشر للأَهوازي ا صـ : ١٧

دەڵێ: ئەم عەقیدەیە و نیسبەت دانی بۆ لای ئەشعەری لە سەردەمێکی زیاترەوە بەردەوامی هەیە، لە سەردەمی قاضی أبي بكر الباقلاني خاوەن و نوسەری کتێبە باشەکان، وە لە بەغداد و شارەکانی تریش بڵاوبوویەوە...

قال: فلعمري إِنه إِنما اشتهرت هذه النسبة من الأزمنة، في عصر القاضي أَبي بكر الباقلاني ذي التصانيف المستحسنة، وانتشرت ببغداد وغيرها من البلدان والأمكنة...

تبيين كذب المفتري لابن عساكر ا صـ : ٣٠٢

تەنانەت بە حسابی تەوبە کردنیشی هەر خەریکی تەئویلات و کەلامی موتەکەلمین بووە، هەردەم لە مەجلیسی موعتەزیلەکاندا بووە، تێکەڵ بووە لەگەڵیان ڕۆژانە مەجلسیان هەبووە، ئەمە بە شاهێدی ئەشاعیرە خۆیان، ئەوەتا إبن عساكر یەکێکە لە شێخەکانیان بە سەنەدی خۆی ڕیوایەت

دەکات کە أبو الحسن الأشعری ڕۆژانە لەگەڵ موعتەزیلەکاندا مەجلیسی هەبووە، وەڵامی یەک بە یەکیانی داوەتەوە.

أَخبرنا الشيخ أَبو المظفر أَحمد بن الحسن الشعري، أَنبأَنا أَبو الفضل محمد بن علي بن أَحمد البسطامي، قال: وسمعت القاضي أَبا بكر محمد بن الحسين الإِسكافي، قال: سمعت القاضي أَبا بكر محمد بن الطيب بن محمد الأَشعري يقول: سمعت أَبا عبدالله بن خفيف يقول: دخلت البصرة، وكنت أَطلب أَبا الحسن الأَشعري، فأُرشدت إِليه فإذا هو في بعض مجالس النظر، فدخلت فإذا ثم جماعة من المعتزلة، فكانوا يتكلمون، فإِذا سكتوا وأَنهوا كلامهم، قال لهم أَبو الحسن الأَشعري لواحد واحد: قلت كذا وكذا، والجواب كذا وكذا، إِلى أَن يجيب الكل.

تبيين الكذب المفتري لابن عساكر ا صـ : ٦٩

ووتم: ئەمەش یەکێکە لە خاڵەکانی باتڵ بوونی مەنهەجەکەی، چونکە لە مەنهەجی ئەهلی سوننە نەبووە بەو جۆرە لەگەڵ ئەهلی باتڵ دانیشتن و مەجلس ببەسترێ، ئەهلی سوننە ڕێگەیان نەداوە ئەهلی بیدعە بێنە مەجلیسیان چ جای ئەوەی خۆیان بچنە مەجلیسی ئەهلی بیدەع و کوفاری موعتەزیلە و مەجلیسی خۆیانیان بۆ واڵا بکەن و گوێیان بۆ بگرن

و پێکەوە مەسائیلەکان شیتەڵ بکەن! ئەوەتا سەلەف لە صەحابە و تابعین بە توندی نەهییان لەوە کردووە لەگەڵ ئەهلی ئەهواء کۆ ببیتەوە، تەنانەت ئەگەر هاتوو بیدعەچییەکە بیەوێ حدیثێک بخوێنێتەوە، یاخود ئایەتێک! ئەصڵەن وەڵامی سەلامی بیدەعەچییان نەداوەتەوە چ بگات بە موعتەزیلە!

**عبدالله کوڕی مسعود** دەڵێ: ئیعتبار دانان بۆ خەڵکی و حوکمدان بەسەریاندا لە هاوڕێکانیانەوە ببینن، چونکە ئینسان هاوڕێیەتی کەسێک ناکات ئیللا بە دڵی نەبێ.

حدثنا أَبو زياد بن ربيعة بن الحارث الخولاني الحمصي، قال: حدثنا جعفر بن عبدالله السالمي الأشجعي، قال: حدثنا يزيد بن عطاء، قال: قال عبدالله بن مسعود رضي الله عنه: اعتبروا الناس بأَخذانهم، فإن المَرءَ لا يُخادن إِلَّا من يُعجبُه.

رواه الخلال في كتاب السنة ا ٢٣٨١ وابن بطة في الإبانة الكبرى ا ٤٠٧

**عبدالله کوڕی مسعود** دەڵێ: ئینسان لەگەڵ ئەو کەسانەدا هاوڕێیەتی و هەڵسوکەوت دەکات کە خۆشی دەوێن و وەک خۆی وان.

حدثني أَبو محمد بن أَيوب، قال: حدثنا إِسماعيل بن إِسحاق القاضي، قال: حدثنا سليمان بن حرب، قال: حدثنا شعبة، عن أَبي إسحاق، عن هُبيرة، عن عبدالله بن مسعود رضي الله عنه، قال: إِنما يُماشي الرجلُ ويصاحبُ من يُحبُّ، ومن مثله.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٥٢٦

**سفیان** دەڵێ: هیچ شتێک نییە هێندەی هاوڕێی چاک کاریگەری هەبێ لەسەر چاک بوونی هاوەڵەکەی، وە هیچ شتێک نییە هێندەی هاوڕێی خراپ کاریگەری هەبێ لەسەر خراپ بوونی هاوەڵەکەی.

حدثنا إِسحاق الكاذي، قال: حدثنا عبدالله بن أَحمد بن حنبل، قال: وجدت في كتاب أَبي: حدثنا معاوية الغَلّابي، قال: قال سفيان: ليس شيءٌ أَبلغُ في فساد رجلٍ وصلاحه من صاحبٍ.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٥٣١

**مالک کوڕی دینار** دەڵێ: خەڵکی جۆرا و جۆرن وەک جۆراو جۆری تەیرەکان، کۆتر لەگەڵ کۆتر، قەلە ڕەش لەگەڵ قەلە ڕەش، قاز لەگەڵ قاز، وە تەیری الصَّعو لەگەڵ الصَّعو، وە هەموو ئینسانێک لەگەڵ هاوشێوەی خۆی هەڵسوکەوت دەکات.

حدثنا أَبو القاسم حفص بن عمر، قال: حدثنا أَبو حاتم، قال: حدثنا مُؤمَّل ابن إِهاب الرَّبعي، قال: حدثنا سيَّار، عن جعفر، قال: سمعت مالك بن دينار، يقول: الناس أَجناسٌ كأَجناسُ الطير، الحمام مع الحمام، والغُراب مع الغُراب، والَبَطُّ مع البَطِّ، والصَّعوُ مع الصَّعوِ، وكل إِنسان مع شكله.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٥٣٩

**أبو قلابه** دەڵێ: أبو الدرداء دەڵێ: لە فیقهی پیاوە بزانێ لەگەڵ کێ هەڵسوکەوت دەکات، ئەچێتە لای کێ، لەگەڵ کێ دەچێتە دەرەوە.

پاشان **أبو قلابه** دەڵێ: الله شاعیر بکوژێ کە وتوویەتی:

پرسیار لە حاڵی ئینسان مەکە بەڵکو تەماشای هاوڕێکەی بکە. چونکە هاوڕێ شوێن هاوڕێی دەکەوێ و ئیقتدای پێ دەکات.

حدثنا أَبو عقيل أَنس بن السلم، قال: حدثنا مُعلَّل بن نُفيل، قال: حدثنا عبيدالله ابن عمرو، عن أَيوب، عن أَبي قِلابة، عن أَبي الدرداء قال: من فقه الرجل: مَمشاه، ومَدخله، ومخرجه.

ثم قال أَبو قِلابة: قاتل الله الشاعير حين قال:

عن المَرءِ لا تسأَل وأَبصر قرينه .. فإن القرينَ بالمُقارِنِ مُقتدي

رواه الخلال في كتاب السنة ا ٢٣٨٢ وابن بطة في الإبانة الكبرى ا ٤٠٨

**الأصمعی** دەڵێ: قەت ئەم بینیوە بەیتە شیعر هەبێ لە حدیث بچێ وەک قەولی عەدی:

لەکەسێک مەپرسە دەربارەی دینی بەڵکو سەیری هاوڕێکەی بکە .. چونکە هاوڕێ بەهاوڕێ هەڵدەسەنگێنرێ.

حدثنا أَبو عبدالله محمد بن يعقوب المتَّوثي -بالبصرة-، قال: حدثنا أبو بكر البلقي، قال: حدثنا أَبو حاتم سهل بن محمد، قال: حدثنا الأَصمعي قال: لم أَرَ بيتاً قط أَشبه بالسُنة من قول عَدي:

عن المرءِ لا تسأَل وأَبصِر قرينه .. فإِنَّ القَرينَ بالمُقارنِ مُقتدى

الإبانة الكبرى لابن بطة ا ٤٠٩

ووته‌كه‌ى **الأصمعى**: "ئه‌م ديوه‌ به‌يته‌ شيعر له‌ حديث بچێ" مه‌به‌ستى ئه‌وه‌يه‌ ئه‌و قه‌وله‌ هه‌مان واتاى ئه‌م حه‌ديثه‌ى هه‌يه‌ «ئافره‌ت و پياو له‌سه‌ر دينى هاوڕێكه‌يانن، بۆيه‌ با هه‌ريه‌ك له‌ ئێوه‌ سه‌ير بكات بزانێ كێ ده‌كاته‌ هاوڕێى ».

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: { **الرَّجُلُ عَلَى دِينِ خَلِيلِهِ، فَلْيَنْظُرْ أَحَدُكُمْ مَنْ يُخَالِلُ** }.

رواه أَبو داود ا ٤٨٣٣ والترمذي ا ٢٣٧٨ وأَحمد ا ٨٠٢٨ والخلال في كتاب السنة ا ٢٣٧٩ وابن بطة في الإبانة الكبرى ا ٣٨٨

**عبدالله كوڕى عباس** ده‌ڵێ: له‌گه‌ڵ ئه‌هلى هه‌واو ئاره‌زوو دامه‌نيشن، چونكه‌ دانيشتن له‌گه‌ڵيان دڵ ئه‌مرێنێ.

عن ابن عباس رضي الله عنهما قال: لا تُجالس أَهل الأَهواء، فإِنَّ مجالستهم مُمرضة للقلوب.

كتاب الشريعة للآجري ا ١٣٣ الإبانة الكبرى لابن بطة ا ٤٠٢

**أسماء كوڕی خارجه** دەڵێ: دوو پیاوی بیدعەچی هاتنە لای محمد کوڕی سیرین، ووتیان: یا أبا بكر حدیثێكت بۆ بگێڕینەوە؟ ووتی: ناء. ووتیان: ئایەتێكت لە قورئان بۆ بخوێنینەوە؟ ووتی: ناء. هەستن جێم بهێڵن ئەگینا من هەڵدەستم و ئێرە جێدەهێڵم.

قال سعيد ابن عامر: سمعت جدي أَسماء بن خارجة يُحَدِّثُ، قال: دخل رجلان على محمد بن سيرين من أَهل الأَهواء، فقالا : يا أَبا بكر نُحَدِّثُک بحديث؟ قال: لا. قالا: فنقرأ عليک آيةً من كتاب الله؟ قال: لا. لَتَقومَنَّ عَنِّي أَو لَأَقومَنه.

كتاب السنن للدارمي ا ٤٠٩ كتاب السنة لعبدالله بن أَحمد ا ١٠٩
كتاب الشريعة للآجري ا ١٢١ الإبانة الكبرى لابن بطة ا ٤٢٩

**سلام كوڕی أبی مطیع** دەڵێ: پیاوێک لە بیدعەچییەکان بە أیوب السختیانی ووت: یا أبا بكر، پرسیارێکت لێدەکەم دەربارەی کەلیمەیەک، أیوب پشتی هەڵکرد و بە پەنجەی ئیشارەتی کرد پرسیاری نیو کەلیمەشم لێمەکە.

قال سلام بن أَبي مطيع: أَنَّ رجلًا من أَصحاب الأَهواء قال لأَيوب السختياني: يا أَبا بكر، أَسأَلک عن كلمةٍ، قال: فولى أَيوب، وجعل يشير بإِصبعه ولا نصف كَلمة، ولا نصف كَلمة.

كتاب السنن للدارمي ا ٤١٠ كتاب السنة لعبدالله بن أَحمد ا ١١٠ كتاب الشريعة للآجري ا ١٢٠ الإبانة الكبرى لابن بطة ا ٤٣٣

**هشام كوڕی حسان** دەڵێ: پیاوێک بە محمد كوڕی سیرین ووت: فڵانە كەس دەیهەوێ بێت بۆ لات هیچ قسەیەكیش نەكات. إبن سیرین ووتی: بڵێ بە فڵان با نەهێت، چونكە دڵی بەنی ئادەم لاوازە، وە من دەترسم كەلیمەیەكی لێببیستم، تەئسیری هەبێ لەسەرم و دڵم نەگەڕێتەوە سەر حاڵی خۆی.

قال هشام بن حسان: قال رجلُ لابن سيرين إِنَّ فلاناً يُريد أَن يأتيک ولا يَتَكَلم بشيء. قال: قل لفلان: لا يأتيني، فإِنَّ قلبَ ابن آدم ضعيف، وإِني أَخاف أَن أَسمَع منه كَلِمَةً، فلا يرجع قلبي إِلى ما كان.

الإبانة الكبرى لابن بطة ا ٤٣٠

ووتم: سەلەف هەرچەندە موژدەی خێریان پێدراوە، بەڵام ترسیان لە لادانی دڵیان هەبووە و هەتا ئەوپەڕی ئاست خۆیان پاراستووە، ڕێیان نەداوە موبتەدیعێک یەک حدیثیان بۆ بخوێننەوە، یەک ئایەتیان بۆ بخوێننەوە، پرسیاری یەک کەلیمەکیان لێبکەن، کەچی أبو الحسن الأشعری بەیانی هەتا ئێوارە سەری لە ناو ڕئوسی موعتەزیلە بووە مەجلسی گەرم بووە لەگەڵیان خەریکی پرس و ڕاو ڕەئی گۆڕینەوە بوون، کەچی ئەشاعیرە دەڵێن ئەشعەری خەریکی دەعوەی حەق بووە و عەقیدەی صحیحی گەیاندووە!

**إبراهيم النخعي** دەڵێ: لەگەڵ ئەهلی هەواو ئارەزوو دامەنیشن، چونکە دانیشتن لەگەڵیان نوری ئیمان لە دڵ ناهێڵێ، وە جوانی ڕوومەتت لێدەسێنێتەوە، وە ڕق و قین دەچێنێ لە دڵی ئیمانداران.

عن الأعمش، قال: قال إبراهيم: لا تُجالسوا أَهل الأَهواء، فإِن مُجالستهم تذهب بنور الإِيمان من القلوب، وتَسلبُ محاسنَ الوجوه، وتُورثُ البغضة في قلوبِ المؤمنين.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٤٠٦

**مغيره** دەڵێ: محمد کوڕی سائب لە عەقیدەیدا هیچ گومڕاییەک نەبوو، ووتی: هەستن بمانبەن بۆ لای مورجیئە هەتا قسەکانیان ببیستین و بزانین چی دەڵێن! کاتێک ڕۆیشت عەقیدەی تێکچوو ووتەکانی ئەوان چوویە دڵیەوە نەگەڕایەوە هەتا بوویە هەڵگری قەولەکانیان.

قال مغيرة: خرج محمد بن السائب الكلبي وما كان له هوى، فقال: قوموا بنا إِلى المرجئة حتى نسمع كلامهم! فما رجع حتى عَلِقَه.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٤٧٧

**معمر** دەڵێ: إبن طاووس دانیشتبوو پیاوێکی عەقیدە موعتەزیلی هات دەستی کرد بە قسە کردن، إبن طاووس پەنجەکانی کردە گوێیەکانی، بە کوڕەکەشی ووت: کوڕم تۆش پەنجەکانت بە توندی بخە ناو گوێت، با هیچ شتێک نەبیستی لە قسەکانی. معمر دەڵێ: واتە دڵ لاوازە.

قال عبدالرزاق، أَخبرنا معمر، قال: كان إِبن طاووس جالسًا، فجاء رجل من المعتزلة، فجعل يَتَكَلم، فأَدخل ابن طاووس إِصبعيه في أُذنيه، وقال لابنه: يا بُنيَّ أُدخل إِصبعك في أُذنيك، واشدد، ولا تسمع من كلامه شيئًا. قال معمر: يعني أَنَّ القلب ضعيف.

رواه ابن بطة في الإبانة الكبرى | ٤٣١ واللالكائي في شرح أُصول اعتقاد أَهل السنة | ٢٤٨

**عبدالرزاق** دەڵێ: إبراهيم کوڕی محمد پێی ووتم: وای دەبینم لای ئێوە موعتەزیلە زۆرن؟ ووتم: بەڵێ، ئەوان پێیان وایە تۆش یەکێکی لەوان. ووتی: ئا وەرە ئەو دووکانە هەتا قسەت لەگەڵ بکەم؟ ووتم: نەخێر ناهێم. ووتی: بۆ؟ ووتم: چونکە دڵ لاوازە، حەق و دینیش ئەوە نییە هەرکێ بەهێزتر بوو ئەوە پێکابێتی.

قال عبدالرزاق: قال لي إبراهيم بن محمد بن أَبي يحيى: أَرى معتزلة عندكم كثيراً؟ قلت: نعم، وهُم يزعمون أَنَّك منهم. قال: أَفلا تدخل معي هذا الحانوت حتى أُكلمك؟ قلت: لا. قال: لِمَ؟ قلت: لأن القلب ضعيف، والدِّين ليس لمن غَلب.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٤٣٢

وەک بینیتان ئەهلی سوننە زۆر توند بوون بەرامبەر ئەهلی بیدەع بە سووک سەیریان کردوون و هەجریان کردوون بە هەموو جۆرێک زەلیلیان کردوون بۆ ئەوەی تەوبە بکەن لەو بیدعانەی دەستیان داوەتێ، ئەمە بۆ موسڵمانی ئەهلی بیدەع وابوون، بەرامبەر موبتەدیعی کوفری زۆر توندتر

بوون، دەی دەبێ ڕات چۆنبێ بەرامبەر بیدعەیەک کە بناغەی دینەکەت بڕمێنێ و هەرچی صیفاتی اللە ـیە ﷻ ڕەتبکاتەوە هێشتا خاوەنەکەشی بە ئیمام تەماشا بکەیت و شوێن کەوتووەکانیشی بە ئەهلی سوننە حساب بکرێ!!

ئەنجا ئەشاعیرە خۆیان لە خودی أبو الحسن الأشعری ڕیوایەت دەکەن دان بەوەدا دەنێ خەریکی بیدعە بووە بە بیدعە ڕەدی موعتەزیلەی داوەتەوە.

فقال: لِأَني أَظهرت بدعة أَنقض بها كفرهم، وإِنما يسأَلون عن منكرهم، فيلزمني رد باطلهم إِلزامًا.

تبيين الكذب المفتري لابن عساكر ا صـ: ٧٠

لە کاتێکدا لە شەرعدا ئەمە جێی نابێتەوە، ڕەد دانەوەی باتڵ بە باتڵ هیچ کات طەریقەی ئەهلی حەق نەبووە، بە پێی حدیث هەموو بیدعەیەک گومڕاییە.

عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِاللهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِذَا خَطَبَ ..... « **أَمَّا بَعْدُ، فَإِنَّ خَيْرَ الْحَدِيث كِتَابُ الله، وَخَيرُ الْهُدَى هُدَى مُحَمَّدٍ، وَشَرُّ الأُمُورِ مُحْدَثَاتُهَا، وَكُلّ بِدْعَةٍ ضَلاَلَةٌ** .. ».

رواه مسلم ا ٢٠٠٥ والدارمي ا ٢١٤ وأحمد ا ١٤٣٣٤

عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: « **مَنْ أَحْدَثَ فِي أَمْرِنَا هَذَا مَا لَيْسَ مِنْهُ فَهُوَ رَدٌّ** ».

رواه البخاري ا ٢٦٩٧ ومسلم ا ٤٤٩٢ وأحمد ا ٢٦٠٣٣

ئەنجا ئەشعەری سەرەڕای باتڵی عەقیدەکەی لە ڕووی طەلەبی عیلمیشەوە نەزۆک بووە و جێ دەستی دیار نییە، عولەمایانی ئەهلی سوننە هەموویان کتێبەکانیان پڕی بووە لە ڕیوایەتی حدیث لە قەدیمەوە هەتا موتەئەخرین یەکەم هەنگاویان دوای حفظی قورئان ڕیوایەتی حدیث بووە، دەی ئەشعەری هەموو کتێبەکانی بگەڕێ حدیثێک نابینی بە سەنەد ڕیوایەت بکات! ئەمە ڕاستییەکە ئەشاعیرە خۆیان دانی پێدا دەنێن، هەروەک چۆن إبن عساکر لەم بارەیەوە دەڵێ:

وإِنما لم ينشر عنه الحديث بالرواية، لِأَنَّه كان قد قَصَرَ همته على الدِّراية، وصرَفها إِلى ما تقوى الأُصول، فلهذا عزَّ إِلى حديثه الوصول.

تبيين الكذب المفتري لابن عساكر ا صـ: ٢٩٥

سبحان الله چ ئوصولێک بەهێز دەبێ بەبێ ئەوەی پشت بە حدییث ببەسترێ؟! چ عیلمێک هەیە پێش بخرێ بەسەر حدیثدا لە کاتێکدا إبن عساكر دەعوای پێش خستنی کەلام دەکات بەسەر ئوصولی حدیثدا!.

نەک ئەشعەری کە دوورە لە إسناد بگرە غیری ئەویش بە هەمان شێوە بەو جۆرەن، ئەتباعەکانیشیان لە کتێبەکانیاندا لە جیاتی ڕیوایەت کردنی حدیث و ئەثەر بە سەنەد، هەر خەریکی قال الأَشعري وقال إِبن كُلَّاب قال القَلَانسي وقال الجبائي ــن.

قال السجزي: وخصومنا المُتَكَلِّمون معلوم منهم أَجمَعَ اجتناب النَّقل، والقول به، بَل تَمحِينُهُم لِأَهله ظاهر، ونفورهم عنهم بَيِّن، وكتبهم عاريَةٌ عن إِسناد، بل يقولون: قال الأَشعري، قال ابن كُلَّاب، قال القَلَانسي، قال الجُبَّائي.

الرد على من أَنكر الحرف والصوت للسجزي ا صـ: ٣٢

پاشان إبن عساكر دووباره دان بەوەدا دەنێتەوە أبو الحسن الأشعرى ئەهلی کەلام بووە، دوای ئەوەی باسی ئەشعەری دەکات، دواتر دێتە سەر ئەوانەی شوێنی عەقیدەکەی کەوتوون لە تەلەبەکانیەوە دەست پێ دەکات هەتا سەردەمی خۆی واتە سەردەمی إبن عساكر، یەکەم کەس ناوی هێناوە "أبو عبدالله بن مجاهد البصري" کۆتا کەسیش ناوی هێناوە "أبو الفتح نصر الله بن محمد بن عبدالقوي المصيصي" ئەنجا ئیعتراف دەکات لەسەر ئەوەی الأشعرى و ئەوانەشی ناوی هێناون ئەهلی کەلام بوون، وەصفی کردوون بە ئەئمەی ئەهلی کەلام.

فهذا ما حضرني من مَدح الكلام والمتكلمين، وذِكرِ بعض من كان نعلمه من علماء المسلمين.

تبيين الكذب المفتري لابن عساكر ا صـ : ٢٧٠

ئەوانەی تێپەڕین قەولی ئەشاعیرە خۆیانە شاهێدی دەدەن لەسەر ئەوەی کە ئەشعەری عەقیدەی موعتەزیلەی تێدا مابووە، ئەهلی کەلام بووە، ئیمامی ئەهلی کەلام بووە نەک شوێن حديث کەوتبێ و ئەهلی حديث بێ، چ پێناسە و ناساندێک هێندە بەهێزە کە شەخصێک پێناسەی

خۆی بکات؟ چ ئیعترافێک لەوە بەهێزتر کە ئەشاعیرە خۆیان وەصفی تەئویلی خۆیان و ئیمامەکەیان بکەن؟!



# تەئویلی ئەشعەری لە کتێبی الإبانة و رسالة إلى أهل الثغر

لە بەشی پێشوودا ئەوەمان ڕوون کردەوە أبو الحسن الأشعری دوای تەوبە کردنەکەشی هەر تەئویلی کردووە و تێکەڵاوی موعتەزیلەی کردووە و دەستی هەڵنەگرتووە لە کۆبوونەوە و مەجلیس کردن لەگەڵیان ئەوە بە شاهێدی ئەشاعیرە خۆیان وەک بینیتان ووتەکانیانمان هێنا، لێرەدا دەمەوێ تەئویل کردنی ئەشعەریتان بۆ بسەلمێنم لەم دوو کتێبەیدا هێناومە "الإبانة عن أُصول الديانة لەگەڵ رسالة إلى أهل الثغر" ئەم دووانەی لە کۆتاییەکانی تەمەنیدا نوسیوە، ئەشاعیرە زۆر دڵیان بەم دوو کتێبە خۆشە پێیان وایە تەواو ئەوەی تیایاندا هاتووە حەقە، نەک ئەشاعیرە زۆرێک لە خەڵکی جاهلیش تەنانەت بە مەلاکانیشەوە دڵ خۆشن بەو دوو کتێبە وا دەزانن لەسەر مەزهەبی ئەهلی سوننە نوسراون و پاک و بێگەردن لە باتڵ و پۆخڵەوات، هۆکاری ئەمەش ئەوەیە شارەزا نین بە عەقیدەی سەلەف و ئەصحابی حدیث هەرچی تەئویلی صیفات هەیە بە لایانەوە بووەتە تەنزیهی خالق و عەقیدەی ئەهلی سوننە!

بۆیە دەبینی کاتێک باسی تەوبەکەی دەکەن دێن پێمان دەڵێن: کتابی الإبانه لەسەر مەزهەبی ئەهلی سوننە نوسیویەتی، لە کاتێکدا پێشتر باسمان کرد ڕای ئەهلی سوننە چیبووە دەربارەی ئەو کتێبە، لێرەدا ئاماژە بە خاڵێکی گرنگ دەکەم ئەویش ئەوەیە ئەشعەری لەم کتێبەیدا لە پێشەکییەکەیدا لە دێڕی **(٥)** دوو غەڵەتی عەقیدەیی گەورە دەکات کە پێچەوانەی عەقیدەی ئەهلی سوننەن، ئەویش ئەوەیە مەسئەلەی صورە ڕەتدەکاتەوە، لەگەڵ حەدی الله ﷻ ! دەڵێ: "فليست له صورة تُقال، ولا حَدٌّ يضرب به المِثَال".

الإِبانة عن أُصول الديانة لأبي الحسن الأَشعري | صـ: ١

هەرچی صورەیە ئەوە بە حدیثی صحیح سابت بووە کە الله ﷻ پێغەمبەر ئادەمی ﷺ لەسەر شێوەی زاتی خۆی واتە الله ﷻ خەلق کردووە.

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: {خَلَقَ اللَّهُ آدَمَ عَلَى صُورَتِهِ ... }.

رواه البخاري | ٦٢٢٧ ومسلم | ٧١٦٣ وأحمد | ٨١٧١

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: { **إِذَا قَاتَلَ أَحَدُكُمْ أَخَاهُ، فَلْيَجْتَنِبِ الْوَجْهَ، فَإِنَّ اللَّهَ خَلَقَ آدَمَ عَلَى صُورَتِهِ** }.

رواه مسلم | ٦٦٥٥ وأَحمد | ٩٩٦٢ وعبدالله بن أَحمد في كتاب السنة | ٤٨٩ وابن أَبي عاصم في كتاب السنة | ٥٣٢ وابن خزيمة في كتاب التوحيد | ٣٨ والآجري في كتاب الشريعة | ٧٢١ واللالكائي في شرح أُصول اعتقاد أَهل السنة | ٧١٤

هەروەها حَدِّ ـيش ئەوە بە نەصی قورئان و حديث و ئیجماعی سەلەف سەلمێنراوە، تەنانەت هەركەسێک حەدی ڕەتكردبێتەوە تەكفير كراوە.

**الدارمی** دەڵێ: هەموو خەڵكی دەزانن هەر شتێک کە ناوی هەبێ هەڵگری ناو بێ ئیللا دەبێ حەدی خۆی هەبێ جیا بێ لە شتێكی تر، خاوەنی صیفاتی خۆی بێ، وە شتێک هەر وجوودی نەبێ، ئەوە حەد و صیفاتی نییە.

كەواتە شت ئیللا دەبێ وەصفی هەبێ، وە شتێک كە بوونی نەبێ، ئەوە وەصف دەكرێ بەوەی حەدی نییە، وە كاتێک دەڵێی: حەدی نییە، یانی ئەو شتە وجوودی نییە.

قال الدارمي: الخلق كُلهم علموا أَنَّه ليس شيء يقع عليه اسم الشيء إِلا وله: حَدٌّ، وغايةٌ، وصفةٌ، وأَنَّ لا شيء: ليس له حّدٌّ، ولا غايةٌ، ولا صفة.

فالشيء أَبدًا موصوف لا محالة، ولا شيء يوصف بلا حَدَّ، ولا غاية، وقولک: لا حَدَّ، يعني: أَنَّه لاشيء.

نقض عثمان بن سعيد على المريسي ١ صـ : ١٥٠

**الدارمی** دەڵێ: قەولی موسڵمانان و کافران موتەفیقە لەسەر ئەوەی الله ﷻ لە ئاسمانە، وە حەدیشی بۆ جێگیر دەکەن، ئیللا مریسي گومڕا و هاوڕێکانی نەبێ، تەنانەت منداڵانیش کە هێشتا باڵغ نەبوون الله ﷻ بەو جۆرە دەناسن.

قال الدارمي: إِتَفَقَت الكَلمة المسلمين والكافرين أَنَّ الله في السماء، وحَدُّوه بذالک، إِلا المريسي الضَّال وأَصحابه، حتى الصبيان الذين لم يبلغوا الحنث قد عرفوه بذالک.

نقض عثمان بن سعيد على المريسي ١ صـ : ١٥٦

**الدارمی** دەڵێ: ئێوەی جەهمی شتێک دەپەرستن لای خەڵکی هیچ نییە، چونکە هەموو خەڵکی موتەفیقن لەسەر ئەوەی هیچ شتێک نییە ئیللا صیفەت و حەدی خۆی هەیە، وە ئێوە وتووتانە الله حەدی نییە، وە الله تعالی بە درۆی خستوونەتەوە زاتی خۆی بە گەورەترین شت وەصف کردووە، وە خالقی هەموو شتێکە، الله تعالی دەفەرموێ: ﴿ قُلْ أَيُّ شَيْءٍ أَكْبَرُ شَهَادَةً ﴾ وە فەرموویەتی: ﴿ كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُ ﴾. ناوی خۆی بە گەورەترین شت هێناوە، خالقی هەموو شتەکانە، وە حەدی هەیە، بێجگە لە خۆی کەس نازانێ حەدەکەی چۆنە.

قال الدارمي: وعبدتم أَنتم شيئًا هو عند الخلق لا شيء، لأَنَّ الكلمة قد اتفقت من الخلق كلهم أَنَّ الشيء لا يكون إِلا بِحَدٍّ، وصِفَةٍ، وأَنَّ لا شيء ليس له حَدٌّ ولا صفة، فلذالک قلتم لا حَدَّ لَهُ، وقد أَكذبكم الله تعالى فسمَّى نفسه أَكبرَ الأَشياء وخَلَّاق الأَشياء قال الله تعالى: ﴿ قُلْ أَيُّ شَيءٍ أَكْبَرُ شَهَادَةً قُلِ اللهُ ﴾ الأنعام : ١٩ وقال: ﴿ كُلُّ شَيءٍ هَالِکٌ إِلَّا وَجْهَهُ﴾ القصص : ٨٨ فهو سَمى نفسه أَكبرَ الأَشياء، وأَعظم الأَشياء، وخلَّاقُ الأَشياء، ولَهُ حَدٌّ، وهو يعلمه لا غيره.

الرد على الجهمية للدارمي | صـ : ٩٤

إبن مندة دەڵێ: ئەو كەسەی حەد ڕەتبكاتەوە دینی نییە، چونكە بەو ڕەتكردنەوەیە ئەو حیجاب و جیاییە هەیە لەنێوان الله ﷻ لەگەڵ عەبدەكانی نایهێڵێ...

قال محمد بن أَبي نصر بن هاجِر، أَنبأَنا الإِمام الحافظ عبدالرحمن ابن الحافظ أَبي عبدالله ابن مَندَة أَنَّه قال: ولا دينَ لمن لا يرى للهِ الْحَدَّ، لأَنَّه يُسقِط من بينه وبين الله الحَاجِزَ، وَالحِجَابَ...

إِثبات الحد للدشتي ا ٩

أَبو إِسماعيل الأنصارى الهروى دەڵێ: پرسیم لە یحیى كوڕی عمار تۆ إبن حبان ـ ت بینیوە؟ ووتی: چۆن نەمبینیوە؟! ئێمە لە سجستان دەرمان كرد! خاوەنی علمێكی زۆر بوو، بەڵام خاوەنی دینێكی زۆر نەبوو! هات بۆ لامان حەدی بۆ الله ڕەتدەكردەوە، ئێمەش لە سجستان دەرمان كرد.

سأَلت يحيى بن عمار عن أَبي حاتم إِبن حبان البُستي، قلت: رأَيته؟ قال: كيف لم أَره؟! ونَحن أَخرجناه من سجستان! كان له عِلمٌ كثير، ولم يكن له كبير الدين! قَدِمَ علينا فأَنكَرَ الحدَّ لله، فأَخرجناه من سجستان.

ذم الكلام وأَهله للهروي ا ١٢٨٢

**الدارمی** تەکفیری ئەوانە دەکات پێیان وایە الله ﷻ حەدی نییە، دەڵێ: هەرکەسێک پێی وابێ الله ﷻ حەدی نییە، ئەوە قورئانی ڕەد کردووەتەوە، وە پێی وایە الله هیچ نییە، لە کاتێکدا الله ﷻ وەصفی خۆی کردووە بەوەی حەدی هەیە لە چەندین شوێن لە کتێبەکەی فەرموویەتی: ﴿ الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى ﴾. ﴿ ءَأَمِنتُم مَّن فِي السَّمَاءِ﴾. ﴿ يَخَافُونَ رَبَّهُم مِّن فَوْقِهِمْ ﴾. ﴿ إِنِّي مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ ﴾. ﴿ إِلَيْهِ يَصْعَدُ الْكَلِمُ الطَّيِّبُ وَالْعَمَلُ الصَّالِحُ يَرْفَعُهُ ﴾. ئەم ئایەتانە و هاوشێوەی ئەوانەش بەڵگەن لەسەر حەد، هەرکەسێک ئیعترافی پێنەکات، ئەوە کافر بووە بەو قورئانەی کە الله ﷻ دایبەزاندووە، وە ئایەتەکانی ڕەد کردووەتەوە.

قال الدارمي: فمن ادعى أنَّه ليس لله حَدٌّ، فقد رَدَّ القرآن، وادعى أنَّه لا شيء، لِأَنَّ الله وَصَفَ حَدَّ مكانه في مواضع كثيرة في كتابه: ﴿الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى ﴾. ﴿ ءَأَمِنتُم مَّن فِي السَّمَاءِ ﴾. ﴿يَخَافُونَ رَبَّهُم مِّن فَوْقِهِمْ ﴾. ﴿ إِنِّي مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَيَّ ﴾. ﴿ إِلَيْهِ يَصْعَدُ الْكَلِمُ الطَّيِّبُ وَالْعَمَلُ الصَّالِحُ يَرْفَعُهُ ﴾. فهذا كُله وما أَشبَهَهُ شواهد ودلائل على الْحَدِّ، ومن لم يعترف به، فقد كَفَرَ بتنزيل الله، وجَحَدَ آيات الله.

نقض عثمان بن سعيد على المريسي صـ : ١٥٣

بۆ زانینی بەڵگەی زیاتر دەربارەی حەد ئەوە بگەڕێنەوە بۆ ئەم بەشە "صیفاتی بەرزی الله جَلَّ جَلَالُهُ وە کافربوونی ئەشاعیرە پێی" لەوێدا بەڵگەی زیاترم داناوە بێجگە لەمانەی ئێستا، پێم باش نەبوو لێرە دووبارە بیانهێنمەوە.

ووتم: ئەو کتێبی الإبانە بیلبیلەی چاوی ئەشاعیرەیە پێیدا دەنازن لە کاتێکدا ئەوەیە حاڵی الإبانە! بێجگە لەوەش لە باب الكلام في الإرادة لاپەڕە (١٤١) هەتا باب ذكر روايات في القدر لاپەڕە (١٨٠) بە حسابی خۆی ڕەدی موعتەزیلە دەداتەوە لە کاتێکدا ئسلوبێکی ووشکی کەلامیانە وەڵامیان دەداتەوە دوور لە شێوازی ئەهلی سوننە.

هەروەها شانازیش دەکەن بە "رسالة إلى أهل الثغر" دەڵێن ئەمەی لەگەڵ "الإبانة عن أصول الديانة" لە کۆتا نوسراوەکانیەتی لەسەر مەزهەبی ئەهلی سوننە نوسیونی! لە کاتێکدا لەم ڕیسالەشدا صیفات ڕەتدەکاتەوە، صیفاتەکانی: "الرضا، السخط، الغضب" تەئویل دەکات.

وه هەندێک ئەلفاظ بۆ الله ﷻ لەگەڵ صیفات بەکاردەهێنێ وەک: "أعراض، جوهر، جسم" کە لە تەریقەی ئەهلی سوننە نییە، بەڵکو تەریقەی جەهمییە و موعتەزیلە زەندیقەکانە، هەروەها پێشی وایە لە قورئاندا مەجاز هەیە واتە کەلیمەیەک یاخود ڕستەیەک هاتووە، بەڵام ئەوە مەبەستەکەی نییە! ئەمەش ئەصڵی هەموو تەئویلێکە.

ئەشعەری پێی وایە لە قورئاندا مەجاز هەیە دەڵێ: هەر شتێک وەصف بکرێ بە صیفاتێک کە تیایدا نەبێ و موستەحەق نەبێ پێی ئەوە مەجازە و درۆیە!

مەگەر نابینی کاتێک الله ﷻ وەصفی دیوارەکە دەکات کە دەیویست بکەوێ « مەبەستی لێی ئەم ئایەتەی سورەتی الکهف. کاتێک دیوارەکە دەیویست بکەوێ پێغەمبەر موسی ﷺ ڕاستی کردەوە و دروستی کردەوە ﴿ فَوَجَدَا فِيهَا جِدَارًا يُرِيدُ أَن يَنقَضَّ فَأَقَامَهُ ﴾ الكهف : ٧٧ ». کاتێک ئیرادەی نەبێ ئەوە مەجازە، چونکە ئەو صیفاتانە موشتەق و وەرگیراون لە تایبەتترینی ناوی ئەو صیفاتە و دەلالەتی لێدەکات، هەرکات ئەو صیفاتە مەوجوود نەبێ تیایدا کە وەصفی پێکراوە، ئەوکات ئەو وەصفە کە پێی کراوە هەڵگەڕاوەیە یاخود درۆیە، ئەنجا لەبەرئەوەی الله ﷻ

وەصف کراوە بە هەموو ئەو صیفاتانە لە صیفەتی حەقیقەتدا واجبە ئیثباتی ئەو صیفاتانە بکرێ کە ئەو صیفاتەی واجب کردووە لەسەر حەقیقەتی، ئەگەرنا ئەوە وەصف کردنی مەجازە هەروەک چۆن وەصفی دیوارەکە مەجازە کاتێک ویستوویەتی بڕوخێ لە کاتێکدا خاوەنی ویست و ئیرادە نەبووە.

وأَنَّ مَن وُصِفَ بشيءٍ مِن ذالک مع عدم الصِّفات التي تُوجِب هذه الأَوصاف له لا يكون مستحقًا لذالک في الحقيقة، وإِنَّما يكون وصفه مَجَازًا أَو كَذبًا!

أَلا ترى أَنَّ وَصفَ الله ﷻ لِلجدار بأَنَّه أَراد أَن ينقضَّ لَمَّا لم يكن لَه إِرادة في الحقيقة كانَ مَجازًا، وذالک أَنَّ هذه الأوصاف مُشتَقَّةٌ من أَخَصِّ أَسماء هذه الصفات، ودَالَّة عليها، فمتى لم توجد هذه الصفات التي وُصِفَ بها، كان وصفه بذالک تلقيبًا أَو كذبا، فإِذا كان الله عَزَوَجَلَّ موصوفًا بجميع هذه الأَوصاف في صفة الحقيقية، وَجَبَ إِثبات الصفات التي أَوجبت هذه الأَوصاف له في الحقيقة، وإِلا كان وصفه بذالک مجازًا كما وصف الجدار بأَنَّه يريد لما لم يكن له إِرادة مجازًا.

رسالة إِلى أَهل الثغر لأَبي الحسن الأَشعري ا صـ : ٧٠

ووتم: تەماشاکەن ئەشعەری چ ڕێگایەک دەگرێتە بەر بۆ ڕەتکردنەوەی صیفات، هەر صیفاتێکیان بە دڵ نەبێ بەو جۆرە ڕەتیدەکەنەوە گوایە ئەم وەصفە لە ئەصڵدا ناکرێ لە حەقیقەتدا بدرێتە پاڵ الله ﷻ، چونکە ناگونجێ لە ئیرادەی الله ـدا وابێ، هەربۆیە دەڵێن ئەوە مەجازە واتە مەبەستی الله ﷻ لەو وەصفە لەسەر حەقیقەتەکەی نییە، بەڵکو مەبەستێکی تری هەبووە، بەمەش دەرگای تەئویل والا دەکەن بە ڕووی خۆیاندا.

وەک پێشتر باسمان کرد دەربارەی ئەلفاظی جسم، جوهر، أعراض کە ئەهلی تەعطیل دایان هێناوە، ئەوەتا ئەشعەری لێرەدا بەکاری دەهێنێ، هەروەها وەصفی الله ﷻ دەکات کە ناتوانین بڵێین لە شوێنێک بێ جگە لە شوێنێکی تر! ئەمەش نەفی مەکانە بۆ الله ﷻ هەروەک چۆن لە کتێبی الإبانة ـش حەد ڕەتدەکاتەوە..

ولا يجب أَن تكون أَعراضًا، لِأَنَّه عَزَوَجَلَّ ليس بِجِسمٍ، وإِنَّما توجد الأَعراض في الأَجسام، ويَدُلُ بأَعراضها فيها وتعاقبها عليها على حدثها.

والباري عَزَوَجَلَّ لا يجوز مُفارقة صفاته له من قبل أَنَّ في مفارقتها له ما يُوجب حَدَثَهُ وخروجه عن الأُلوهية، وهذا يستحيلُ عليه، كما لا يجب

أَن تكون نفس الباري عَزَوَجَلَّ جِسْمًا أَو جَوهَرًا أَو مَحدُودًا أَو في مكانٍ دون مكان.

رسالة إِلى أَهل الثغر لأَبي الحسن الأَشعري | صـ: ٧٢

سەرنج بدەنە ئەو قەولەی ئەشعەری: "أَو في مكان دون مكان" بزانن چەندە لە قەولی جەهمییەکان دەچێ، ڕێک هەمان قەولی جەهمییەکانە کە الدارمی لە کتێبەکەیدا ڕەدیان دەداتەوە قەولەکەیانی هێناوە.

ثم قلتم: إِنَّما يوصف بالنزول مَن هو في مكان دون مكان، فأَما مَن هو في كُل مكان فكيف ينزل إِلى مكان.

الرد على الجهمية للدارمي | صـ: ٩٤

بە دیاریکراوی هەمان قەولی جهم کوڕی صفوان ـ کە إبن بطة قەولەکەی هێناوە: قال جهم: فكذالک الله ﷻ لا يرى له وجهه ولا تُشمُ له رائحة، ولا يُسمع له كلام، وهو غائب عن الأَبصار، لا يُرى في الدنيا ولا في الآخرةِ، وهو في كُلِّ مكان، لا يكون في مكان دون مكان.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٢٣٨٦

گرۆی ئەشاعیرە ئەگەر دەڵێن چۆن وا دەڵێی لە کاتێکدا ئەشعەری لە کتابی الإبانە حەدی جێگیر کردووە؟ دەڵێم: ئەشعەری لە پێنجەم دێڕی کتێبی الإبانە حەدی ڕەتکردووەتەوە واتە پێش داغڵ بوونی بە ناوەڕۆکی کتێبەکەی حەد ڕەتدەکاتەوە! بە هیچ شێوەیەک ڕێگای دەرباز بوونتان نییە، هەرچەندە وای دابنێین لە الإِبانە ئیثباتی کردووە کە بەو جۆرەش نییە، خۆ لێرە لە رسالة إلى أهل الثغر ڕەتیدەکاتەوە، ئەمەش خاڵێکی ڕەشی ترە بە نێوچاوانی ئەشعەری کە ئەقوال و عەقیدەکەی پڕیەتی لە دژبەیەکی، لە یەک مەسئەلەدا دوو قەولی هەیە، دوو قەولی هەیە لە مەسئەلەیەکی فقهی نا، بەڵکو لە مەسئەلەیەکی عەقیدەیی، ئاخر چۆن دەکرێ لە صیفاتی الله ـدا ﷻ دوو قەولت هەبێ؟!

بە هەمان شێوە لێرەش دووبارە کەلیماتی جسم و جوهر بۆ الله ﷻ بەکاردێنێ، وە کاتێک باسی مەجیئی الله ﷻ دەکات لە ڕۆژی قیامەتدا، یاخود نزولی الله ﷻ بۆ ئاسمانی دونیا دەڵێ بەبێ جووڵە، چونکە الله ﷻ جسم و جوهر نییە.

وليس مجيئه حركَةً ولا زوالًا، وإِنَّما المجيء حركَةً وزوالًا إِذا كان الجائي جسمًا أَو جوهرًا، فإِذا ثبت أَنَّ الله عَزَوَجَلَّ ليس بجسم ولا جَوهَرٍ،

لم يجب أَن يكون مجيئه نَقْلَةً أَو حركَةً، فإِذا ثَبَتَ أَنه عَزَّ وَجَلَّ ليس بجسم ولا جوهر، لم يَجب أَن يكون مَجيئه نَقْلَة أُو حركة.

وأَنَّه عَزَوَجَلَّ ينزل إِلى السماء الدنيا، كما رُوي عن النبي ﷺ، وليس نزوله تعالى نَقْلَةً، لِأَنَّه ليس بجسم ولا جَوهَرٍ.

رسالة إِلى أَهل الثغر لأَبي الحسن الأَشعري ا صـ : ٨١

**عثمان كوڕی سعيد الدارمی** كاتێک ڕەدی بشر المريسی و جەهمییەکان دەداتەوە دەربارەی صیفاتی القیوم کە ئەوان تەفسیری دەکەن بەوەی لە جێی خۆی ناجوڵێ. دەڵێ: ئەم تەفسیرەت لێوەرناگیرێ ئیللا بە ئەثەرێکی صحیح نەبێ کە لە ڕەسول الله ﷺ هاتبێ، یاخود لە هەندێک صەحابەوە، یاخود لە تابعین، چونکە الحي القیوم واتە هەرشتێک ویستی لێبێ دەیکات، وە دەجوڵێ هەرکات ویستی لێبێ، وە بەرز دەبێتەوە هەرکات ویستی لێبێ، وە دەست دەگرێتەوە و دەکاتەوە و دەبەخشێ ، وە هەڵدەستێتەوە و دادەنیشێ هەرکات ویستی لێبێ.

لەبەرئەوەی نیشانەی نێوان زیندوو مردوو جوڵەیە، هەموو زیندوویەک دەجوڵێ وە هەموو مردوویەک ناجوڵێ ئەمە شتێکی بڕاوەیە، کێ هەیە لا بکاتەوە بە لای تەفسیری تۆ و هاوەڵەکەتدا لە بەرامبەر تەفسیری

پێغەمبەری ڕەحمە و ڕەسولی ڕەبی خاوەن عیزەت؟ کە ڕەسول الله تەفسیری نزولی کردووە بە وازحی بە نەصی ڕوون شەرحی کردووە، وە باسی کاتی نزولەکەشی کردووە کە کاتێکی دیاریکراوە، بە شێوەیەکی ڕوون باسی کردووە هیچ مەجال و گومانێکی نەهێشتووەتەوە بۆ تۆ و هاوەڵەکانت.

وأمَّا دَعواک أنَّ تفسير القيوم: الذي لا يَزول مِن مكانه، ولا يَتحَرَّک.

فلا يُقبَل مِنکَ هذا التفسير، إِلَّا بأثرٍ صحيح، مأثور عن رسول الله ﷺ، أو عن بعض أصحابه، أو التابعين، لِأَنَّ الحَيَّ القَيُّوم يفعلُ ما يشاء، ويَتَحَرَّک إِذا شاء، ويرتفع إِذا شاء، ويَقبِض ويَبسُط، ويقوم ويجلس إذا شاءَ.

لِأَنَّ أمارَة بَينَ الحَيِّ والمَيِّت التَحرُّک، كُلُّ حَيٍّ مُتَحَرِّک لا مَحَالَة، وَكُلُّ مَيِّتٍ غير مُتَحَرِّک لا مَحَالَة، ومَن يلتفِت إِلى تَفسيرِکَ، وتفسير صاحِبِک مع تفسير نَبِيِّ الرحمة ورسولِ رَبِّ الْعِزَّة؟ إِذ فَسَّرَ نُزولَه مشروحًا منصوصًا، ووَقَّتَ لِنُزولِه وقتًا مخصوصًا، لم يَدَع لک ولا لِأَصحابک فيه لَبسًا ولا عَويصًا.

نقض عثمان بن سعيد على المريسي ا صـ: ١٣٩

هەروەها ئەشعەری دەڵێ: صەحابە و سەلەف هەموو موتەفیقن کە الله ﷻ ڕازی دەبێ لەوانەی کە گوێڕایەڵی دەبن، وە ڕازی بوونی لێیان ئیرادەی اللە ـیە خۆشییان بداتێ، وە تەوبەکارانی خۆشدەوێ، وە تووڕەیە لە کافران، وە تووڕە بوونی لێیان ئیرادەیەتی بۆ سزا دانیان، وە هیچ شتێک ناتوانێ بەرامبەر عەزابەکەی بوەستێ.

وأَجمعوا على أَنَّه عَزَوَجَلَ يرضى عن الطائعين له، وأَنَّ رِضاه عنهم إِرادته لنعيمهم، وأَنَّه يحب التوابين، ويَسخَط على الكافرين، ويغضب عليهم، وأَنَّ غضبه إِرادته لعذابهم، وأَنَّه لا يقوم لغضبه شيء.

رسالة إِلى أَهل الثغر لأَبي الحسن الأَشعري ا صـ : ٨١

تەماشا بکەن بە تەئویلەکەیەوە وازناهێنێ درۆش بە دەم سەلەفەوە هەڵدەبەستێ گوایە بە ئیجماع لەسەر ئەوە بوون صیفاتی رِضا تەئویل کراوە بۆ ئیرادەی نعیم، وە السَخط تەئویل کراوە بۆ ئیرادەی عەزاب!

هەتا إبن المبرد ئیلزامی ئەشاعیرە دەکات و دەڵێ: باشە بۆچی ئەو قسانە ناکەن کە لە الإبانە هاتووە، ئەوانە بە لاتانەوە قەولی ئەشعەرین و لێوەی نقڵی دەکەن؟! ئەگەر وترا و ووتتان: قەولێکی تری هەیە غیری ئەوەی الإِبانە. ئەوە دەردەکەوێ ئەوەی لە الإِبانە وتوویەتی وەک تەقییە

بۆ پاراستنی گیانی خۆی وتوویەتی و تەمویهی حەقی کردووە، ئەمەش بەڵگەیە و حوجەیەکی وازحە لەسەر ئەوەی تەوبەی نەکردووە لە ئیعتزال.

فيقال للأَشاعرة: لِمَ لَمْ تقولوا بهذا الكلام الذي قد صَحَّ عندكم أَنَّه قوله وقد نقلتموه عنه؟! فإِن قيل: له كلام آخر. عُلِم أَنَّه إِنَّما أَظهر هذا تَقِيَّةً وَتَمْوِيهًا، وكان دليلًا وحُجَةً على عدم توبته.

جمع الجيوش والدساكر لابن المبْرد ا صـ: ١٣٠



# تەكفیرى ئەشعەرى و ئەشاعیرە

ئەشاعیرە هەرچەندە بەزەمەن دواى موعەطیلە یەكەمینەكان هاتن واتە موعتەزیلە و جەهمییەكان، بەڵام بە حەقیقى شوێن پێ هەڵگریانن لە ڕەتكردنەوەى صیفات، ئەوە حەقیقەتى ئەمرەكەیە بۆ ئەوانەى یەك تۆز ئینصافیان هەبێ، ئەمما موتەعەصیبینى ئەشاعیرە و موریدەكانیان ئەمە ناچێ بەگوێیاندا، هەر دەم دەكەنەوە دەڵێن: "كوا بۆمان بێنن سەلەف تەكفیرى ئەشاعیرەیان كردبێ؟."

ئاخر جاهلینە خودى ئەشعەرییەت لە سەلەفدا وجوودى نەبووە، چونكە خەلەفێك بەناوى أبو الحسن الأشعرى بناغە دانەرى ئەو عەقیدەیە بووە كە ساڵى (٣٢٤ یاخود ٣٣٠ یاخود ٣٣٦) هیجرى وەفاتى كردووە، ئێستا دەتانەوێ ئەقوالى ئیمامى مالك كوڕى أنس و محمد كوڕى إدريس الشافعى و أحمد كوڕى حنبل و إسحاق كوڕى إبراهيم الراهوية و عبيدالله كوڕى عبدالكريم الرازي و محمد كوڕى إدريس أبى حاتم الرازي و عثمان كوڕى سعيد الدارمي و عبدالله كوڕى أحمد كوڕى حنبل و حرب كوڕى إسماعيل الكرمانى بهێنین بۆتان لەسەر تەكفیر كردنیان! ئەمە چ مێشك و عەقڵێكە هەتانە؟!

هەروەک پێشتر وتمان ئەشاعیرە هەمان درێژە پێدەری عەقیدەی موعتەزیلە و جەهمییەکانن، وەک لە سەرەتای کتێبەکە بینیتان سەلەف بە ئیجماع جەهمییەکانیان تەکفیر کردووە، هەمان قەول و فەتوا دەچەسپێتە سەر ئەشعەرییەکان کە تەعطیلی صیفات دەکەن و نەفی علوی الله ﷻ دەکەن لەسەر عەرش، لێرە لەم بەشەدا پێم باشە تەکفیر کردنیان بهێنم لە لایەن عولەمایانی ئەهلی سوننەوە کە هاوسەردەم بوون لەگەڵیان.

**أبو إسماعیل الأنصاری الهروی** دەڵێ: لە أحمد کوڕی حمزە و أبا علی الحداد ـم بیست دەیانوت: أبا عباس النهاوندی ـمان بینی نەهی و ئینکاری دەکرد لە ئەهلی کەلام، وە تەکفیری ئەشاعیرەی دەکرد، هەروەها باسی ئەوەی کرد چەندە توند بووە لەسەر محمد کوڕی عمر أبو الفوارس القرمسيني هەجری کرد لەسەر ئەوەی ڕستەیەکی وتووە لە ئەقوالی ئەهلی کەلام.

قال الهروي: سمعت أَحمد بن حمزة، وأَبا علي الحَداد، يقولان: وجَدنا أَبا العباس أَحمد بن محمد النهاوندي على الإِنكار على أَهل الكلام، وتكفير الأَشاعرة، وذَكر أَعظم شَأنه في الإِنكار على أَبي الفوارس القَرمَسِيني، وهجرانه إِيَاه لحرف واحد.

ذم الكلام وأهله للهروي ا ١٢٨٥

**أبو إسماعيل الأنصارى الهروى** دەڵێ: له أحمد كوڕى حمزه ـم بيست دەيوت: كاتێک نێوانی النهاوندی و أبی الفوارس تێکچوو، پرسيار كرا له أبا عبدالله الدينورى، ووتی: گەيشتووم به هەزار شێخ لەسەر ئەوەن كه النهاوندی لەسەريەتی واته تەكفير كردنی ئەشاعيره.

وسمعت أحمد بن حمزة، يقول: لما اشتَدَّ الهجران بين النهاوندي، وأبي الفوارس، سألوا أبا عبدالله الدينَوَري، فقال: لقيت ألف شيخٍ على ما عليه النهاوندي.

ذم الكلام وأهله للهروي ا ١٢٨٦

أحمد بن محمد بن الفضل النهاوندى، ساڵی **(٣٩٤)** هيجری وەفاتی كردووە. **(١٠٠٠)** شێخ لەسەر هەمان عەقيدەی بوون واته تەكفيری ئەشاعيره، تۆ بڵێی ئەو هەمووە شێخەی ئەهلی سوننه لەسەر باتڵ بووبن و ئەشاعيره لەسەر حەق!

**أبو على الأهوازى** دەڵێ: بیستم أبا الحسن محمد کوڕی أحمد الشاهد له أهواز دەیوت: دوو کەس له موعتەزیله له دین دەرچوون و بوونه مولحید: إبن الراوندى و أبو الحسن الأشعرى.

قال أَبو علي الأهوازي: سمعت أَبا الحسن محمد بن أَحمد الشاهد بالأَهواز يقول: رجلان كانا من المعتزلة خرجا عن المذهب فألحَدَا، إِبن الراوندي، والأَشعري.

مثالب ابن أَبي البشر للأَهوازي ا صـ : ١٢

**أبو إسماعيل الأنصارى الهروى** دەڵێ: یحیی کوڕی عمار ـم چەندین جار بینیوه که ناژمێررێ لەسەر میمبەر تەکفیرى ئەشاعیرەى دەکرد و لەعنەتی لێدەکردن، وه شاهێدی دەدا که ئەشعەرى زەندیق بووه، عمر کوڕی إِبراهیم و شێخەکانیشمان به هەمان شێوه تەکفیریان دەکردن.

رأَيت يحيى بن عمار، ما لا أُحصي من مرة على منبره يُكفرهم ويلعنهم، ويشهد على أَبي الحسن الأَشعري بالزندقة، وكذالک عمر بن إِبراهيم ومشايخنا.

ذم الكلام وأَهله للهروي ا ١٣٠٥

يحيى كوڕی عمار كوڕی يحيى كوڕی عمار كوڕی العنبس السجستاني، ساڵی (٤٢٢) هیجری وەفاتی كردووە.

**إسماعيل كوڕی أحمد البشوزقانی** دەڵێ: بیستم جنيد كوڕی محمد أبا سعد الخطيب شاهێدی دەدا بەوەی كە ئەشعەری زەندیق بووە.

وسمعت إِسماعيل بن أَحمد البشوزقاني المتفقه يقول: سمعت الجنيد بن محمد أَبا سعد الخطيب، يشهد على الأَشعري بالزندقة.

ذم الكلام وأَهله للهروي ا ١٣٢٣

**أبو إسماعيل الأنصاری الهروی** دەڵێ: بیستم باوكم دەیوت: بیستم أبا المظفر ئیمامی ئەهلی ترمذ شاهێدی دەدا لەسەر ئەشاعیرە كە زەندیقن.

وسمعتُ أَبي، يقول: سمعتُ أَبا المظفر الترمذي -هو حِبَّال بن أَحمد- إِمام أَهل تِرمذ يشهد عليهم بالزندقة.

ذم الكلام وأَهله للهروي ا ١٢٩٦

**عمر كوڕی إبراهيم** دەڵێ: حەڵاڵ نییە سەربڕاوی دەستی ئەشاعیرە، لەبەرئەوەی موسڵمان نین، وە ئەهلی كیتابیش نین، وە كتێبی الله ﷻ كە قورئانە لەم سەر زەوییە سابت ناكەن باوەڕیان پێی نییە.

سمعت بلال بن أَبي منصور المؤَذن، يقول: سمعت عمر بن إِبراهيم، يقول: لا تَحِلُّ ذبائح الأَشعرية، لِأَنَّهُم ليسوا بمُسلمين، ولا بأَهل كتاب، ولا يثبتون في الأَرض كتاب الله.

ذم الكلام وأهله للهروي ا ١٣٠٨

**إبن الحنبلى** دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ شكاتى خۆى گەیاندووەتە الله ﷻ كە قەومەكەى قورئانیان هەجر كردووە: ﴿ وَقَالَ الرَّسُولُ يَا رَبِّ إِنَّ قَوْمِي اتَّخَذُوا هَذَا الْقُرآنَ مَهْجُورًا ﴾ الفرقان : ٣٠ ﴿ هَذَا ﴾ ئیشارەتە بۆ حازر و ئامادە كە بە گوێیەكانیان بیستوویانە، وە لە دڵەكانیشیان حفظیان كردووە، وە لە موصحەفەكانیان نوسیویانەتەوە، وە الله ﷻ لە پەنجا و ئەوەندە ئایەتتدا دەفەرموێ: ﴿ هَذَا الْقُرآنِ ﴾ ئیشارەت دەكات بۆ حازرى كافرانى قورەیش كە ئیثباتى وجوودى قورئانیان كردووە، وە بە موخالەفە كردنى هەجریان كردووە، بەڵام ئەمانە ئینكارى دەكەن و نەفى وجوودى دەكەن و شاهێد و گەیێنەران و هەڵگرانى بە درۆ دەخەنەوە، فإنا لله وإنا إليه راجعون لەو فیتنەیەى لە ئوممەتى ئیسلام دەركەوتووە،وە ئەم بەڵا و موصیبەتەى كە هەموو ئیسلام هەڵدەوەشێنێتەوە!

الرسول ﷺ أخبر الله تعالى عن نِيَاحَته بقوله: ﴿ وَقَالَ الرَّسُولُ يَا رَبِّ إِنَّ قَوْمِي اتَّخَذُوا هَذَا الْقُرْآنَ مَهْجُورًا ﴾ الفرقان : ٣٠ وهذا إِشارة إِلى حاضرٍ سمعوه بآذانهم، وحفظوه في قلوبهم، وكتبوه في مصاحفهم، والله يقول في القرآن في نيِّف وخمسين آية ﴿ هَذَا الْقُرْآنِ ﴾ إِشَارَة إِلَى حَضَارَةِ كُفار قريش، أثبتوا وجوده، وهجروه بالمخالفة، وهؤلاء جحدوه ونَفوا وجوده وكذَّبوا شهوده، فإنا لله وإنا إليه راجعون على ما ظهر في هذه المِلَّةِ الإِسلامية من هذه الفتنةِ، والبَلِيَّة المُبطلة لدين الإسلام بالكلية!

الرسالة الواضحة لابن الحنبلي ا صـ : ٤٨٥

**إبن الحنبلى** دەڵێ: بزانە برام اللە ئێمە و ئێوەش مۆفەق بکات ئەشاعیرە لە ڕەتکردنەوەی قورئان هەمان طەریقی باطنیە و ئەهلی ئیلحاد و زەندیقەکان دەگرنەبەر..... بە هەمان شێوەش ئەشعەری ئەگەر دەربارەی قورئان لێی بپرسی دەڵێ: کەلامی اللە ـیە، وە بەرز ڕای دەگرێ تا ئەو حەدەی دڵی جاهل موطمەئن ببێ بەو قەولەیان، وە ئەگەر پێشیان بڵێی: ئەوەی لە قاریئـ دەیبیستن، دەڵێ: ئەوە کەلامی قاریئەکەیە حەرف و صەوتە مەخلوقە. وە ئەگەر پرسیارکەر بڵێ: ئەی چیدەڵێی دەربارەی ئەوەی صەحابە لە ڕەسول اللە ﷺ بیستوویانە؟ دەڵێ: کەلامی ڕەسول اللە

ـيه بە حەرف و صەوتەوە. بەم ئیعتقادەش قەولی الله ﷻ پووچەڵ دەکەنەوە: ﴿ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَامَ اللَّهِ ﴾ وە قەولی ڕەسول الله ﷺ: « فَإِنَّ قُرَيْشًا مَنَعُونِي أَن أُبَلِغَ كَلَامَ رَبِّي ». وە موافەقەی قەولی ولید کوڕی المغیرە کردووە لەوەی پێی وابوو قورئان قەولی بەشەرە: ﴿ إِنْ هَٰذَا إِلَّا قَوْلُ الْبَشَرِ ﴾. وە ئەگەر پرسیاری لێبکەی دەربارەی موصحەف دەڵێ: ئەمە مورەکەب و وەرەقەیە مەخلوقە وەکو هەموو دروست کراوەکانی تر، بەمەش قەولی الله ﷻ پووچەڵ دەکەنەوە: ﴿ فِي كِتَابٍ مَكْنُونٍ ﴾ وە قەولی: ﴿ فِي لَوْحٍ مَّحْفُوظٍ ﴾، وە قەولی ڕەسول الله ﷺ: « لَا تُسَافِرُوا بِالْقُرآنِ إِلَى أَرْضِ الْعَدُوِّ مَخَافَةَ أَن تَنَالُه أَيْدِيهِم ». وە قەولی: « لَا يَمَسُّ الْقُرآنَ إِلَّا طَاهِرٌ ». بەم قسەیەیان بێ سوێند خواردنی خەڵکی بەو قورئانە لە مەسائیلی ماڵ و دەعوا کردن سوێند خواردنە بە مورەکەب و وەرەقە! خۆتان خۆش بن لە پرسەی دینی ئیسلامدا!!

واعلم يا أخي وفقنا الله وإِياك أَنَّ الأَشاعرة يسلَكون في إِبطال القرآن مَسلَكَ الباطنية في الإِلحاد والزندقَيِّة..... وكذالك الأَشعري إِذا قلت القرآن: قال كلام الله، وفَحَّمَ وعظَّمَ مقدار ما يطمئن الجاهل باعتقادهم

إِلى هذا القول، فإِذا قلت لهم: الذي نسمعه من القارئ، فيقول: هذا كلام القارئ حرف وصوت مخلوق. فيقول السائل: والذي سمعه الصحابة من رسول الله ﷺ، فيقول: كلام رسول الله حرفهُ وصوته. بطلَ بهذا القولِ والمعتقدِ قول الله تعالى: ﴿ فَأَجِرهُ حَتَى يَسْمَعَ كَلَامَ اللهِ ﴾، وقول الرسول ﷺ: « فَإِنَّ قُرّيْشًا مَنَعُونِي أَن أُبَلِغَ كَلَامَ رَبِّي ». ووافقَ قول الوليد ابن المغيرة: ﴿ إِنْ هَذَا إِلَّا قَوْلُ الْبَشَرِ ﴾. وإِن سألته عن المصحف المكتوب قال: هذا حِبرٌ وورقٌ، لَه أُسوَة سائرِ الأَجسام. بَطَلَ بهذا قوله في كتاب الله تعالى: ﴿ فِي كِتَابٍ مَكْنُونٍ ﴾، وقوله: ﴿فِي لَوْحٍ مَّحْفُوظٍ ﴾، وقول الرسول ﷺ: « لَا تُسَافِروا بِالْقُرآنِ إِلَى أَرّضِ الْعَدُوِّ مَخَافَةَ أَن تَنَالُه أَيْدِيهِم ». وقوله: « لَا يَمَّسُّ الْقُرآنَ إِلَّا طَاهِرٌ ». وصَار حِلفانُ النَّاس على الأَموالِ والدَّعاوى بالحبرِ والورقِ، فأَحسنَ الله عُزَاءكم في دين الإِسلام!

الرسالة الواضحة لابن الحنبلي ا صـ: ٤٨٦-٤٩٠

**إبن عقيل** دەڵێ: ئەگەر وتیان: الله ئیشارەتی بۆ حیکایەتی ئەوە کردووە لە نەفسیدایە وە عیبارەتەکەی ئەوەیە بە زمان دەخوێندرێتەوە و لە دڵەکاندا حفظ بووە و لە موصحەفەکاندا نوسراوە، ئەمما پێتان وابێ ئەو ئیشارەتە بۆ قورئانە کە صیفاتێکی زاتی اللە ـیە ﷻ ئەوە نەخێر وا

نییه. پێیان دەڵێین: ئەمجار لە جاری یەکەم کوفرەکەتان قورستر و خراپترە، چونکە حیکایە واتە هاوشێوە و نمونەی وەک ئەو، ئێوە کە دەڵێن قورئان کەلامێکی نەفسییە ئەوەی دەیخوێنینەوە حیکایەتی ئەو قورئانەیە! ئەوە ئەو شوبهاندنەی لێی ڕادەکەن و خۆتانی لێبەری دەکەن تێی کەوتوون هەرچەندە خۆشتان بە گەورەتر و لە پێشتر دابنێن بەسەر ئەهلی حدیثدا وە بەو درۆ و فێڵ و چەواشەکارییەی ئەنجامی دەدەن بۆ داپۆشینی باتڵەکەتان و بە حەق نیشاندانی بە خەڵکی، ئەگەریش بڵێن الله تعالی لە نەفسیدا صیفەتێک هەیە دەتوانین و بۆمان هەیە وەک حیکایەتێک دەری ببڕین ئەویش تیلاوەکەمانە وە دەتوانین وەک ئەوەی نەفسی الله بهێنین کە قیرائەکەمانە، ئەوە بێگومان بە صەڕیحی دانتان ناوە بەوەدا کە وەصفی الله تعالی حیکایەت و گێڕانەوەی ئەو کەلامە نەفسییەیە نەک قورئان سەربەخۆ کەلامی الله بێ، بەمەش کەوتوونەتە ئەو تەشبیهەی کە خۆتانی لێبەری دەکەن و لێی ڕادەکەن، چونکە ئەگەر ئەو تیلاوەیە هاوشێوەی کەلامەکەی الله بێ ئەوە خەڵکی دەیانتوانی وەک ئەو کەلامە بهێنن مادام ئەو قورئانەی هەیە حیکایەتبێ لە کەلامی الله ئیتر کوا عەجز و بێ دەسەڵاتییان؟ لەبەرئەوەی کەلامی الله ﷻ بە لای ئەوانەوە نەحەرفە نەصەوت ئیتر چۆن دەکرێ هاوشێوەکەی حەرف

و صەوت بیٚ؟! وە ئایا ئەم قسەیان هەروەکو ئەوە نییە کەسێک بڵێ عیلمی ئێمە وەک عیلمی الله ﷻ وایە، وە بیستن و چاومان حیکایە و هاوشێوەی بیستنی الله و چاوی الله ـیە، خەڵکیتان خەڵەتاندوو حەقتان لێشاردنەوە واتان نیشانیاندا کە ئەهلی سوننەن! ئای چەندە دوورن لە ئەهلی سوننە و هەڵگری ئەو ناوەبن ئێوە نەصی قورئان بە درۆ دەخەنەوە لە کاتێکدا الله ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَكَلَّمَ اللَّهُ مُوسَى تَكْلِيمًا ﴾ النساء : ١٦٤ ﴿وَإِذْ نَادَى رَبُّكَ مُوسَى ﴾ الشعراء : ١٠ ﴿ وَنَادَيْنَاهُ مِن جَانِبِ الطُّورِ الْأَيْمَنِ وَقَرَّبْنَاهُ نَجِيًّا ﴾ مريم : ٥٢

فإِن قالوا: إِنما أَشار إِلى حكاية ما في نفسه وعبارته وهو هذا المتلو بالأَلسن المحفوظ في الصدور المكتوب في المصاحف، فأَما أَن تشيروا إِلى ما في ذاته فلا. قلنا لهم: أَنتم أَكفر وأَغلظ منكم في الأَول لأَن الحكاية هي المثال والشبه والنظير فإِن تنصلكم هو التشبيه وإِن ذراكم على أَصحاب الحديث بالكذب والتمويه وإِذا قلتم لله تعالى في نفسه صفة نعقل حكايتها وهي تلاوتنا ونأتي بمثلها وهي قراءتنا فقد صرحتم بأَن وصف الله تعالى تحكية ووقعتم فيما تنصلتم منه مِن التشبيه، ولأَن هذه التلاوات لو كانت حكايات لكان الناس قد أَتوا بمثل كلام الله تعالى

فأين عجزهم؟ ولأَن كلام الله تعالى عندهم ليس بحرف ولا صوت فكيف حكايته حرفً وصوتًا. وهل هذه الحكاية إِلا بمثابة من قال إِن علومنا كعلم الله وسمعنا وبصرنا حكاية سمع الله وبصره وإِن كان سمعه ليس بحاسة وأَسماعنا حاسة، وموهتم على الناس أَنكم مِن أَهل السنة! وما أَبعدكم مِن هذه التسمية مع تكذيبكم بنص القرآن والله تعالى يقول: ﴿وَكَلَّمَ اللَّهُ مُوسَى تَكْلِيمًا ﴾ النساء : ١٦٤ ﴿ وَإِذْ نَادَى رَبُّكَ مُوسَى ﴾ الشعراء : ١٠ ﴿ وَنَادَيْنَاهُ مِن جَانِبِ الطُّورِ الْأَيْمَنِ وَقَرَّبْنَاهُ نَجِيًّا ﴾ مريم : ٥٢ مسألة القرآن لابن عقيل ا صـ : ٥٢

**إبن قدامه** دەڵێ: سەیرییەکەی لەوەدایە ناوێرن قەولی خۆیان دەرخەن، دەعوای بۆ بکەن ئیللا لە چۆڵەوانی و مەجلسی خۆیاندا نەبێ، خۆ ئەگەر کاربەدەستی دەوڵەت و وەلی ئەمر بوونایە ئەو قسانەی خۆیانت بگێڕابایەوە پێیان ناخۆش دەبوو، وە ئینکارییان دەکرد شتی وایان وتبێ، لە غیری بە گەورە ڕاگرتن و تەماشا کردنی قورئان و موصحەفەکان هیچی تر نیشان نادەن، وە کاتێک دەیبینن لەبەری هەڵدەستنەوە، بەڵام کاتێک تەنیان دەڵێن: ئەوەی لە ناو موصحەفدایە

تەنها وەرەقە و مورەکەبە غیری ئەوە هیچی تر نییە و چی تێدایە؟ ئەمە کردەوەی زەنادقەیە.

قال إِبن قدامة: ومِنَ العجب أَنَّهم لا يتجاسرون إِظهار قولهم، ولا التصريح به إِلا في الخَلَوات، ولَو أَنَّهم ولاة الأُمور وأَرباب الدولة، إِذا حكيتَ عنهم مقالتهم التي يعتقدونها كرهوا ذالک وأَنكروه، وكابروا عليه، ولا يتظاهرون إِلا بتعظيم القرآن، وتبجيل المصاحف، والقيام لها عند رؤيتها، وفي الخلوات يقولون: ما فيها إِلا الورَّق والمداد، وأَي شيء فيها؟ وهذا فعل الزنادقة.

المناظرة في القرآن لابن قدامة | صـ : ٣٤

ووتم: قەولی إبن قدامە کە دەڵێ: "لە خەلەوات و چۆڵیدا نەبێ عەقیدەی خۆیان دەرناخەن" ئەشاعیرەی ئەوکات وابوون لە ترسی ئەهلی سوننە سڵیان کردووەتەوە نەیان توانیوە بە ئاشکرا کوفرەکانیان دەربخەن، ئەمما ئەشاعیرەی ئەم سەردەمە ئەو شانازی بە زەندیقیەتی خۆیانەوە دەکەن، لە چاو ئەشاعیرەی پێشوو بە حەوت ئاو شۆرراونەتەوە.

هەروەها دەڵێ: هەرکەسێک پێی وابێ ئەم کتێبە قورئان نییە، کەلامی مەخلوقینە، وە قورئان کەلامێکی نەفسییە لە نەفسی الله ـدایە دانابەزێ و ناخوێنرێتەوە، وە نابیسترێ و ناخوێنرێتەوە، وە سوودی نییە، ئەوەڵ و ئاخیری نییە، جوزئـ و هەندێکی نییە، نەسورەتە نەئایەت و نەحەرف و نەکەلیمات، ئەمە زەندیقێکە ڕەدی ڕەب العالمین دەداتەوە، وە ڕەدی ڕەسولەکەی الصادق الأمینی داوەتەوە، موخالەفەی هەموو موسڵمانانی کردووە، هەڵدێراوە لە ڕێگەی ڕاست.

ومَن زعم أَنَّ هذا الكتاب غير القرآن، وأَنه كلام المخلوقين، وأَنَّ القرآن معنى في النَّفْس لا يُنزَل ولا يقرأ، ولا يُسمَع ولا يُتلى، ولا ينفع، ولا له أَول ولا آخر، ولا جزء ولا بعض، ولا هو سُوَر ولا آيات ولا حروف، ولا كلمات، فهذا زنديق راد على رب العالمين، وعلى رسوله الصادق الأمين، مخالف لجميع المسلمين، ناكب عن طريق المستقيم.

رسالة في القرآن كلام الله لابن قدامة | صـ: ٣٥



## جەهمی بوونی ئەشعەری لە ئیماندا

أبو الحسن الأشعری سەرباری ئەوەی تەئویلی صیفاتی کردووە لە سەردەمی موعتەزیلە بوونی و دوای ئەو سەردەمەش، لەگەڵ ئەوەشدا لە ئیماندا جەهمی بووە پێی وابووە ئیمان تەنها پێکهاتووە لە تەصدیقی قەلب، قەول و عەمەل ڕوکنی ئیمان نین! ئەمە عەقیدەی جهم کوڕی صفوان ـە.

أبي الفتح محمد بن عبدالكريم الشهرستاني، کە ساڵی **(٥٤٨)** هیجری وەفاتی کردووە، ئەشعەری عەقیدە بووە دەڵێ: ئەشعەری دەڵێ: ئیمان پێکهاتووە لە نییەتی دڵ، بە دڵ الله بناسە، ئەمما قەول و ووتنی زمان لەگەڵ عەمەلی جەستە ئەوە فروعی ئیمانە نەک ئەصڵی ئیمان بێ، هەرکەسێک بە دڵ باوەڕی بە تەنهایی الله تعالی هەبێ، وە بە دڵ ئیعتراف بە ڕاستی پەیامی پێغەمبەران بکات کە لای الله تعالی هێناویانە ئەوە ئیمانەکەی دروستە، هەتا ئەگەر لەسەر ئەم عەقیدەیە بمرێ ئەوە ئیماندارە و لە ئاگر ڕزگاری بووە، وە ئینسان لە بازنەی ئیمان ناچێتە دەرەوە ئیللا بە ئینکارکردنی نەبێ.

قال الأَشعري: الإِيمان هو التصديق بالجِنان، أَمَّا القول باللسان والعمل بالأَركان ففروعه، فمن صدق بالقلب، أَي أَقَّر بوحدانية الله تعالى،

واعترف بالرسل تصديقًا لهم فيما جاءوا به من عند الله تعالى بالقلب صَحَّ إِيمانه، حتى لو مات عليه في الحال كان مؤمنًا ناجيًا، ولا يخرج من الإِيمان إِلا بإِنكار ذالک شيء من ذالک.

المِلَل والنِّحَل للشهرستاني ا صـ: ١١٩

ووتم: ئەمە ڕێک مەحضی جەهمییەتە کە ئیمان بەس تەصدیقی دڵە، بەس ئینکاری ئوصولی عەقیدە و واجبات و ئەمر و نەهی ئینسان پێی لە دین دەردەچێ! واتە کەسێک بە باوەڕی بە زاتی الله ﷻ هەبێ، وە باوەڕیشی بە ڕەسول الله ﷺ هەبێ، دواتر عەمەل ئەنجام نەدات باوەڕی بە عەمەل هەبێ ئیماندارە و ئەهلی بەهەشتە، کاتێک کافر دەبێ کە ئینکاری بکات لە فەڕزییەتی شەعائر ئەنا با ئەنجامیشیان نەدا مادام ئینکاریان ناکات ئیماندارە!

**زاهر کوڕی أحمد** دەڵێ: پرسیارم کرد لە ئەشعەری دەربارەی الله ﷻ؟ ووتی: ئەو زاتەیە کە خەڵکی ڕووی تێدەکەن و دەیپەرستن، هەر شتێک عیبادەتی بۆ بکەی ئەوە الله ـیە!.

قال الهروي: سمعت محمد بن الفضل الطاقي، يقول: سمعت زاهر بن أَحمد، يقول: سأَلتُ الأَشعري عن الله ﷻ؟ فقال: هو الذي يُتَأَلَّهُ إِليه، فكُل من تأَلهت إِليه فهو الله!.

ذم الكلام وأَهله للهروي | ١٢٦٦

ووتم: لازمی قسەی ئەشعەری ئەوەیە هەرکەسێک هەرچی پەرست ئەوە الله ـیە، بەم جۆرە صەنەمەکان لای زۆرێک دەپەرسترێن و غیری صەنەمیش ئەو هەمووە پەروەردگارە ساختانە الله ـن!

خۆ ئەگەر کەسێک هات ووتی: حەتمەن ئەو قسانەی هی سەردەمی موعتەزیلە بوونیەتی، دواتر وازی هێناوە لێیان ئەوە عەقیدەیەی نەبووە؟

دەڵێم: نەخێر، ئەو دەعوایەتان باتڵە، چونکە قەولێکی ئەشعەری هەیە لە کۆتا ڕۆژەکانی تەمەنیدا وتوویەتی نەک کۆتا ڕۆژەکان بگرە لە کۆتا سەعاتەکانی تەمەنیدا وتوویەتی و لەسەری مردووە، پێی وایە خیلافی نێوان فیرقەکان خیلافێکی لەفظییە نەک عەقیدەیی هەموویان بە موسڵمان دەزانێ و تەکفیریان ناکات! ئێ ئەمە پشت ڕاستی ئەو دوو قەولەی پێشوو دەکاتەوە کە عەقیدەکەی عەقیدەی جەهمی کوڕی صفوان بووە، دائمەن قەولی کۆتایی کەسەکان وەردەگیرێ ئەوەی کە لەسەری مردوون.

**الذهبي** دەڵێ: ووتەیەکی أبو الحسن الأشعري ــ م بینی پێی سەرسام بووم، ئەم ووتەیەش بە صەحیحی لێوەی سابت بووە البیهقي ڕیوایەتی کردووە دەڵێ: بیستم أبو حازم العبدوي دەیووت: بیستم زاهر بن أحمد السرخسي دەیووت: کاتێك مەرگی أبو الحسن الأشعري نزیک بوویەوە لە ماڵەکەمدا لە بەغداد، بانگی کردم منیش چووم بۆ لای ووتی: شایەتی بدە لەسەرم کە من هیچ کەسێک لە ئەهلی قیبلە تەکفیر ناکەم، چونکە هەموویان ئاماژە بۆ یەک پەرستراو دەکەن، ئەو خیلافەش کە هەیە هەمووی خیلافی لەفظییە.

رأَيت للأَشعري كلمة أَعجبتني وهي ثابتة رواها البيهقي، سمعت أَبا حازم العبدوي، سمعت زاهر بن أَحمد السرخسي يقول: لمَّا قَرُوبَ حضور أَجل أَبي الحسن الأَشعري في داري ببغداد، دعاني فأَتيته، فقال: اشهد علَيَّ أَني لا أُكَفِّر أَحدًا مِن أَهل القبلة، لأَنَّ الكُلَّ يُشيرون إِلى معبود واحد، وإِنما هذا كله اختلاف العبارات.

سير أَعلام النبلاء للذهبي | **(٨٨/١٥)**

ئەشعەری دەڵێ: مادام دروستکەر بە حەقیقی اللە تعالی بێ، وە هیچ کەسێک لە مەخلوقات شەریکی نەبێ، کەواتە خالق ئەوەیە توانا و دەسەڵاتی هەبێ لەسەر داهێنان و دروست کردن .

وە لە مەزهەبی ئەشعەری هەر شتێک وجوودی هەبێ ڕاست وایە ببینرێ، ئەوەی بینین پشت ڕاست دەکاتەوە بوون و وجوودە، وە اللە تعالی مەوجوودە، بۆیە ڕاست ئەوەیە دەبینرێ، بەڵام نابێ پێت وابێ ئەوە بینینە لە جهە و شوێن و مەکانێک بێ، وە صورە و شێوازی ببینرێ، وە ڕووبەڕوو ببینرێ، ئەمە هەمووی ئەستەمە و ناگونجێ.

قال الأَشعري: إذا كان الخالق على الحقيقة هو الباري تعالى، لا يشاركه في الخلق غيره، فأخصه تعالى هو: القدرة على الإختراع .

ومِن مذهب الأَشعري أَن كُل موجود فيصح أَن يُرى، فإن المصحح للرؤية إنما هو موجود والباري تعالى موجود، فيصح أَن يُرى، ولا يجوز أَن تتعلق به الرؤيه على جهة، ومكان، وصورة، ومقابلة، واتصال الشعاع، أَو على سبيل انطباع، فإن كُل ذالک مستحيل.

المِلَل والنِّحَل للشهرستاني ا صـ ١١٨

ئەمەش هەر قەولی جهم کوڕی صفوان ـە کە خالق بە لایەوە ئەوەیە توانای دروست کردنی هەبێ، واتە لە ناسینی الله ـدا تەفسیری ڕبوبیە دەکەن نەک ئولوهیەت! بێجگە لەم خاڵەش دووبارە لە مەسئەلەی بینین تەفسیری جەهمییەکان دەهێنێ وەک دەبینن پێی وایە هەرچەندە الله بشبینرێ، بەڵام نەفی جهە و مەکان و صورە دەکات و بە موستەحیلی دەزانێ لە جێگایەک کە بەهەشتە ڕووبەڕوو الله ﷻ ببینرێ!

**أبا زيد المروزى** دەڵێ: چووم بۆ لای أبا الحسن الأشعرى لە بەصرە، هەندێک بابەتی کەلامیم لێوەی وەرگرت و فێر بووم، شەوەکەی لە خەومدا کوێر ببووم، ئەم خەوەم بۆ کەسێکی شارەزا گێڕایەوە، ووتی: تۆ عیلمێک فێر دەبی و وەردەگری بە هۆیەوە گومڕا دەبی. ئیتر وازم هێنا نەچوومەوە بۆ لای ئەشعەری، هەتا ڕۆژێک لە ڕێگادا بینیمی، ووتی: ئەی أبا زيد دەتەوێ بچیتەوە بۆ خۆراسان شارەزابی بە فروع فيقه، جاهلبی بە ئوصول عەقیدە؟! ئیتر خەوەکەم بۆ گێڕایەوە، ووتی: تکایە لێرە بۆ کەسی مەگێڕەوە و باسی مەکە.

وكَتَبَ به إِلَيَّ: أَحمد بن الفضلِ البُخاري أَبو الحسن، قال: سمعت أَبا زيد الفقيه المروزِي، يقول: أَتَيتُ أَبا الحسن الأَشعري بالبصرة، فأَخذتُ

عنه شيئًا مِنَ الكلام، فرأيتُ مِن لَيلتي في المَنَام كَأَني عَمِيتُ، فَقَصَصتُها على المُعَبِّر، فقال إِنَّكَ تَأَخُذ عِلمًا، تَضِّلُ به. فَأَمسَكتُ عَن الأَشعري، فَرَآني بعد يومًا في الطريق، فقال لي: يا أَبا زَيدٍ، أَما تَأَنَف أَن ترجع إِلى خُراسان عالمًا بالفروع، جَاهلًا بِالأُصول؟! فَقَصَصتُ عَليه الرؤيا، فقال: اكتُمها عَلَيَّ ها هُنَا.

ذم الكلام وأهله للهروي ا ١٢٦٢

ووتم: تەماشاکەن ئەشعەری ترساوە ئەو خەوە بکەوێتە دەمی ئەهلی بەصرە، چونکە فەزح دەبوو ئەوانەی لە دەوری بوون نەدەمان و جێیان دەهێلا، خالێکی تر ئەوەیە تەعطیلی صیفات بە ئەصڵ و عەقیدە دەزانێ دەیبینن چۆن داوا لە أبا زید دەکات بگەڕێتەوە بۆ لای هەتا فێری کەلامی بکات!

عیلم و شارەزایی ئەشعەری بەس عیلمی کەلامی موعتەزیلە و پەکخستنی صیفاتە، ئەما تەوحید و فقهی فوقەها و عیلمەکانی تر ئەوە شارەزایی نەبووە.

**إبن تيميه** دەڵێ: ئەشعەری و شوێنکەوتەکانیشی لە کێبەکانیاندا نابینی ڕبوبیەتی الله و زیندوو بوونەوە سابت بکەن، ئەوانەشی شوێنیان

کەوتوون بە هەمان شێوەن، وەک قاضی أبی یعلی و إبن عقیل و إبن الزاغونی و غیری ئەوانیش.

قال إِبن تيمية: والأَشعري نفسه وأَتباعه، ليس في كتبهم إِثبات الربوبية ولا المعاد، وكذالک من سلک سبيلهم في أَدلتهم مِن أَتباع الفقهاء، كالقاضي أَبي يعلى، وابن عقيل، وابن الزاغوني وغيرهم.

كتاب النبوات لابن تيمية | صـ : ١٦٥

**إبن المبرد** دەڵێ: کوانێ ئەقوالی ئەشعەری لە دیندا؟ کامەیە ووتەی دەربارەی طهارە پاکو خاوێنی، نوێژ، ڕۆژوو، حەج، نیکاح، کڕین و فرۆشتن؟ ئەمە شتێکە هیچ کەسێک قەت نەیبینیوە، ووتەی ئەو تەنها عیلمی کەلامە و عەقیدەی موعتەزیلەیە، إِنا لله وإِنا إِليه راجعون، چۆن دەکرێ کەسانێک کە خۆیان بە ئەهلی عیلم دەزانن بە ڕەوای دەبینن کەسێک بە ئیمام بزانن لە کاتێکدا لە هەموو ژیانیدا ووتەیەکی نییە لە بابەتەکانی پاکو خاوێنی، نوێژ، ڕۆژوو، حەج؟!

قال إِبن المبْرد: أَين أَقوال الأَشعري في الدين؟ أَين كلامه في الطهارة، والصلاة، والصوم، والحج، والبيع والنكاح؟ هذا أَمر لم يره أَحد قَطّ، إِنما

كلامه في علم الكلام فقط، فإِنا لله وإِنا إِليه راجعون، كيف يَحِلُّ لمن يُنسب إِلى العلم أَن يجعل من لم يُعرف له كلام في مسأَلة قط من أَئمة الدين؟!

جمع الجيوش والدساكر لابن المبْرد ا صـ: ٧٠



## لەعنی ئەشاعیرە لە لایەن ئەهلی سوننەوە

لە سەردەمانی پێشوو کاتی عیزەتی ئەهلی سوننە هیچ گرووپێکی گومڕا و موعەطیڵە وەک جەهمییە و موعتەزیلە و ئەشاعیرە نەیانتوانیوە سەر دەربێنن، چونکە ئیمامەکانی ئەهلی سوننە بە بەڵگە دەمیان داخستوون و زەلیلیان کردوون، هەرکەسێکیشیان ڕەئیس و دەعوەکار بووبێ ئەوە لە ملی دراوە و هەڵواسراوە وەک: غیلان الدمشقی و معبد الجهنی و جعد کوڕی درهم و جهم کوڕی صفوان، ئەمما دوای لاوازبوونی ئەهلی سوننە و نامۆ بوونی دین لە سەدەکانی دواتر وورده وورده ئەشاعیرە دەستیان دایە ڕشتنی ژەهرەکەیان، هەتا زەمانە گەشتە ئەم عەصرەی ئێستا دەبینی هەرچی ئەتباعی جەهمی کوڕی صفوان هەیە کراونەتە ئیمام لێمان! لە کاتێکدا سەلەف و ئەهلی سوننە لە قەدیم و خەلەف لەعنەتیان لێدەکردن.

**أبو إسماعيل الأنصاری الهروی** دەڵێ: لە أحمد کوڕی رافع و غیری ئەویشم بیست باسی توندی أبو حامد ـیان دەکرد بەرامبەر أبو بکر الباقلانی، ووتی: من نامەکەی سعید ـم گەیاندە سالمی کوڕی کە لە بەغداد بوو تیایدا نوسیبووی: ئەگەر بە نیازیت بگەڕێیتەوە شاری هرات، ئەوە نزیکی باقلانی مەکەوەرەوە.

قال الهروي: سمعت أَحمد بن أَبي رافع وخلقًا، يذكرون شِدَّةَ أبي حامد على الباقلاني! قال: وأَنا بلغت رسالة سعيد إِلى إِبنه سالم ببغداد: إِن كُنت تريد أَن ترجع إلى هراة فلا تقرب الباقلاني.

ذم الكلام وأَهله للهروي ا ١٢٩٥

ووتم: أبو حامد أحمد بن أبي طاهر الإسفراييني شێخی ئەهلی سوننه بووه له بەغداد، توند بووه لەسەر ئەشاعیره و باقلانی ئیمامیان، هەمیشه دژی عەقیده باتڵەکەیان وەستاوەتەوە، وە هرات شارێکه له ئەفغانستان.

**حسن کوڕی أبی أسامه** دەڵێ: بیستم باوکم دەیوت: لەعنەتی الله له أبو ذر بێ، ئەو یەکەم کەس بوو عەقیدەی ئەهلی کەلامی هێنایه حەرەمی مەککە، وە یەکەم کەسیش بوو بڵاوی کردەوە لە ناو ئەهلی مەغریبدا.

سمعتُ الحسن بن أَبي أُسامة المَكي، يقول: سمعتُ أَبي، يقول: لَعَنَ اللهُ أَبا ذَرٍّ، فإِنَّه أَوَّل من حمل الكلام إِلى الحرم، وأَوَّل مَن بَثَّه في المَغارِبة.

ذم الكلام وأَهله للهروي ا ١٣٠٦

**أبو إسماعيل الأنصارى الهروى** دەڵێ: لە چەندین کەسم بیست دەیانگێڕایەوە کە ئامادەبوون ئەو ڕۆژەی إبن فورک بەرد باران کراو لەناو مزگەوتی گەورەی شاری هرات کراوەتە دەرەوە.

قال الهروي: وسمعت غير واحد يحكي أَنَّه حضر يوم حُصِبَ ابن فورک، وأُخرِجَ من جامع هراة.

ذم الكلام وأهله للهروي ا ١٣٢٥

**أبو إسماعيل الأنصارى الهروى** دەڵێ: بیستم أحمد کوڕی حمزە دەیووت: لە شاری طبرستان مەجلسێک بەسترا بۆ شەخصێک، ئەویش لەسەر میمبەری مزگەوت دانیشت، پرسیاریان لێکرد دەربارەی حەرفەکانی قورئان؟ ئەویش ڕەتیکردەوە قورئان پێکهاتبێ لە حەرف. بە مسحاة لێیدراو کوشتیان.

وسمعت أحمد بن حمزة، يقول: عُقِدَ لِواحِدٍ في طبرستان مجلس، فَقَعَدَ على المنبر، فَسَأَلوه عن حروف القرآن؟ فَأَنكرها، فَضُرِبَ بِمِسحَاةٍ فَقُتِلَ.

ذم الكلام وأهله للهروي ا ١٣٢١

ووتم: مسحاة بەو ئەداتە دەوترێ کە بۆ زەوی هەڵکەندن بەکاردێ وەک خاکەناز یان هەرشتێکی تر هەمان ئیشی پێبکرێ.

هەروەها دەڵێ: گوێم لێبوو أحمد کوڕی حسن الخاموشی لە ماڵەکەی خۆیدا لە الرَّيِّ لە ناو جەمعێکی زۆری خەڵکی لەعنەتی دەکرد لە ئەشاعیرە، وەصفی حەنابلەی دەکرد، ئەم ڕووداوە لەو ساڵەدا بوو چووین بۆ حەج.

وسمعت أَحمد بن الحسن الخَاموشيَّ الفقيه الرازي في داره بالرَّيِّ في مَحفِلٍ، يَلعَنُ الأَشعرية، ويُطريَ الحنابلة، وذالک سنة خَرَجنَا مع الحَاجِّ.

ذم الكلام وأهله للهروي ا ١٣٢٧

أبو إسماعيل الأنصاری الهروی دەڵێ: من نامەو نوسراوی ئەمیر محمود سبکتکین ــ م خوێندووەتەوە کە تیایدا جەخت دەکاتەوە لەسەر کەشف کردن و هەڵماڵینی عەقیدەی جەهمییە و ئەشاعیرە و کولابییەکان، کە ئەبێ فەزح بکرێن عەیب و عارەکانیان بۆ خەڵکی بخرێتە ڕوو لەعنەتیان لێبکرێ، هەتا تیایدا دەڵێ: من لەعنەت لەو کەسانەش دەکەم کە لەعنەت ناکەن لەو طائفانە! واللە ئەو نوسراوەی لە هەموو شارەکاندا بڵاو بوویەوە و خەڵکی ستایشیان دەکرد لەسەری، لە نێوان هەموو

ستایش كراوەكاندا دەنگی دایەوە و باس دەكرا، هەر عاقڵێكت دەدی وەصفی دەكرد لەسەر ئەو قسانەی و ستایشی توند و تۆڵی دینەكەیان دەكرد، وەصفیشیان دەكرد بەوەی ئازاو خاوەن شەهامەتە و خاوەنی بیرو ڕەئییێكی بەهێزە...

قال الهروي: وقرأت كتاب محمود الأَمير: يَحُثُ فيه على كشف أَستار هذه الطائفة، والإِفضاح بعيبهم ولعنهم، حتى كان قد قال فيه: أَنا أَلعن من لا يلعنهم! فطارَ والله في الآفاق للحامدين كُل مَطَارٍ، وسارَ في المادحين كُل مَسَارٍ، لا ترى عاقلاً إلا وهو ينسبهُ إِلى مَتَانَةِ الدِّين، وصلابته، ويصفه بشهامة الرأي ونجابته...

ذم الكلام وأَهله للهروي ا ١٣٤٠

ئێمەش وەک سوڵتان محمود سبكتكين الغزنوي دەڵێین: لەعنەتی الله لە ئەشاعیرە بێ، لەعنەتی الله لەوانەش بێ كە لەعنەتیان لێناكەن.

لەوەش زیاتر پێیان باش نەبووە ئەهلی سوننە لە مزگەوتێک كۆببنەوە كە مەكانی ئەشاعیرە بووبێ.

**أحمد كوڕی أبی النصر المالينی** دەڵێ: له میصر لەگەڵ هەندێک هاوڕێم چوومە مزگەوتی عمرو کوڕی العاص، کاتێک دانیشتین شێخێک هات، ووتی: ئێوەی خەڵکی خۆراسان ئەهلی سوننەن، ئەم مزگەوتە شوێنی ئەشاعیرەیە، هەستن جێی بهێڵن.

سمعت أَحمد بن أَبي نَصر المالينيَّ، يقول: دخلت جامع عمرو بن العاص رضي الله عنه بمِصرَ، في نَفرٍ مِن أَصحابي، فلما جلسنا، جاء شيخ، فقال: أَنتم أَهل خُراسان أَهل سنة، وهذا موضع الأَشْعرية، فقوموا.

ذم الكلام وأَهله للهروي | ١٣٢٢

ووتم: ئەهلی سوننە بەو جۆرە بوون دژی ئەشاعیرە لە کۆڕ و مەجلیس لەعنەتیان لێکردوون، بەرد بارانیان کردوون، لێیانداون و کوشتوونیان، کەچی ئێستا هەر ئەو عەقیدە ئەشعەرییانە لای خەڵکی بوونەتە شێخ و ئیمام و عەللامە و پیاو چاک و وەلی!



## ئەشعەری و ئەشاعیرە لە زاری إبن تیمیەوە

پێشتر ڕوونمان کردەوە ئەشعەری کێ بووە و خاوەنی چ عەقیدەیەک بووە، وە بە پێی قورئان و حدیث و قەولی عولەمایانی ئەهلی سوننە ڕەدمان دایەوە، بەڵام هەندێک کەس ئەقوالی موتەئەخرین بە لایانەوە لە پێشترە، پێیان وایە دەبێ بە کەلامی موتەئەخرین شەرحی کەلامی سەلەف بکرێ و هەڵسەنگێنرێ! هەربۆیە دەبینی لە بابەتی ئەشعەری و ئەشاعیرەدا داوای قەولی إبن تیمیە دەکەن وا دەزانن بەو جۆرە دەتوانن ئەشعەری و ئەشاعیرە لە تەکفیر دەرباز بکەن، نازانن لازمی قەولی إبن تیمیە ـش ئەشعەری و ئەشاعیرە هەر تەکفیر کراون.

سەرەتا ئەوە بزانن إِبن تیمیە لە عەقیدەدا بە دیاری کراوی مەسائیلی صیفات شوێن سەلەف کەوتووە، هەرکەس کتێبەکانی بخوێنێتەوە ئەمە بەدی دەکات، بەڵام کاتێک دێتە سەر دابەزاندنی حوکم بەسەر ئەهلی تەعطیل و ئەشاعیرە، ئەوە بە ئاشکرا موخالەفەی هەموو سەلەف و ئیجماعی سەلەف دەکات، هەرکەس موتابەعەی کتێبەکانی نەکردبێ هەست بەم ڕاستییە ناکات.

قسەکانی دەربارەیان دژ بە یەکن و تووشی تەناقوزێکی خراپ بووە، لە لایەک زەمی ئەشعەری و ئەشاعیرە دەکات و بە شوێنکەوتەی موعتەزیلە و جەهمییەکان ناویان دەهێنێ، لە لایەکی تریشەوە وەصفیان دەکات و بە ئەهلی سوننە ناویان دەهێنێ چۆن ڕەحمەت دەنێرێ بۆ مردوویەکی ئەهلی سوننە بە هەمان شێوەش ڕەحمەت دەنێرێ بۆ مردووی ئەشاعیرە! وە لە دابەزاندنی حوکم بەسەریاندا زۆر دوورە لە صەوابەوە موخالەفەی ئیجماع دەکات بە ئاشکرا خیلافی سەلەف و خەلەف دەکات لە ئەهلی سوننە!

إبن تیمیە ئەو درعەیە کە سنگی خۆی کردووەتە قەڵغان بۆ پاراستنی ئەشعەری و ئەشاعیرە، ئەو دیفاعەی ئەو لێی کردوون ئەشاعیرە نەیان توانیوە بەو شێوەیە دیفاع لە خۆیان بکەن، بۆیە دەبینی ئەشاعیرە کاتێک ڕووبەڕووی ئەهلی سوننە دەوەستنەوە و ڕەدیان دەدەنەوە پەنا بۆ قەولەکانی إبن تیمیە دەبەن قەولی ئەو لایان مەقبولە!

ئەهلی جەهل و ئەوانەی بێئاگان لە ئەقوالی سەلەف و ئەهلی سوننە، قەولی زانایانی ئەهلی سوننە قبوڵ ناکەن کە لە سەردەمی ئەشعەری و دوای ئەشعەری ژیاون و تەکفیریان کردووە، دێن بە قەولی إبن تیمیە

ڕەتیدەکەنەوە، چونکە إبن تیمیە یەکێکە لەوانەی بە ناوی ئەهلی سوونەوە ڕاست بوویەوە ئەشعەری و ئەشاعیرەی ڕزگار کرد لە تەکفیر و خۆی تەنیا بەرامبەر سەلەف و ئەهلی سوننە وەستایەوە، بەڵام لێرەشدا ڕێیان لێ دەگرین پێیان دەڵێین وەرن هەر بە قەولی إبن تیمیە دەتان گرینەوە، چونکە لە چەندین قەولدا دەڵێ ”ئەشعەری تەجەهومی تێدایە، سەرخەری عەقیدەی جهم کوڕی صفوان ـە، هەرچەندە بە تەواوی جەهمی نییە، بەڵام هەڵگری عەقیدەی جەهمییەکانە، شوێنکەوتە و هەڵگری عەقیدەی عبدالله کوڕی کُلاب ـە“ ئێستا چی دەڵێن دەربارەی قسەکانی کێ ماوە ڕابکەن بۆ لای هَلْ مِن مَفَرّ؟!

إِبن تیمیە هەستی کردبێ یاخود نا تەکفیری ئەشعەری و ئەشاعیرەی کردووە شَاءَ أَم أَبَى، کاتێک وەصفی جەهمی بوون دەدرێتە پاڵ کەسێک ئاماژەیە بۆ تەکفیر کردنی، چونکە ئیجماعی هەموو سەلەف لەسەر ئەوە دامەزراوە کە جەهمییەکان کافرن.

ئەسڵەن ووتەی إبن تیمیە دەربارەی ئەشعەری و ئەشاعیرە کە دیفاعیان لێدەکات هیچ بایەخێکی نییە، چونکە وەک ووتمان موخالەفەی سەلەف و خەلەفی کردووە لە ئەهلی سوننە، بێجگە لەوە إبن تیمیە

تەکفیری ئەعیانی جەهمییەکانی نەکردووە کە سەلەف هەموو کۆ دەنگ بوون لەسەر تەکفیری جەهمییەکان، کاتێک ئەو جەهمییە خاڵصەکان بە عەینی تەکفیر ناکات ئیتر چۆن گوێ بۆ حوکمدانی دەگیرێ دەربارەی ئەشاعیرە؟!

**إبن تیمیه** دەڵێ: لەبەر ئەمەیە من دەڵێم بە جەهمییەکان لە حلولییەکان و ڕەتکەرەوانی صیفات ئەوانەی ڕەتیدەکەنەوە کە الله ﷻ لەسەر عەرش بێ، من ئەگەر موافیقی قەولی ئێوە بکەم ئەوە کافرم، چونکە دەزانم قەولی ئێوە کوفرە، بەڵام ئێوە لای من کافر نین، چونکە جاهلن، وە ئەمەش خیطابێکە بۆ عولەما و قاضی و شێخ و ئەمیرەکانیان.

ولهذا كنت أَقول للجهمية من الحلولية والنفاة الذين ينفون أَن يكون الله تعالى فوق العرش لما وقعت محنتهم: أَنا لو وافقتكم، كنت كافرًا، لأَني أَعلم أَن قولكم كُفر، وأَنتم عندي لا تكفرون، لأَنكم جُهال، وكان هذا خطابًا لعلمائهم وقضاتهم وشيوخهم وأُمرائهم.

الإستغاثة في الرد على البكري ا صـ : ٢٥٣

ووتم: ئەمە باتڵترین و غەڵیزترین قسەیە، چۆن دەکرێ لە کوفر و شیرکدا عوزر بدەیتە کەسی بەرامبەر، جا کەسی کافر کێبێ جەهمی!! مەعقولە کابرا بڵێ ئەم قسەیەتان کوفرە ئەگەر من بیڵێم کافرم، بەڵام ئێوە کافر نابن پێی! ئەوانەی إبن تیمیە عوزریان دەداتێ جاهل نەبوون، بگرە هەندێکیان قاضی بوون، هەندێکیان عیلمیان پێبووە، هەندێکیان شێخ بوون هەموویان دەعوەیان بۆ جەهمییەت کردووە ڕەدی ئەهلی سوننەیان داوەتەوە، کەچی پێیان دەڵێ ئێوە جاهلن! وەک ئەوە وایە بە شێخ و مەلا و حاکمێک بڵێی تۆ نەخوێندەواری جاهلی دینت پێنەگەیشتووە! واللە ئینسانی عاقڵ و عەقیدە صحیح ئەم قسەیە ناکات.

سەلەف هەموو تەکفیری جەهمییەکانیان کردووە، وە هەرکەسێکیش تەکفیری جەهمییەکانی نەکردبێ تەکفیر کراوە، بەڵام دەبینن إبن تیمیە قەولێکی تازەی داهێناوە کە نە لای سەلەف وجوودی هەبووە نە لای خەلەف و موتەئەخرینی ئەهلی سوننە هەبووە، بەڵکو ئەوەی بوونی هەبووە و سەلەف و ئەهلی سوننە لەسەری بوون تەکفیری جەهمییەکان بووە بە موتڵەقی و موعەیەنی، وە تەکفیری ئەو کەسەشیان کردووە تەکفیری نەکرد بن.

حدثني غياث بن جعفر، قال: سمعت سفيان بن عيينة، يقول: القرآن كلام الله عَزَّ وَجَلَّ، مَن قال مخلوق، فهو كَافرٌ، ومَن شَكَّ في كُفره، فهو كَافرٌ.

كتاب السنة لعبدالله بن أَحمد | ٢٥

حدثني أَبو حفص عمر بن الحسن بن خلف، قال: حدثنا أَحمد بن حمدان العسكري، قال: حدثنا محمد بن مجاهد، قال: سمعت يزيد بن هارون يقول: مَن قال: القرآن مخلوق فهو كَافر، ومَن لم يُكفِّره فهو كَافرٌ، ومَن يَشكُّ في كُفره فهو كَافرٌ.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٢٣٤٥

ووتم: کەئەنەما ڕووبەڕوو لەگەڵ إبن تیمیه قسە دەکەن و پێی دەڵێن: تۆ کە شەک و گومانت هەیە و جەهمییەکان تەکفیر ناکەی خۆت کافری.

ئەوەتا لە سەلەف وكیع بن الجراح، یزید بن هارون، قتیبة بن سعید، محمد بن إِدریس الشافعي، أَحمد بن حنبل، عبدالحمید الحمانی و غیری ئەوانیش تەکفیری موعەیەنی جەهمییەکانیان کردووە، ڕێک وتوویانە فڵانە کەس تۆ کافری، دەی قەولی کێ دینە و حەقە بە وەرگرتن ئەوانەی

له سەدەی سێ و دووی هیجری ژیاون یاخود إبن تیمیەیەک کە پێنج سەد ساڵ دوای ئەوان هاتووە ساڵی **(٧٢٨)** هیجری وەفاتی کردووە کامیان ئەهلی ئەوەن قسەیان لێوەربگیرێ؟ بێگومان سەلەف نەک موتەئەخرێکی وەک إبن تیمیه.

حدثنا سليمان بن الأَشعث، قال: حدثنا إِبراهيم بن الحارث الأَنصاري، قال: حدثني أَحمد بن عمر الكوفي، قال: سمعت عبدالحميد الحِماني، يقول: جهم كَافرٌ بالله.

كتاب السنة للخلال ا ١٦٦٤

أَخبرني عبدالملك الميموني: أَنَّ أَبا عبدالله، ذُكِرَ عنده بشر المريسي، فقيل: كَافر. فلم أَرَ أَبا عبدالله أَنكَرَ مِن قول القائل شيئًا.

كتاب السنة للخلال ا ١٧٠٩

أَخبرنا سليمان بن الأَشعث، قال حدثنا أَحمد بن هارون، قال: حدثني محمد بن عمر الكلابي، قال: سمعت وكيعًا يقول: كَفَرَ المريسي.

كتاب السنة للخلال ا ١٧١٧

أَخبرنا سليمان، قال: سمعت قُتَيبة، يقول: بشر المريسي الكَافر.

كتاب السنة للخلال ا ١٧١٨

أَخبرني أَبو بكر بن صدقة، قال: سمعت أَبا بكر بن أَبي عَون، يقول: سمعت يزيد بن هارون، يقول: الجَواربي، والمريسي كَافران.

كتاب السنة للخلال ا ١٧٢٢

أَخبرنا أَبو بكر المروذي، قال: حدثنا إِسماعيل بن عبيد بن عمر بن أَبي كريمة، قال: سمعت شبابة بن سوَّار، يقول: اجتمع رأْيي، ورأي أَبي النضر هاشم بن القاسم، وجماعة من الفقهاء: على أَنَّ المريسي كَافِرٌ جاحد، يُستتاب، فإن تاب وإلَّا ضُربت عنقه.

كتاب السنة للخلال ا ١٧٢٨

وقال علي: سمعت بشر بن المفضل وذكر ابن خالوية بالبصرة جهمي، فقال: بشر هو كَافر، وسئل وكيع عن مثنى الأنماطي، فقال: كَافر، وقال عبدالله ابن داود: لو كان لي على المثنى الأنماطي سبيل لنزعت لسانه من قفاه، وكان جهميًا.

خلق أَفعال العباد للبخاري ا ٥٥-٥٦

أَخبرنا أَبو داود، قال: حدثنا عبدالوهاب بن عبدالحكم، قال: سمعت شعيبًا أَبا صالح، عن يزيد بن هارون، يقول: بشر المريسي وأَبو بكر الأَصم كَافرين، حلالي الدم.

كتاب السنة للخلال | ١٧٣٥ ورواه البخاري في خلق أَفعال العباد | ٧٥ حدثني أَبو جعفر، قال: حدثنا أَحمد بن خالد الخلال، قال: سمعت يزيد بن هارون...

أَخبرنا أَبو داود، قال: حدثنا إِسحاق بن الصباح -ثقة-، قال: سمعت الحسن بن علي، يقول: سمعت يزيد بن هارون يقول: بشر المريسي كَافرٌ بالله.

كتاب السنة للخلال | ١٧٣٦

أَخبرني الحسن بن ثواب المُخرِّمي، قال: قلت لأَحمد بن حنبل: إِبن أَبي دؤاد؟ قال: كَافرٌ بالله العظيم.

كتاب السنة للخلال | ١٧٤٦

قال صالح بن أحمد: قال أَبي: لما كان في شهر رمضان سنة تسع عشرة، حُوِّلتُ من السجن إِلى دار إِسحاق بن إِبراهيم وأَنا مُقَيّد بِقَيد واحد، يُوَجه إِليَّ في كُل يوم رجلين سماهُما أَبي.

قال أَبو الفضل: وهما: أَحمد بن رَبَاح، وأَبو شعيب الحَجام، يُكَلماني ويُناظراني، فإِذا أَرادا الإِنصراف دُعي بقيد فقيدت فمكثت على هذه الحال ثلاثة أَيام فصار في رجلي أَربعة أَقياد، فقال لي أَحدهما في بعض الأَيام في كلام دَارَ، وسأَلته عن عِلمِ الله؟ فقال: عِلم الله مخلوق، فقلت: يا كَافِر، كَفَرْتَ.

سيرة الإِمام أَحمد بن حنبل لصالح بن أَحمد | صـ: ٦٥

حدثنا الحسين بن علي الجصاص، قال: حدثنا الربيع بن سليمان، قال: سمعت الشافعي يقول: وذكر القرآن وما يقول حفص الفرد، وكان الشافعي -رحمه الله تعالى- يقول: حفص المُنْفَرِد وناظره بحضرة وَالٍ كان بمصر، فقال له الشافعي في المناظرة: كَفَرتَ والله الذي لا إله إلا هُو، ثم قاموا فانصرفوا، فسمعت حفصًا يقول: أَشاطَ الشافعي والله الذي لا إِله إلا هُو بدمي.

كتاب الشريعة للآجري | ١٧٦

أَخبرنا علي بن محمد بن أَحمد بن بكر، قال: حدثنا الحسن بن محمد بن عثمان، قال: حدثنا يعقوب بن سفيان، قال: حدثنا محمد بن عبدالرحيم، قال: سمعت عليًا -يعني ابن المديني- قال: كان بشر بن المفضل يصلي كُل يوم أَربع مئة ركعة، ويصوم يومًا ويفطر يومًا، وذكر عنده إِنسان من الجهمية، فقال: لا تذكر ذاكَ الكَافر.

شرح أُصول اعتقاد أَهل السنة للالكائي | ٤٣٦

ئەوەی سەرەوە تێپەڕی عەقیدەی سەلەفە لە تەکفیر کردنی جەهمی موعەیەن، دەی ئینسانی عاقڵ قەولێکی بەسە، بەڵام جاهلان و دڵ نەخۆش و مێشک مردووەکان ئەم قەولانە ناچێ بە گوێیاندا ئیللا دەبێ پۆخڵەواتەکەی إبن تیمیە بێ!

تەنانەت لەمەش زیاتر سەلەف تەکفیری موعەیەنی کەسانێکیان کردووە کە لە ئەصڵدا جەهمی نەبوون، بەڵکو لەسەر مەزهەبی ئەهلی سوننە بوون، بەڵام کاتێک تاقیکراونەتەوە دەربارەی وەستان لە تەکفیر نەکردنی واقفە لە جەهمییەکان تەکفیریان کردوون.

**أبو على العنزى** دەڵێ: عمر کوڕی شبه النميرى له سامەڕا به ئامادەبوونی من تاقیکرایەوە دەربارەی خەلقی قورئان، ووتی: کەلامی الله ـيه مەخلوق نییه، وه پێیان ووت: هەرکەسێک بوەستێ له قورئان نه ئەوەیە بڵێ مەخلوقه نه ئەوەیە بڵێ مەخلوق نییه ئەوە کافرە. ووتی: من تەکفیری هیچ کەسێک ناکەم، پێیان ووت : تۆ کافری، ئیتر کتێبەکانیان دڕاند، ئەویش له ماڵەوە مایەوە و نەهاتە دەرەوە سوێندی خوارد بۆ ماوەی یەک مانگ هیچ حدیثێک نەگێڕێتەوە بۆ کەس.

أَخبرنا العتيقي، حدثنا محمد بن العباس، حدثنا محمد بن عبيدالله الكاتب، حدثنا أَبو محمد الأَنباري، حدثني أَبو علي العَنزي، قال: امتحن عُمَر بن شبة بِسُرَّ مَن رَّأَى بِحضرتي، فقال: القرآن كلام الله غير مخلوق، فقالوا له: من وَقَفَ فهو كَافر. فقال: لا أُكَفِرُ أَحدًا، فقالوا له أَنت كَافر فمزقوا كُتبه، فلزم بيته وحَلَفَ أَن لا يُحَدِثُ شهرًا.

تاريخ بغداد للخطيب | **(١١ /٢٠٩)**

ووتم: ئەم حاڵەتەی عمر بن شبة النميرى له حاڵەتی إبن تيميه دەچێ بگرە زۆر ئاسانترە لەوەی إبن تيميه، چونکە عمر بن شبه تەکفیری جەهمییەکانی کردووە، بەڵام له تەکفیری واقفه وەستاوە، واقفه قسمێکن

لە قسمەکانی جەهمییە عەقیدەیان ئەوەیە دەربارەی قورئان نە دەڵێن مەخلوقە نە دەڵێن مەخلوق نییە. حرب دەڵێ :

والواقفةُ وهُم الذين يزعمون أَنا نقول: إِنَّ القرآن كلام الله، ولا نقول: غير مخلوق. وهُم شَرُّ الأَصناف وأَخبثها.

کتاب السنة لحرب الكرماني ا ٩٧

لە کاتێکدا قەولی إبن تیمیە قورسترە تەکفیری موعەیەنی جەهمییەکان ناکات! کە ئیجماعی سەلەفی لەسەرە تەکفیر کردنیان هەروەک چۆن **حرب الكرمانى** هێناویەتی، دەڵێ :

والجهمية أَعداء الله وهم الذين يزعمون أَنَّ القرآن مخلوق، وأَنَّ الله ﷻ لم يُكلِّم موسى، وأَنَّ الله لا يتكلَّمُ، لا يُرى، ولا يُعرف لله مَكان، وليس لله عرشُ، ولا كُرسي، وكلام كثير أَكرَه حِكايته. وهم كُفَّار أَعداءُ الله فاحذروهم.

کتاب السنة لحرب الكرماني ا ٩٦

لای سەلەف هەرکەس واقفە بووبێ واتە گومانی هەبووبێ لە قورئان لەوەی کەلامی الله بووبێ، نە ئەوەیە بڵێ غیر مخلوق نە بشڵێ مخلوق، ئەوە تەکفیر کراوە.

قال أَبو طالب وسمعته -يعني: أَحمد- يقول: مَن شَكَّ فقد كَفَر.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٢١٩٧/أ

قال أَبو طالب: وجاء رَجل إِلى أَبي عبدالله -وأَنا عنده- وقال: إِنَّ لي قرابةً يقول بالشَّكِّ؟ قال: فقال وهو شديد الغضب: مَن شَكَّ فهو كَافرٌ. قال: وقال رَجل: القرآن كلام الله ليس بمخلوق. قال: فقال: هذا قولنا، مَن شَكَّ فهو كَافرٌ. قال: فقالوا: جزاك الله خيرا.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٢١٩٧/ب

**إِبن تيميه** دەڵێ: یەکەمین کەس ووتی: کەلامی الله قەدیمە عبدالله کوڕی سعید إِبن کلاب بوو، هیچ کەسێک نەبووە لە سەلەف بڵێ: ئەم قورئانە عیبارەتە لە کەلامی الله، وە نەشیان وتووە: حیکایەتێکە لە کەلامی الله، وە کەسیشیان نەبووە بڵێ: لەفظم بە قورئان قەدیمە، یاخود غیر مخلوق، چ جای ئەوەی بڵێن: دەنگمان بە قورئان قەدیمە یاخود غیر

مخلوق، بەڵكو سەلەف ئەوەیان دەوت کە قورئان و سوننە دەلالەتی لەسەر دەکرد کە قورئان کەلامی اللە ـیە ﷻ، وە خەڵکی بە صەوت دەیخوێننەوە و دەینوسنەوە، وە ئەوەی لە نێوان لەوحەکاندا نوسراوە کەلامی اللە ـیە ﷻ، وە کەلامی اللە مەخلوق نییە.

قال إِبن تيمية: وأَوَل من عرف أَنه قال: كلام الله قديم: عبدالله بن سعيد بن كُلاب، ولم يقل أَحد من السلف: إِنَّ هذا القرآن عبارة عن كلام الله، ولا: حِكايةُ له، ولا قال أَحد منهم: إِنَّ لفظي بالقرآن قديم، أَو غير مخلوق، فضلًا عن أَن يقول: إِنَّ صوتي به قديم، أَو غير مخلوق، بل كانوا يقولون بما دَلَّ عليه الكتاب والسنة مِن أَنَّ القرآن كلام الله، والناس يقرؤُنه بأَصواتهم ويكتبونه بمدادهم، وما بين اللوحين كلام الله، وكلام الله غير مخلوق.

مجموع الفتاوى لابن تيمية | **( ١٢/٣٠٢)**

**إبن تيميه** دەڵێ: جا لەبەرئەوەی قسەکانی بەشێکی قەولی ئەمانەیە واتە ئەهلی سوننە، وە بەشێکی تری قەولی ئەوانە واتە جەهمییەکان، بۆیە دەبینی هەیە دەڵێ: جۆرێک لە جەهمییەتی تێدایە، ئەمما ئەوەی بڵێ قەولەکەی هەموو قەولی جەهمە، ئەوە قسەیەکی باتڵی کردووە، وە

ئەوەشی بڵێ هیچ قەولێکی جەهمی تێدا نییە، ئەوە قسەیەکی باتڵی کردووە.

قال إِبن تيمية: فلما كان في كلامه شَوْب مِن هذا، وشَوْبُ مِن هذا، صار مَن يقول: إِنَّ فيه نوعًا من التَجهُم. وأَما مَن قال قوله قول جَهم، فقد قال الباطل، ومَن قال: إِنه ليس فيه شيء مِن قول جَهم، فقد قال الباطل.

مجموع الفتاوى لابن تيمية | **(٢٠٤/١٢)**

سەیری ئەو موصتەڵەحە دای هێناوە! نیوەی جەهمی بێ نیوەکەی تریشی سوننی لەگەڵ ئەوەشدا هەر ئیمامە! لە کاتێکدا لای سەلەف هێندە بەس بووە کەسێک قەولێک لە ئوصوڵی جەهمییەکان بکاتە مەنهەج ئەوە جەهمی بوون دەدرایە پاڵی و تەکفیر دەکرا.

**إبن تيميه** دەڵێ: ئەمما ئەشعەری و هاوەڵەکانی ئەوە لە خۆی و هاوەڵەکانی دیارە موافەقەی جەهمی کوڕی صفوان ـن لە بابەتی ئیماندا هەمان قەولی جەهم دەڵێن کە ئیمان تەنها نییەتی دڵە بە دڵ بزانی الله هەیە. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا قەولی ئەهلی حدیث دەردەخەن و تەئویلی دەکەن، لە هەموو ڕوویەکەوە موافقی جهم نین، هەرچەندە لە بابەتی

ئیماندا لە هەموو طائفەکانی تر نزیکترن لێی، وە لە بابەتی قەدەردا جهم ڕەئسە دەڵێ: عەبد دەسەڵاتی نییە بەسەر هیچ کردەوەیەکیدا، ئەشعەری لەمەشدا موافەقەی جهم دەکات کە عەبد خاوەن و بکەری کردارەکانی نییە، وە هیچ قودرەت و دەسەڵاتێکی نییە تەئسیری هەبێ لەسەر کردەوەکانی.

قال إِبن تيمية: وأَما الأَشعري وأَصحابه: فالمعروف عنه وعن أَصحابه: أَنَّهم يوافقون جهمًا في قوله في الإِيمان، وأَنَّه مجرد تصديق القلب، أَو معرفة القلب، لكن قد يظهرون مع ذالک قول أَهل الحديث ويتأَولونه، ويقولون بالإِستثناء على الموافاة، فليسوا موافقين لجهم من كُل وجه، وإِن كانوا أَقرب الطوائف إِليه في الإِيمان، وفي القدر أَيضًا، فإِنه رأس، يقول: ليس للعبد فعل البتة، والأَشعري يوافقه على أَنَّ العبد ليس بفاعل، ولا له قدرة مؤثرة في الفعل، ولكن يقول: هو الكاسب.

كتاب النبوات لابن تيمية | صـ: ١٤٨

**إبن تيميه** دەڵێ: أبو الحسن الأشعری قەولی جهم کوڕی صفوان سەر دەخات لە بابەتی ئیماندا، لە کاتێکدا لە مەسئەلەی إستثناء کردن لە ئیماندا "واتە ئینسان بڵێ إِن شاء الله ئیماندارم" قەولی ئەهلی سوننەی سەر

خستووه ..... زۆربەی هاوەڵەکانی شوێنی کەوتوون لە سەرخستنی قەولی جهم لە ئیماندا، هەرکەسێک تەماشای کتێبەکانی ئەهلی کەلامی نەکردبێ، وە نەزانێ سەلەف چییان وتووە لەم بابەدا وا گومان دەبات کە ئەوەی ئەهلی کەلام دەیڵێن قەولی ئەهلی سوننەیە، لە کاتێکدا ئەم قەولە هیچ یەکێک لە ئیمامەکانی ئەهلی سوننە نەیان وتووە، بەڵکو أحمد کوڕی حنبل و وکیع کوڕی جراح و غیری ئەوانیش تەکفیری هەرکەسێکیان کردووە کە قەولی جهم کوڕی صفوان وتبێ لە ئیماندا، کە أبو الحسن الأَشعری سەری خستووە.

قال إِبن تيمية: وأَبو الحسن الأَشعري نَصَرَ قول الجهم في الإِيمان، مع أَنه نَصَرَ المشهور عن أَهل السنة من أَنَّه يستثنى في الإِيمان ..... واتبعه أَكثر أَصحابه على نصر قول جهم في ذالک، ومن لم يقف إِلا على كتب الكلام، ولم يعرف ما قاله السلف وأَئمة السنة في هذا الباب، فيظن أَنَّ ما ذكروه هو قول أَهل السنة، وهو قول لم يقله أَحد من أَئمة السنة، بل قد كَفَرَ أَحمد بن حنبل ووَكيع وغيرهما من قال بقول جَهم في الإِيمان، الذي نَصَرَه أَبو الحسن.

مجموع الفتاوى لابن تيمية | **( ٧/ ١٢٠)**

ووتم: ئەوەتا إبن تیمیە خۆی دان بەوەدا دەنێ لای سەلەف هەرکەسێک موافەقەی جهم کوڕی صفوانی کردبێ وتبێتی ئیمان بەس نییەتی دڵە، کافر بووە، وە ئیعتراف بەوە دەکات ئەشعەری لە ئیمان و قەدەریشدا خاوەنی هەمان قەولی جهم کوڕی صفوانە و سەری دەخات، ئێستا قایل دەبن بەو قسەیەی؟!

**إِبن تیمیە** دەڵێ: ئەم تەئویلاتانەی ئێستا مەوجوودن و بە دەست خەڵکەوەن، وەک ئەو تەئویلاتانەی کە أبو بکر ابن فورک لە کتێبی تەئویلاتدا هێناونی، وە ئەوانەشی أبو عبدالله محمد کوڕی عمر الرازی لە کتێبەکەیدا بە ناوی تأسیس التقدیس هێناونی دەبینی زۆربەی ووتەی أبي علی الجبائی و عبدالجبار کوڕی أحمد الهمدانی و أبی الحسین محمد بن علی بن الطیب و أبی الوفاء إبن عقیل و أبی حامد الغزالی و غیری ئەوانیشە، ئەم تەئویلاتانە ڕێک هەمان تەئویلەکانی بشر المریسی ـن کە لە کتێبەکەیدا هێناونی ئەگەرچی لە ووتەکانی ئەمانەدا ڕەدی تەئویل و هەڵوەشاندنەوەی تەئویلی تێدایە، وە لە هەندێک شتدا قسەی باشیان هەیە، ڕوونم کردووەتەوە کە تەئویلاتەکانیان ڕێک هەمان تەئویلەکەی بشر المریسی ـیە.

پاشان ئەئمەی ئەهلی سوننه و ڕێنمونی کاران هەموو تێکڕا زەمی مەریسییەکانیان کردووە، وە زۆربەیان تەکفیریان کردوون و بە گومڕایان بینیون، بۆیە زانراوە ئەوەی ئێستا باوو بڵاوە لە ناو موتەئەخریندا مەزهەب و عەقیدەی بشر المريسى جەهمییە.

قال إِبن تيمية: فهذه التأويلات الموجودة اليوم بأَيدي الناس مثل أَكثر التأويلات التي ذكرها أَبو بكر ابن فورک في كتابه التأويلات، وذكرها أَبو عبدالله محمد ابن عمر الرازي في كتابه الذي سماه: تأسيس التقديس ويوجد كثير منها في كلام خلقٍ غير هؤلاء مثل: أَبي علي الجبائي، وعبدالجبار بن أَحمد الهمداني، وأَبي الحسين البصري، وأَبي الوفاء ابن عقيل، وأَبي حامد الغزالي وغيرهم، هي بعينها تأويلات بشر المريسي التي ذكرها في كتابه، وإِن كَان قد يوجَد في كلام بعض هؤلاء رد التأويل وإِبطاله أَيضًا ولهم كلام حسن في أَشياء، فإِنَّما بَيَّنتُ أَنَّ عَين تأويلاتهم هي عين تأويلات المريسي.

ثم إِذا رأَى أَئمة الهدى قد أَجمعوا على ذم المريسية وأَكثرهم كَفَروهم وضللوهم، وعَلِمَ أَن هذا القول الساري في هؤلاء المتأَخرين هو مذهب المريسية.

الفتوى الحموية الكبرى لابن تيمية | صـ : ٢٤٥-٢٥٠

ووتم: تەماشاکەن إبن تیمیه دان بەوەدا دەنێ ئەوەی ئەشاعیره لەسەرینی هەمان عەقیدەکەی بشر المریسی جەهمییه، واته لەسەر کوفری جەهمییەکانن، لەگەڵ ئەوەشدا تەکفیری موعەیەنی جەهمییەکان ناکات!

بێجگە لەوە سەیرێکی ئەم بەشەی قەولی إبن تیمیه بکەن دەڵێ: "وأَكثرهم كَفَروهم وضللوهم" ئەمە قسەیەکی غەڵەت و باتڵە هەتا سەر ئێسقان، وە پێچەوانەی سەلەفە هیچ خیلافێک نەبووە لە نێوانیاندا، سەلەف هەموو تێکڕا تەکفیری جەهمییەکانیان کردووە، نەک زۆرینەیان کە إبن تیمیه دەعوای بۆ دەکات! حرب الكرماني ئیجماعی لەسەر تەکفیریان نقڵ کرووە، حرب دەڵێ: والجهمية هُم كُفار زنادقة أَعداء الله فاحذروهم.

كتاب السنة لحرب الكرماني | ٩٦

هەتا بە هەڵەدا چووە و تووشی غەفڵەت بووە لەوەی کە أبو الوفاء إبن عقيل لە ڕیزی ئەو شەخصانە هێناوە پێی وایە ئەشعەری بووە و تەئویلی صیفاتی کردووە، بەڵێ سەرەتا موعجیب بووە بە موعتەزیلە و ئەشاعیره

تەئویلی کردووە، بەڵام دواتر تەوبەی کردووە بە شاهێدی قاضی و شێخ و سەید و ئومەڕاء پەشیمانی خۆی ڕاگەیاندووە و بە حەڵاڵی نەزانیوە هیچ کەسێک قەولەکانی پێشووی بخوێنێتەوە و نقڵ بکات و وەریان بگرێ.

**إبن عقيل** دەڵێ: من تەوبە و پەشیمانی خۆم بۆ الله تعالى ڕادەگەیێنم و بەرائەتی خۆم نیشان دەدەم لەوەی لەسەر مەزهەبی موعتەزیلە و غیری ئەوانیش بووم، وە لەوەی هاوڕێیەتییانم کردووە، وە بە گەورە تەماشام کردوون و ڕەحمەتم ناردووە بۆ ئەوانەیان کە مردوون، وە باسی جوانی ئەخلاقیانم کردووە، هەر شتێکم وتووە، وە هەر قەولێکتان بینی بە دەستی من نوسرا بوو لە مەزهەب و گومڕاییەکانیان ئەوە من تەوبەی لێدەکەم و داوای لێخۆشبوون لە الله تعالى دەکەم لەوەی نوسیومە، بۆ هیچ کەسێک حەڵاڵ نییە و ڕێگە نادەم ئەو قەولانەم بنوسرێنەوە، وە بخوێنرێنەوە، وە ئیعتقاد و باوەڕتان پێیان هەبێ.

وە کەسانێک دەیانوت: جسمانێکی ڕەشن، منیش ووتم: صحيح ئەوەیە لە شێخ أبي علي بیستوومە کە وتوویەتی: عەدەمە ناونانرێ بە جسم، وە لە ئەصڵدا هیچ شتێک نییە، وە منیش ئەوەم هەڵبژارد و باوەڕم پێی هەبوو، ئەوە من لێی دەگەڕێمەوە و تەوبە دەکەم، وە باوەڕم وابوو حلاج حسين

کوڕی منصور خاوەنی کەرامات و زوهد و دینە، وە ئەم قەولەم سەر دەخست و بە حەقم دەزانی و جوزئێکم لەسەر ژیانی نوسیوە، وا ئێستا لێی پەشیمانم و تەوبە دەکەم، پێم وایە حلاج بە ئیجماعی عولەمای ئەو سەردەمە لەسەر زەندەقە کوژرا ئەوانەی فەتوایاندا بۆ کوشتنی لەسەر حەق بوون و پێکاویانە حلاج غەڵەت بوو، لەگەڵ ئەمەشدا من داوای لێخۆشبوون لە الله تعالى دەکەم و پەشیمانی و گەڕانەوە بۆ لای ڕادەگەیێنم لەوەی تێکەڵاوی موعتەزیلە و ئەهلی بیدەع و غیری ئەوانیشم کردووە، وە ڕەحمەتم ناردووە بۆیان، وە بە گەورە تەماشام کردوون، ئەمە هەمووی حەرامە، دروست نییە بۆ هیچ موسڵمانێک ئەمانە بکات.

گومانی تێدا نییە شەریف أبو جعفر و ئەوانەشی لەگەڵی بوون لە مەشایخ و شوێنکەوتووانی گەورە و برای منن الله بیانپارێزێ لەوەی ئینکاری مونکەریان کرد بەرامبەر من لەسەر حەق بوون و ئەجریان دەست کەوتووە کاتێک بە دەست نوسی خۆم بینیان تەوبەم کردووە و گەڕاومەتەوە لەوەی پێشتر وتوومە بە تەئکیدی من غەڵەت بووم و نەم پێکاوە، وە هەرکات شتێکتان لە من بینی و بیست پێچەوانەی ئەوەبێ لەم

نوسراوەدا دانم پێدا ناوە، ئەوە واجبە لەسەر ئیمامی موسڵمانان سزام بدات، من لەسەر ئەم قسانەم الله و مەلائیکە و ئەهلی عیلم بە شاهێد دەگرم و مەجبور نەکراوم بیانڵێم و لە ژێر ئیکراهیشدا دانم پێیاندا نەناوە، الله تعالی دەزانێ ناخ و ظاهرم یەک شتە موافیقم لەسەر ئەوەی نوسیومە، الله تعالی فەرموویەتی: ﴿ وَمَنْ عَادَ فَيَنتَقِمُ اللَّهُ مِنْهُ ۗ وَاللَّهُ عَزِيزٌ ذُو انتِقَامٍ ﴾.

يقول علي بن عقيل بن محمد: إِني أَبرأُ إِلى الله تعالى مِن مذاهب مُبتدعة الإِعتزال وغيره، ومِن صُحبة أَربابه، وتعظيم أَصحابه، والتَّرَحُم على أَسلافهم، والتَّكثُر بأَخلاقهم، وما كنت عَلقتُه، ووُجِدَ بخطي مِن مذاهبهم وضلالتهم فأَنا تائب إِلى الله تعالى مِن كتابته، ولا تَحِلُ كتابته، ولا قِراءته، ولا اعتقاده.

وإِنَّ قومًا قالوا: هو أَجساد سُود، وقلت: الصحيح: ما سمعته مِن الشيخ أَبي عليٍّ، وأَنه قال: هو عَدَم لا يُسمى جسمًا، ولا شيئًا أَصلًا، واعتقدت ذالک، وأَنا تائب إِلى الله تعالى مِنهم، واعتقدت في الحلاج أَنه مِن أَهل الدين والزهد والكرامات، ونصرت ذالک في جزء عَملته، وأَنا تائب إِلى الله تعالى مِنه، وأَنه قُتل بإِجماع علماء عصره، وأَصابوا في ذالک وأَخطأَ

هو، ومع ذالک فإِني أَستغفر الله تعالى، وأَتوب إِليه من مُخالطة المعتزلة والمبتدعة وغير ذالک، والتَّرَحُم عليهم، والتعظيم لهم، فإِنَ ذالک كُله حرام، ولا يحِلُّ لمسلم فِعلُه.

وقد كان الشريف أَبو جعفر ومَن كان معه مِن الشيوخ والأَتباع سادتي وإِخواني حرسهم الله تعالى مُصيبين في الأِنكار عَلَّيَّ، لِما شاهدوه بِخطي مِنَ الكتب التي أَبرأُ إِلى الله تعالى منها، وأَتحقق أَني كنت مُخطئًا غير مصيب، ومتى حُفِظ عَلَيَ ما يُنافي هذا الخط وهذا الإِقرار فلإِمام المسلمين مُكافاتي على ذالک، وأَشهدت الله وملائكته وأُولي العلم على ذالک غير مُجبرَ، ولا مُكرَه، وباطني وظاهري يعلم الله تعالى في ذالک سواء، قال الله تعالى: ﴿وَمَنْ عَادَ فَيَنتَقِمُ اللهُ مِنْهُ وَاللهُ عَزِيزٌ ذُو انْتِقَامِ﴾.

الذيل على طبقات الحنابلة لابن رجب | **(٣٢٢/١)**

ووتم: تەوبە كردن دەبێ بەم جۆرەبێ بە ئاشكرا لە پێش چاوی خەڵكی دان بەوەدا بنێی چەندێكە لەسەر باتڵ بووی خەڵكت بۆ گومڕایی بانگ كردووە، پەشیمانی دەربڕی لەوەی وتووتە و نوسیوتە، وە بە حەرامی دابنێی خەڵک ئەو قەولانەی پێشووت نقڵ بكەن و وەری بگرن و دینداری پێوە بكەن، نەوەک ئەوەی خەڵكی جاهل دەعوای بۆ دەكەن كە

گوایه أبو حامد الغزالی تەوبەی کردووه، چونکه کاتێک وەفاتی کردووه صحیحی بوخاری لەسەر سنگی بووه! له کاتێکدا نەمان بینیوه لێوەی ووتبێتی پەشیمانم له تەئویلی صیفات و ئیعتقادی موتەصەوفه و چڕبوونەوەم له فەلسەفه و هێنانی قەولەکانیان و پەشیمانم لەو باتڵانەی له کتابی إحیاء علوم الدين هێناومه، ئیتر له کوێ تەوبەی کرد تەنها هەبوونی صیحیحی بوخاری لەسەر سنگی ئینسان بەسه بۆ پاک بوونەوەی؟!

وه دەڵێن النووی تەوبەی کردووه و نامیلکەی نوسیوه لەسەر پاشگەزبوونەوەی لەوەی ڕەتی حەرف و صەوتی کردووه که پێشتر پێی وابووه قورئان له حەرف و صەوت پێکنەهاتووه، ئەی کوا بۆچی قەولێکیان نەبینی بڵێ پەشیمانیشم له تەئویلی صیفات و ڕەتکردنەوەی کاتێک شەرحی صحیحی مسلم ـی کردووه هەتا وەفاتی کردووه لەسەر ئەو مەنهەجه ڕۆیشتووه که له شەرحەکەیدا وتوویەتی دەربارەی صیفات؟!

وه به هەمان شێوەش دەربارەی إبن تيميه کوانێ له کوێدا هاتووه بڵێ من پەشیمانم لەوەی له كتاب الإستغاثة والرد على البكری تەکفیری

ئەعیانی جەهمییەکانم نەکردووە، بۆ کەس دروست نییە ئەو قەولەم وەربگرێت و ئیشی پێبکات؟!

**إِبن تيميه** دەڵێ: ئەشعەرییەکان لە بابی ناوەکان و حوکمەکاندا "ئەوەی پەیوەستە بە بابەتی کوفر و ئیمان" مورجیئەن، لە بابی قەدەردا جەبرین، ئەما لە صیفاتدا ئەوە بە تەواوی جەهمی نین، بەڵکو جۆرێک لە جەهمییەتیان تێدایە.

قال إِبن تيمية: والأشعرية: الأغلب عليهم مرجئة في باب الأسماء والأَحكام، جبرية في باب القدر، وأَما الصفات فليسوا جهمية محضة، بل فيهم نوع من التجهم.

مجموع الفتاوى لابن تيمية | **(٦/٥٥)**

ووتم: ئەوەی کە دەڵێ بە تەواوی جەهمی نین باتڵە، وەک لە بەشی سەرەتای کتێبەکەدا قەولی سەلەفمان هێنا ئەهلی تەئویلیان بە جەهمی ناوهێناوە، هەروەها بە قەولی خودی إبن تیمیە باتڵە، چونکە ئەو خۆی دان بەوەدا دەنێ ئەشعەری لە ئیماندا شوێن جهم کوڕی صفوان کەوتووە،

لای سەلەفیش هەرکەس وای ووتبێ تەکفیریان کردووە ئیلزامێکی چاو سووتێنە.

إبن تيميه دەڵێ: زانراوە ئەشاعرە حەقیقەتی عەقیدە و باطنیان عەقیدە و باطنی موعتەزیلە و جەهمییە موعەطیڵەکانە، هەرچەندە لە ظاهردا وا دەردەکەون کە ئەهلی ئیثباتن و صیفات سابت دەکەن، هەروەک چۆن موعتەزیلە لە کاتی تەحقیق و ووردبوونەوە لێیان حەقیقەتی عەقیدە و ئەمریان هەمان عەقیدەی مولحیدەکانە کە نەفی هەموو ناوو صیفاتەکان دەکەن، هەرچەندە موعتەزیلە وای نیشان دەدەن ڕەدی مولحیدەکان دەدەنەوە.

قال إِبن تيمية: فَعلِمَّ أَنَّ هؤلاء حقيقة باطنهم باطن المعتزلة الجهمية المعطلة، وإِن كان ظاهرهم ظاهر أَهل الإثبات، كما أَن المعتزلة عند التحقيق حقيقة أَمرهم أَمرُ الملاحدة نفاة الأَسماء والصفات بالكُلية، وإِن تظاهروا بالرد عليهم.

بيان تلبيس الجهمية لابن تيمية | **(٤٠١/١٤)**

**إبن تيميه** دەڵێ: ئەشعەری و أبو بكر الباقلانی وە قەدیمەکانیان صیفات سابت دەکەن، وە هەندێکی تریان هەندێک صیفات سابت دەکەن، وە لە ڕوویەکی ترەوە جەهمییەتیان تێدایە، ئەشعەری کەلام و عەقیدەی أبو علی الجبائی شێخی موعتەزیلەی خواردبوویەوە و چبوویە دڵیەوە، ئەشعەری هەموو هاوەڵەکانی و غیری ئەوانیش موتەفیقن لەسەری کە ئەهلی کەلام بووە.

قال إِبن تيمية: فالأَشعري والباقلاني وقدماؤهم يثبتونها، وبعضهم يَقرُّ ببعضها، وفيهم تَجَهُّمٌ من جهة أُخرى، فإِن الأَشعري شَرِبَ كلام الجُبائي شيخ المعتزلة، ونسبته في الكلام إِليه متفق عليها عند أَصحابه وغيرهم.

مجموع الفتاوى لابن تيمية | **(٥٢/٦)**

**إبن تيميه** دەڵێ: أبو الحسن الصالحی دەڵێ: ئیمان تەنها پێکهاتووە لە نییەتی دڵ و ناسینی الله بە دڵ تصدیقی دڵ. ئەم قسەیەی صاڵحی قەولی مەشهوری أبو الحسن الأشعرییە، وە هاوەڵەکانیشی وەک قاضی أبی بکر الباقلانی و أبی المعالی الجوینی و هاوشێوەکانی ئەمانیش لەسەر هەمان قەولن کە ئیمان تەنها نییەت و مەعریفەی دڵە.

قال إِبن تيمية: وقال أبو الحسين الصالحي: وليس الإيمان إلا مجرد تصديق القلب ومعرفته. وهذا أشهر قولي أبي الحسن الأشعري، وعليه أصحابه كالقاضي أبي بكر الباقلاني وأبي المعالي الجويني وأمثالهما.

مجموع الفتاوى لابن تيمية | **(٥٠٩/٧)**

**إبن تيميه** دەڵێ: ئیمان لای قاضی أبو بکر الباقلانی تەنها نییەتی دڵە لێرەدا شوێن جهم و صاڵحی کەوتووە، وە ئەمە مەشهورە لە أبی الحسن الأشعریش کە ئیمان تەنها نییەتی دڵە تصدیقی دڵە، هەرچەندە بە زمان الله بە درۆ بخاتەوە، وە جنێو بە الله و ڕەسولەکەی بدات، وە جنێودان بە الله و ڕەسولەکەی بە زمان ئەوە ڕووکەش و ظاهیرە تەئسیری نابێ لەسەر ئیمانەکەی دڵ، ئەمە خۆی لە خۆیدا کوفرە، قەت ناکرێ لە یەک کاتدا کوفر بکات و تصدیقی دڵیشی هەبێ و مابێ، ئەمە ئەصڵێکی فاسد و پووچەڵە بە پێی شەرع و عەقڵیش.

قال إبن تيمية: والقاضي أَبو بكر الباقلاني بناها على أَصله في الإِيمان الذي اتبع فيه جهمًا والصالحي، وهو المشهور عن أَبي الحسن الأَشعري، وهو أَنَّ الإِيمان مجرد تصديق القلب، ولو كَذب بلسانه وسبَ الله ورسوله بلسانه، وإِنَّ سبَ الله ورسوله إِنما هو في الظاهر، وأَنَّ كُلما كان كُفرًا في

نفس الأَمر، فإِنه يمتنع أَن يكون معه شيء من تصديق القلب، وهذا أَصل فاسد في الشرع والعقل.

مجموع الفتاوى لابن تيمية | **(٧٤٨/١٠)**

**إبن تيميه** دەڵێ: بەم جۆرە ڕوون دەبێتەوە فەسادی قەولی جهم و الصالحی وە ئەوانەشی شوێنیان کەوتوون وەک ئەشعەری لە قەولی مەشهوریدا و زۆربەی هاوەڵەکانی، وە طائفەیەک لە موتەئەخرینی شوێنکەوتەی أبی حنیفه وەک أبو منصور الماتریدی کە پێیان وایە ئیمان تەنها نییەتی دڵە هەموو عەبدەکان تیایدا یەکسانن، بەو جۆرەیە یان هەر وجوودی نییە، یاخود هەیە و جوزئیاتی نییە، وە دەکرێ ئینسان بە تەواوی لە دڵەوە ئیماندار بێ لەگەڵ ئەوەشدا بە زمان کوفر بکات و جنێو بە الله و ڕەسولەکەی بدات ئارەزوومەندانە بەبێ ئەوەی زۆری لێبکرێ.

قال إِبن تيمية: وبهذا وغيره، يتبين فساد قول جهم والصالحي ومن اتبعهما في الإِيمان كالأَشعري في أَشهَر قوليه، وأَكثر أَصحابه، وطائفة من متأَخري أَبي حنيفة كالماتريدي ونحوه حيث جعلوه مجرد التصديق في القلب يتساوى فيه العباد، وأَنَّه إِما أَن يعدم وإِما أَن يوجد لا يَتَبَعض، وأَنه

يمكن وجود الإِيمان تامًا في القلب مع وجود التكلم بالكفر والسَبَّ لله ورسوله طوعًا من غير إِكراه.

مجموع الفتاوى لابن تيمية | **(٥٨٢/٧)**

قەولی صاڵحی کە ئەشعەری سەرخەری بووە، وە إبن تیمیە زیاد لە جارێک ئاماژەی پێداوە ئەوەیە: ئیمان تەنها نیيەتی دڵە ناسینی الله ـیە بەبێ عەمەل، کوفر ئەوەیە الله نەناسی، وە نوێژ عیبادەت نییە بۆ الله، وە هیچ عیبادەتێک نییە تەنها هێندە بەسە باوەڕت بە الله هەبێ و بیناسی، وە ئیمان زیاد و کەم ناکات پێکهاتووە لە یەک بەش.

والفرقة الثانية من المرجئة يزعمون أَنَّ الإِيمان هو المعرفة بالله فقط، والكُفرَ هو الجهل به فقط، فلا إِيمان بالله إِلا المعرفة به، ولا كُفرَ بالله إِلا الجهلُ به.

وأَنَّ الصلاة ليس بعبادةٍ لله، وأَنه لا عبادة إِلا الإِيمان به، وهو معرفته، والإِيمان عندهم ولا يزيد ولا ينقص، وهو خصلةٌ واحدة، وكذالك الكُفر، والقائل بهذا القول أَبو الحسين الصالحي.

مقالات الإسلاميين للأشعري | صـ : ٢٤٠

ووتم: ئەوە ڕێک عەقیدەی جهمی کوڕی صفوانە کە ئیمان بەلایەوە تەنها ناسینی الله ـیە ﷻ !

إبن تیمیه دەڵێ: بەڵام زۆرێک لە ئەشاعیرە تووشی غەڵەت بوون، پێیان وایە مەعبود الله ئەو زاتەیە کە قودرەت و دەسەڵاتی هەبێ بەسەر دروست کردن و خەلقاندندا، وە ئیلاھ ئەو زاتەیە ڕووی تێدەکەی بۆ پەرستن ئیتر هەر زاتێک بێ، هەروەک چۆن طائفەیەک ئەمەیان باسکردووە وەک ئەشعەری و غیری ئەویش...

حەقیقەتی ئەم قەولە ئەوەیە کە الله کوفر و فیسقی خۆشدەوێ و لێی ڕازییە، ئەمە قەولی مەشهوری أبو الحسن الأشعری و هاوەڵەکانیەتی، أبو المعالی الجوینی ئاماژەی بەوە کردووە کە یەکەم کەسێک ئەمەی وتووە أبو الحسن الأشعری بووە، هەروەها إبن عقیل دەڵێ یەکەمین کەس وتبێتی: الله ﷻ کوفر و فیسق و تاوانی خۆشدەوێ أبو الحسن الأشعری و هاوەڵەکانی بوون، وە وتووشیانە: الله ﷻ وەک دین خۆشی ناوێ و لێی ڕازی نابێ، واتە بکەری ئەو کوفر و فیسق و سەرپێچییانە ئەجری دەست ناکەوێ، بەڵام الله خودی کوفر و فیسق و سەرپێچییەکانی خۆشدەوێ وەک هەموو مەخلوقەکانی تر، چونکە لای ئەوان وایە کە

الله ﷻ تەنها یەک ئیرادەی هەیە کە شاملە بۆ هەموو مەخلوقات، ئەو ئیرادەیەی چۆن خێر و چاکەی دەگرێتەوە و خۆشیدەوێ هەمان ئیرادەیە کوفر و فیسقی خۆشدەوێ و ڕازییە لێی!

جمهوری موسڵمانان هەموو موتەفیقن و دەزانن ئەم ووتەیە فاسدە لە دینی هەموو میللەتەکاندا، وە موسڵمانان و جوولەکە و نەصارا موتەفیقن لەسەر ئەوە کە الله ﷻ شیرک و بە درۆخستنەوەی پێغەمبەرانی خۆشناوێ و ڕازی نییە پێی، بەڵکو ڕقی لێیەتی و خاوەنی ئەو کردەوانە سزا دەدات، لێرەدا مەبەست ئەوەیە: ئەوانەی پشت لە طەریقی ڕەسول الله ﷺ دەکەن لە عیلم و عەمەلدا کەوتوونەتە گومڕایی و تاوانەوە.

ولکن غلط کثیر من أُولَئِک فظنوا أَنَّ الأُلِهِية هي القدرة على الخلق، وأَنَّ الإِله بمعنى الآلِه، وأَنَّ العباد يألهم الله، لا هم يألهون الله، كما ذكر ذالک طائفة منهم الأشعري وغيره...

وحقيقة هذا القول: أَنَّ الله يُحِبُ الكُفر والفسوق ويرضاه، وهذا هو المشهور من قول الأَشعري وأَصحابه، وقد ذكر أَبو المعالي أَنَّه أَوَّل من قال ذالک، وكذالک ذكر إِبن عقيل أَنَّ أَوَّل من قال: إِنَ الله يحبُ الكُفر والفسوق والعصيان هو الأَشعري وأَصحابه، وهم قد يقولون: لا يُحبه دينًا

ولا يرضاه، كما يقولون: لا يريده دينًا، أَي: لا يريد أَن يكون فاعله مأجورًا، وأَما هو نفسه فهو محبوب له كسائر المخلوقات، فإن عندهم محبوبة له، إِذ كان ليس عندهم إِلا إِرادة واحدة شاملة لكُل مخلوق، فكُل مخلوق عندهم محبوب مرضي.

وجماهير المسلمين يعرفون أَنَّ هذا القول معلوم الفساد بالضرورة من دين أَهل الملل، وأَنَّ المسلمين واليهود والنصارى متفقون على أَنَّ الله لا يُحب الشرك، ولا تكذيب الرسل، ولا يرضى ذالک، بل هو يبغض ذالک ويمقته ويكرهه، والمقصود هنا: أَنَّ الذين أَعرضوا عن طريق الرسول في العلم والعمل وقعوا في الضلال والزلل.

كتاب النبوات لابن تيمية | صـ : ٥٥

ئەوانە بەشێک بوون لە قەولی إبن تیمیە دەربارەی ئەشعەری و ئەشاعیرە، ڕوون و وازحن وەصفی دەکات بەوەی تەجەهومی تێدایە، هەڵگر و سەرخەری عەقیدەی جهم کوڕی صفوانە لە قەدەردا، هەروەها لە ئیمانیشدا کە فقط نییەتی بێ عەمەلە! وە هەڵگر و درێژە پێدەری تەئویلاتەکەی بشر المریسی جەهمییە، وە درێژە پێدەری عەقیدەی موعتەزیلەکانە، کەسێک جەهمی و موعتەزیلە بێ هێشتا ئیمامە؟! ئەو

تافهانەی کە قەولی سەلەف و ئەهلی سوننە قبوڵ ناکەن لەسەر ئەشعەری و ئەشاعیرە دەڵێن إبن تیمیە تەکفیری ناکات! ئێ ئەوەی بینیتان مشتێکن لە ئەقوالی إبن تیمیە کە دەڵێ ئەشعەری سەرخەری عەقیدەی جهم کوڕی صفوانە کوفر هەیە لە کوفری جهم گەورەتر؟!

وەک پێشتریش ووتمان ئیعتبار بە قەولی إبن تیمیە ناکرێ، چونکە ئەو تەکفیری موعەیەنی جەهمییەکان ناکات! ئیتر چاوەڕێی چی لێدەکەن، ئینسانی عاقڵ نابێ بیرکردنەوەی هێندە چەوت و باتڵ بێ لە بابەتێکی گرنگی ئیمان و جەهمییەت واز لە مەنهەج و عەقیدەی سەلەف و قڕونی سەرەتا بهێنێ بۆ ئەقوالی باتڵی إبن تیمیەیەک کە ساڵی **(٧٢٨)** هیجری وەفاتی کردووە !



## ئەشاعیرە مێینەی جەهمییەکان

لە بەشەکانی پێشوودا ڕوونمان کردەوە ئەشاعیرە لە صیفاتدا هەمان عەقیدەی جەهمییەکانیان هەیە، تەنها جیاوازییان ئەوەیە جەهمییەکان زۆربەی کات بە ئاشکرا بێ شەرمانە صیفات ڕەتدەکەنەوە، ئەمما ئەشاعیرە شەرمنانە بە بتی تەئویل صیفات تەعطیل دەکەن و ڕەتیدەکەنەوە، خۆیان لە بەرگی ئەهلی سوننە نیشان دەدەن بە دڵی جەهمییەکانەوە، حاڵەتی هەردووکیان یەک شتە نەفی کردنی صیفاتەکانی الله ﷻ، هەربۆیە دەبینی عولەمایانی ئەهلی سوننە بە ئەشعەرییەکانیان وتووە مێینەی جەهمییەکان.

أبو إسماعيل الأنصاري الهروی کاتێک باسی ئەشاعیرە دەکات دەڵێ: هاتن و چوون ووتیان: ئەم کەلامە حکایەتێکە بە قورئان دەربڕراوە، الله یەک جار قسەی کردووە دوای ئەوە قسەی نەکردووەتەوە، پاشان ووتیان: قورئان مەخلوق نییە، هەرکەس بڵێ مەخلوقە ئەوە کافرە! ئەمە لەو فێڵ و تەڵەنەیانە دڵی عەوامی ئەهلی سوننەی پێ ڕاو دەکەن، چونکە ئەوان عەقیدەیان ئەوەیە: «قورئان مەوجوود نییە و بوونی نییە کە کەلامی

الله بێ! » جەهمییە نێرەکان یەک جار ئەمەیان دەوت، بەڵام مێینەی جەهمییەکان کە ئەشاعیرەن دە جار ئەمەیان ووت.

فراوغوا فقالوا: هذه حكاية عُبِرَ بها عن القرآن، والله يتكلم مرة ولا يتكلم بعد ذالک، ثم قالوا: غير مخلوق، ومن قال مخلوق كافر!

وهذا من فخوخهم يصطادون به قلوب عوام أَهل السنة، وإِنما اعتقادهم: « القرآن غير موجود! » لفظته الجهمية الذكور بِمَرَّة، والأَشعرية الإِناث بعشر مرات.

ذم الكلام وأَهله للهروي | **(٥/٣٥٤)**

**إبن تيميه** دەڵێ: موعتەزیلە لە صیفاتدا جەهمین، ئەمما کولابییە لە صیفاتدا ... بە هەمان شێوەش ئەشاعیرە، بەڵام بەو جۆرەن کە أبو إسماعیل الأنصاری دەڵێ: ئەشعەرییە مێیەکان ڕەگەزی مێی موعتەزیلەن.

قال إِبن تيمية: فالمعتزلة في الصفات الجهمية، وأَما الكُلابية في الصفات... وكذالک الأَشعرية، ولكنهم كما قال أَبو إِسماعيل الأَنصاري: الأَشعرية الإِناث هم مخانيث المعتزلة.

مجموع الفتاوى لابن تيمية | **(٨/٢٢٧)**

ووتم: مەبەست لەووشەی مخانیث واتە ئەو کەسەی هەردوو ڕەگەز و ئالەتەکەی تێدا مەوجوودە، وە لەسەر شێوەی پیاوە، بەڵام حاڵ و مەیلی ئافرەتی تێدایە. « الخنث، أُخنث، خناث، الخنثى، المخنث، المخناث: خنثا الرجل كان فيه لين وتكسر وتشنٍ فكان على صورة الرجال وأحوال النساء. من له عضو الرجال والأُنثى معًا ».

المنجد في اللغة | صـ: ١٩٧ المعجم الوسيط | صـ: ٢٥٨

لێرەدا ئاماژە بەوە کراوە ئەشاعیرە مێینەی موعتەزیلەن نەک جەهمییە، بەڵام هیچ کێشەی نییە، چونکە موعتەزیلە لە صیفاتدا هەمان عەقیدەی جەهمییەکانیان هەیە و درێژە پێدەری هەمان مەدرەسەن.

**إبن تيميه** دەڵێ: یحیی کوڕی عمار وتوویەتی: موعتەزیلە نێرینەی جەهمییەکانن، ئەشاعیرەش مێینەی جەهمییەکانن..

قال إِبن تيمية: وكان يحيى بن عمار يقول: المعتزلة الجهمية الذكور، والأَشعرية الجهمية الإِناث..

مجموع الفتاوى لابن تيمية | **(٣٥٩/٦)**

دووباره له درێژەی باسکردنی ئەشاعیره بەراوردیان دەکات به موعتەزیله دەڵێ: ئێوه شەریکی موعتەزیلەن له هەموو ئوصوڵەکانیان، لەوانەوه عەقیدەتان وەرگرتووه، ئێوه فەرخ و بێچووی ئەوانن، هەروەک چۆن وتراوه: ئەشاعیره "مەخانیث" مێینەی موعتەزیلەن، وه موعتەزیلەش مێینەی فەلاسیفەن، بەڵام کاتێک له ناو ئوممەتی ئیسلام فەسادی مەزهەبی موعتەزیله بڵاوبوویەوه، خەڵکی به دڵەوه پشتی تێکردن و ڕایکرد له دەستیان ئێوەی ئەشاعیره واتان نیشاندا له هەنێک بابەتدا ڕەدیان دەدەنەوه، له کاتێکدا نزیکن لێیانەوه و له حەقیقەتدا موافیقی ئەوانن!

موعتەزیله بەخۆیان دەڵێن: ئەهلی تەوحید، به بۆچوونی خۆیان پێیان وایه تەوحید نەفی کردنی صیفاتە، ئێوەش ئەی ئەشاعیره موافیقن لەگەڵیان کاتێک به خۆتان دەڵێن ئەهلی تەوحید که نەفی هەندێک صیفات دەکەن و ناوی دەنێن تەوحید!

ئەو بیدعەیەی له کەلامی باتڵ دایان هێنا له حوکم یاخود له ئەدیلەکاندا ناویان لێنا: ئەصڵی دین، ئێوەش بەشداریتان کرد لەگەڵیان له هەمان شتدا، وەک ئەزانن و زانیوتانه سەلەف و ئیمامەکان چۆن زەمی

ئەم جۆرە کەلامەیان کردووە، بەڵکو ئەو کەسەی دینی ئیسلام دەناسێ ئەو دینەی کە الله ﷻ پێغەمبەرەکەی ﷺ پێناردووە، دەزانێ کە ئەوەی داوای دەکەن چەندە موخالیفەی کیتابی الله و پێغەمبەرەکانییەتی.

وأَنتم شركاؤُهم في هذه الأُصول كلها، ومنهم أَخذتموها، وأَنتم فروخهم فيها، كما يقال: الأَشعرية مخانيث المعتزلة، والمعتزلة مخانيث الفلاسفة، لكن لما أَشاع بين الأُمة فساد مذهب المعتزلة، ونفرت قلوب عنهم صِرتم أَيها الأَشعرية تُظهرون الرد عليهم في بعض المواضع، مع مقاربتكم أَو موافقتكم لهم في الحقيقة!

والمعتزلة سموا أَنفسهم: أَهل التوحيد، لاعتقادهم أَنَّ التوحيد هو نفي الصفات، وأَنتم أَيها الأَشعرية وافقتموهم على تسمية أَنفسكم أَهل التوحيد وجعلتم: نفي بعض الصفات مِنَ التوحيد!

وسموا ما ابتدعوه من الكَلام الفاسد إِما في الحُكم وإِما في الدليل: أُصول الدين، وأَنتم شاركتموهم في ذالك، وقد علمتم ذم السلف والأَئمة لهذا الكلام، بل عَلِمَ من يعرف دين الإِسلام وما بعث الله به نبيه عليه أَفضل الصلاة والسلام، ما فيه من المخالفة لكتب الله وأَنبيائه ورسله.

الفتاوى الكبرى لابن تيمية | صـ: ١٦٩٨

# عیبادەتی ئەشعەری

ئەشعەری هەروەک چۆن لە عەقیدەدا دەست بەتاڵ بووە بە هەمان شێوەش لە عیبادەتدا خاڵی بووە، بگرە کەسێک بووە زۆر سووکانە تەماشای عیبادەتی کردووە، هەتا ئەو ئاستەی بەلایەوە گرنگ نەبووە بێ دەست نوێژ نوێژی کردووە! کەسێک صیفاتی الله ﷻ ڕەتبکاتەوە بێگومان چاوەڕێی ئەوەی لێدەکرێ سووک تەماشای عیبادەت بکات و گاڵتە ئامێزانە وەریان بگرێ.

أبو إسماعيل الأنصاری الهروی دەڵێ: لە بشر کوڕی عبدالله الأیبوردی الخطیب ــم بیست، دەیگێڕایەوە لە قاضی جورجان وتوویەتی: ئەشعەری لە بەصرە هەندێک شتی دەکرد و ئەنجام دەدا، بەلامەوە قورسە باسیان بکەم.

وسَمِعتُ بِشرَ بن عبدالله الأَيبوَردي الخطيب، يَحكي عن قاضي جُرجان، عن الأَشعري بالبصرة أَشياء، يَتَعَاظَمُني ذِكرُها.

ذم الكلام وأَهله للهروي | ١٢٦٧

أبو إسماعيل الأنصارى الهروى دەڵێ: له يحى كوڕى عمار ـم بيست دەيوت: له زاهر كوڕى أحمد ـم بيست كه ئيمامى موسڵمانان بوو دەيوت: له درزێكى دەرگاوە بينيم أبو الحسن الأشعرى ميزى كرد و تارەتى نەگرت، دواتر كاتى نوێژ هات بۆ ئەوەى دەست نوێژ بگرێ هەستا نوێژى كرد، پێم ووت: دەست نوێژت نييه، ووتى: دەست نوێژم هەيه و نەشكاوە.

قال الهروي: سمعت يحيى بن عمار، يقول: سمعت زاهر بن أَحمد وكان للمسلمين إِمامًا يقول: نظرت في صِيرِ الباب، فرأَيتُ أَبا الحسن الأَشعري يبول في البالوعة! فدخلتُ عليه، فحانت الصلاة، فقام يُصلي وما كان استنجى، ولا تمسح، ولاتوضأَ، فذكرت الوضوء، فقال: لستُ بمُحدثٍ.

ذم الكلام وأَهله للهروي ا ١٢٦٤

أَبو علي زاهر بن أَحمد بن محمد بن عيسى السَّرخَسي، ساڵى **(٣٨٩)** هيجرى وەفاتى كردووە.

أبو إسماعيل الهروي الأنصارى دەڵێ: له منصور كوڕى إسماعيل ـم بيست دەيوت: له زاهر ـم بيست دەيوت: ئەشعەرى خەوت بوو منيش له

ژێر پێیدا بازنەیەکم کێشا، دوای **(٦)** ڕۆژ بینیم هێشتا ڕەشایی نوسینەکەی پێوە مابوو نەی شۆری بوو.

قال الهروي: سمعت منصور بن إِسماعيل الفقيه، يقول: سمعت زاهرًا يقول: دَوَّرتُ في أَخمص الأَشعري بالنقشِ دائرةً وهو قائِل، فرأَيتُ السَّواد بعد سِتًّ لم يَغسِلَهُ!

ذم الكلام وأهله للهروي ا ١٢٦٥

ووتم: ئینسان ئەگەر مولتەزیم و خاوەن عیبادەت بێ، نوێژ بکات و نوێژ بیلبیلەی چاوەکانی بێ چۆن دوای شەش ڕۆژ هێشتا مورەکەبی نوسین و بازنەکە لە ژێر پێی دەمێنێ، کاتێک لە ڕۆژ و شەوێکدا پێنج جار دەست نوێژ بگرێ یاخود چوار جار بۆ نوێژە فەڕزەکان ئیتر چۆن ناسڕێتەوە؟!

دواتر هەردوو سەنەدەکە صحیحن مەجالی ئەوەیان تێدا نییە طەعنیان لێبدرێ و تەضعیف بکرێن ڕیجالەکانی ثقەن، أَبو علی زاهر کوڕی أَحمد ئەو کەسەیە ئەشعەری لە ماڵەکەیدا وەفاتی کردووە پێشتر لەسەر مەزهەبی ئەشعەری بووە پاشان تەوبەی کردووە، ئەمەم ووت هەتا خەڵکانێک نەڵێن درۆی بە دەمیەوە هەڵبەستووە !

**أبا الفضل کوڕی البقال** دەڵێ: بیستم أبا علی کوڕی جامع دەیوت: **(٢٠)** ساڵ ڕەفیقایەتی ئەشعەری ـم کرد قەت نەمبینی نوێژ بکات.

وە جارێکیان ڕۆژی جەژن بوو لە بەصرە پێکەوە چووین بۆ موصەلا بۆ نوێژی جەژن، کاتێک گەیشتینە چۆڵەوانییەک چوویە ناو کەلاوەیەک و میزی کرد و دەست نوێژی نەگرتەوە، پێم ووت: ئاوت بۆ نەهێنم دەست نوێژ بگریتەوە، ئەو ڕێگایە هەمووی ئاو بوو هەموو قەومێک ئاویان لابوو. ووتی: نەخێر پێویست ناکات، میزی جەژن قەیناکا. کاتێک گەیشتینە موصەلا نوێژی کرد بە بێ دەست نوێژ.

**أبو علی جامع** دەڵێ: کاتێک لە نوێژ گەڕامەوە وازم لێی هێنا جارێکی تر نەگەڕامەوە بۆ لای، هەرچیشم لێوەی نوسیبوو دڕاندم، بۆ عیلم پەیوەندیم کرد بە خەڵکی ترەوە.

قال أَبو علي الأَهوازي: سمعت أَخي أَبا الحسن أَحمد بن علي يقول: سمعت القاضي ابن صخر يقول: سمعت عمي أَبا محمد بن صخر يقول: سمعت أَبا الفضل بن البقال يقول: سمعت أَبا علي بن جامع وأُكرِمْ به يقول: صحبتُ الأَشعري عشرين سنة ما رأَيته مُصَلِّيًا قطُّ.

ولقد صَحِبتُه في يوم عيدٍ إِلى المُصَلَّى بالبصرة، فلمَّا بلغنا إِلى الخراب دَخَل وَبَالَ وخرج ولم يَمَسَّ ماءً، فقلت: أَما تأْخُذُ لک ما تتوضَّأُ به، والطريق كُله ماء فما يخلو مِن قومٍ معهم ماء أَو بارد. فقال لِي: لا، بُوَيْلَة العيد لا بُدَّ منها. فلمَّا وصلنا إِلى المُصَلَّى صَلَّى على غير وضوء.

قال أَبو علي بن جامع: فَلَمَّا رجعتُ تركتُه، وخرَّقتُ جميعَ ما كتبتُه عنه، ولم أَرجع إِليه، وَلَزِمتُ غيرَه.

مثالب ابن أَبي البشر للأَهوازي ١ صـ: ١٢

ووتم: لەوانەیە هەبێ بڵێ: باشە چۆن ڕەفیقایەتی کەسێکی کردووە لە کاتێکدا **(٢٠)** ساڵ نوێژی نەکردووە؟! ئەمە ظاهرەن درۆیە.

لە وەڵامدا دەڵێم: شتی لەم جۆرە دەگونجێ، چونکە ئینسان گەر هاتوو لەسەر عەقیدەی ئەو شەخصەبێ ئەوە ئەو شەخصە هەرچی ئەنجام بدات و تەرک بکات بەلای ئەمەوە جێی قبوڵە، هەروەک چۆن زاهر کوڕی علی شوێنکەوتەی عەقیدە و مەزهەبی ئەشعەری بووە دواتر تەوبەی کردووە و گەڕاوەتەوە.

له لایەکی تریشەوە ئەشعەری جەهمی بووە لە ئیماندا پێی وابووە هەرشتێک بەهۆیەوە نزیکت بکاتەوە لە الله ﷻ ئەوە ئیلاهە! وە عەمەل ڕوکن نییە لە ئیمان بەم پێیەبێ مرۆڤ عەمەلیشی نەبێ هەر ئیمانداره، بۆیە دەبینی ئەنجامدانی عەمەل بەلایانەوە هیچ گرنگ نییە و ئاساییە بەلایانەوە نەک **(٢٠)** ساڵ بگرە هەر کولییەنیش نەیکات.

**إبن سهل الصعلوكی** دەڵێ: بیستم باوکم دەیوت: من جار جار دەچوومە لای ئەشعەری شتم لێوەی دەنوسی و وەردەگرت، هەتا ڕۆژێک جمعە بوو هاتم بۆ لای دوای ئەوەی نوێژی عەسرم کرد بوو، لە درزی دەرگاکەوە بینیم میز دەکات، کاتێک لە میزەکەی تەواو بوو چوومە ژوورەوە بۆ لای، پێی ووتم: نوێژی عەسرتان کردووە؟ ووتم: بەڵێ. پاشان هەستایەوە نوێژی کرد بەبێ ئەوەی دەست نوێژ بگرێ، ئیتر هاتمە دەرەوە، هەرچیم لێوەی نوسیبوو هەموویم دڕاند و جارێکی تر نەگەڕامەوە بۆ لای.

وسمعت أَبا سهل بن الصابوني النيسابوري بدمشق سنة ثلاث وتسعين وثلاثمائة، يقول: وأَبا أُسامةَ محمد بن أَحمد الهروي الْمُقرئ بمكة سنة خمس وتسعين وثلاثمائة يقولان: سمعنا الإِمام الفقيه ابن سهل الصُّعلوكي بنيسابور، يقول: سمعت أَبي، يقول: كُنت ربما أَختلف إِلى

الأَشعري فأَكتب عنه شيئًا، قال: فجئته في يوم الجمعة وقد صلَّينا العصر، فرأَيته مِن شَقِّ الباب وهو يبول، فلما فرغ من بوله دَخلتُ عليه، فقال لي: صلَّيتم العصر؟ قلتُ: نعم. ثُمَّ قامَ فصلَّى ولم يتوضَّأ، فخرجتُ مِن عنده، وخَرَّقتُ جميع ما كتبتُه عنه، ولم أَرجع إِليه.

مثالب ابن أَبي البشر للأَهوازي | صـ : ١٣

**أبو إسماعيل الأنصارى الهروى** دەڵێ: ئەشاعیرە بە سابت کردنی صیفات دەڵێن تەشبیھ و شوبھاندن، ڕەخنە لە قورئان دەگرن و عەیبداری دەکەن، وە ڕەسول اللە ﷺ بە گومڕا دەزانن "ئەمە ئیلزام کردنیانە، چونکە ئەوان صیفات ڕەتدەکەنەوە، لە کاتێکدا لە قورئان و حدیث صیفات جێگیر کراوە" لە ناویاندا پیاوێکی وەریع موتەقی نابینی، وە کەسێکیان نابینی شەریعەت بە گەورە تەماشا بکات و ڕێز لە قورئان بگرێ و حدیث بەرز ڕابگرێ.

وسَمُّوا الإثبات تشبيهًا، فعابوا القرآن، وضللوا الرسول ﷺ، فلا تَكادُ ترى منهم رَجُلًا ورِعًا، ولا للشريعة مُعَظِمًا، ولا للقرآن مُحترمًا، ولا للحديث مُوقِرًا.

ذم الكلام وأهله للهروي | صـ : ٣٦١

# سەرچاوەكان

١- القرآن الكريم.

٢- جامع بيان عن تأويل آى القرآن لأَبي جعفر محمد بن جرير الطبري.

٣- جامع المسند الصحيح لأَبي عبدالله محمد بن إِسماعيل البخاري.

٤- المسند الصحيح لأَبي الحسين مسلم بن الحجاج النيسابوري.

٥- سنن أَبي داود لأَبي داود سليمان بن الأَشعث السجستاني.

٦- الجامع المختصر من السنن لأَبي عيسى محمد بن عيسى الترمذي.

٧- المجتبى لأَبي عبدالرحمن أَحمد بن شعيب النسائي.

٨- سنن الدارمي لأَبي محمد عبدالله بن عبدالرحمن الدارمي.

٩- سنن سعيد بن منصور لأَبي عثمان سعيد بن منصور بن شعبة النيسابوري.

١٠- مسند أَحمد لأبي عبدالله أَحمد بن محمد بن حنبل الشيباني.

١١- مسند لأَبي دواد سليمان بن داود بن الجارود الطيالسي.

١٢- الموطأ لأَبي عبدالله مالك بن أَنس بن مالك بن أَبي عامر المدني.

١٣- الأُم لأَبي عبدالله محمد بن إِدريس بن العباس الشافعي القرشي.

١٤- المصنف لأَبي بكر عبدالله بن محمد ابن أَبي شيبة القيسي.

١٥- الرد على الزنادقة والجهمية فيما شَكَّت فيه من متشابه القرآن وتأَولته على غير تأْويله لأَبي عبدالله أَحمد بن محمد بن حنبل الشيباني.

١٦- نقض الدارمي على المريسي لأَبي سعيد عثمان بن سعيد الدارمي.

١٧- الرد على الجهمية لأَبي سعيد عثمان بن سعيد الدارمي.

١٨- خلق أَفعال العباد لأَبي عبدالله محمد بن إِسماعيل البخاري.

١٩- كتاب السنة لأَبي محمد حرب بن إِسماعيل بن خلف الكرماني.

٢٠- كتاب السنة لأَبي عبدالرحمن عبدالله بن أَحمد بن محمد بن حنبل.

٢١- كتاب السنة لأَبي بكر أَحمد بن محمد بن هارون الخلال.

٢٢- كتاب السنة لأَبي بكر أَحمد بن عمرو ابن أَبي عاصم.

٢٣- كتاب الزهد والرقائق لأَبي عبدالرحمن عبدالله بن مبارك الحنظلي المروزي.

٢٤- فضائل القرآن لأَبي عبيد القاسم بن سلام بن عبدالله الهروي.

٢٥- سيرة الإِمام أَحمد بن حنبل لأَبي الفضل صالح بن أَحمد بن محمد بن حنبل.

٢٦- تعظيم قدر الصلاة لأَبي عبدالله محمد بن نصر المروزي.

٢٧- كتاب التوحيد وإِثبات صفات الرب لأَبي بكر محمد بن إِسحاق بن خزيمة النيسابوري.

٢٨- كتاب الشريعة لأَبي بكر محمد بن الحسين الآجري.

٢٩- الإبانة عن شريعة الفرقة الناجية ومجانبة الفرق المذمومة لأَبي عبدالله عبيدالله بن محمد بن حمدان بن بطة العكبري.

٣٠- كتاب الصفات لأَبي الحسن علي بن عمر الدارقطني البغدادي.

٣١- كتاب النزول لأَبي الحسن علي بن عمر الدارقطني البغدادي.

٣٢- العلل لأَبي الحسن علي بن عمر الدارقطني البغدادي.

٣٣- كتاب التوحيد لأَبي عبدالله محمد بن إِسحاق بن مندة الأَصفهاني.

٣٤- كتاب المصاحف لأَبي بكر عبدالله بن سليمان الأَشعث السجستاني.

٣٥- مثالب ابن أَبي البشر لأَبي علي الحسن بن علي بن إِبراهيم الأَهوازي.

٣٦- عقيدة السلف وأَصحاب الحديث لأَبي عثمان إِسماعيل بن عبدالرحمن الصابوني.

٣٧- الرد على من أَنكر الحرف والصوت لأَبي نصر عبيدالله بن سعيد بن حاتم السجستاني.

٣٨- شرح أُصول اعتقاد أَهل السنة والجماعة لأَبي القاسم هبة الله بن الحسن بن منصور الطبري اللالكائي.

٣٩- ذم الكلام وأَهله لأَبي إِسماعيل عبدالله بن محمد الهروي.

٤٠- تاريخ بغداد لأَبي بكر أَحمد بن علي الخطيب البغدادي.

٤١- الرسالة الواضحة في الرد على الأَشاعرة لأَبي القاسم عبدالوهاب بن عبدالواحد بن محمد الشيرازي إِبن الحنبلي.

٤٢- جزء في الأُصول الدين مسأَلة القرآن لأَبي الوفاء علي بن عقيل البغدادي الحنبلي.

٤٣- الإِقتصاد في الإِعتقاد لأَبي محمد عبدالغني بن عبدالواحد المقدسي.

٤٤- المناظرة في القرآن لأَبي محمد عبدالله بن أَحمد بن قدامة المقدسي.

٤٥- رسالة القرآن وكلام الله لأَبي محمد عبدالله بن أَحمد بن قدامة المقدسي.

٤٦- إِثبات الحد لله بأَنه قاعد وجالس على عرشه لأَبي محمد محمود بن أَبي القاسم إِسفنديار الدشتي.

٤٧- مجموع الفتاوى لأَبي العباس أَحمد بن عبدالحليم إِبن تيمية.

٤٨- بيان تلبيس الجهمية في تأسيس بدعهم الكلامية لأَبي العباس أَحمد بن عبدالحليم إِبن تيمية.

٤٩- درء تعارض العقل والنقل لأَبي العباس أَحمد بن عبدالحليم إِبن تيمية.

٥٠- الفتوى الحموية الكبرى لأَبي العباس أَحمد بن عبدالحليم إِبن تيمية.

٥١- الإِستقامة لأَبي العباس أَحمد بن عبدالحليم إِبن تيمية.

٥٢- كتاب النبوات لأَبي العباس أَحمد بن عبدالحليم إِبن تيمية.

٥٣- جمع الجيوش والدساكر على إِبن عساكر ليوسف بن حسن بن عبدالهادي المقدسي الحنبلي.

٥٤- الأَسماء والصفات لأَبي بكر أَحمد بن الحسين البيهقي.

٥٥- الملل والنحل لأَبي الفتح محمد بن عبدالكريم الشهرستاني.

٥٦- تبين الكذب المفتري لأَبي القاسم علي بن الحسن ابن عساكر.

٥٧- مقالات الإِسلاميين واختلاف المصلين لأَبي الحسن علي بن إِسماعيل الأَشعري.

٥٨- الإِبانة عن أُصول الديانة لأَبي الحسن علي بن إِسماعيل الأَشعري.

٥٩- رسالة إِلى أَهل الثغر لأَبي الحسن علي بن إِسماعيل الأَشعري.